✓ دوکتۆری خەرفاو
✓ نووسینی : ژارگون تۆرڤالد
✓ وەرگێڕانی : خ . ئەویندار
✓ دیزاینی ناوەوە:و بەرگ : خەلیل هیدایەت مام شێخ ٤٩٢٤٢٦٣
✓ نرخ ( ٥٠٠٠ ) هەزار دینار
✓ چاپی یەکەم : ٢٠١١
✓ لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردن ( ٦٤٤ ) ساڵی ٢٠١١.
✓ شوێنی چاپ : چاپخانەی ڕۆژهەلات-هەولێر

بەڕێوەبەری هونەری دەزگا
**سەلام محەمەد رەسول**

ئـەم کتێبـەی وا بـە دەسـتیەوە دەگـری لـەبـۆ خوێندنـەوە، نووسـراوی پیاوێکی ئاڵمانی یە بە ناوی ژارگۆن تۆرڤاڵد. کە سالی ١٩١٦ ی زاینـی لە ئەیالەتی (راین) کە ئەمرۆ یەکێ لە ئـەیالـەت (هـەرێـم)ەکـانی ئاڵمـانی خۆرئاوایە لە دایک بووە .

لە پاش خویندنەکانی سەرەتایی کەوتە دوای زنجیرە خوینـدنی پزیـشکی و لە ئاڵمان و فرانسە و ئینگلیز دا درێژەی بـە خوێنـدنی خـۆ دا کـەچـی ئیش و کاری پزیشکی هەڵنەبژارد .

ژارگـۆن تۆرڤاڵـد لـە سـاڵی ١٩٣٩ کـە ئاڵمـان هێرشـی کـردە سـەر لەهستان (پۆلۆنیا) وشەری دووهەم قەوما چووە نێو

هێزی دەریایی ئاڵمان و ئەوەی بە چاوی خۆی دەیدی، لـە شـەرەکـانی ژێر دەریا دا، بۆ رۆژنامەکانی ئاڵمانی دەنووسی.

پاش ئەوەی کە شەری دووهەمی جیهانی کۆتایی هات و ژارگۆن تۆرڤاڵد لەخزمەتی سەربازی نـەجاتی بـوو دەسـتی کردبـەنووسـەری و لـەپێشدا بیرەوەریەکانی خۆی لەشەری دووهـەمـی جیهـانی لـەچـەند بـەرگدا بـلاو کردەوە، هەنگی خۆی سازکرد سەربردەی "زائر برۆخ" ی نۆژداری مەزنـی ئاڵمانی ، کە خوێنەران لەم کتێبە دا دەیناسن ، بنووسێ.

ئەو کاتەی کە ژارگۆن تۆرڤاڵد تەمای گرت کە چیرۆکی ژیانی زائـر بـرۆخ لە کتێبێک دا بلاو بکاتەوە ئەو نوژدارە بە ناوبانگە مالاوایی لە ژیان کرد بـوو، نووسـەر دەسـتی بـەو مـەزنـە رانـەدەگـەیشت و لـەبـۆ نووسـینی سەربهوردیەکە چووە لای شاگردان و یاریدەرەکانی و ئەو نەخۆشـخانانەی کەزائر برۆخ کاری تێدا کردبوون ،بە تایبەت نـەخـۆش خانـەی "شـاریتی" لە برلینی رۆژهەلات.

ژاگۆن تۆرڤالـد بـەتـەمـا نـەبـوو لـەم نووسـینەی دا کتێبێکـی پزیـشکی بنووسێ بەلام چونکە کتێبـەکـەی سـەبـارەت بـە سـەربـردەی نـوژدارێکی مەزنە بەشێوەیـەکـی ئاسـایی زانیاریـەکـانی پزیشکی و زینـدەوەر ناسـی هاتوونـە نێـو رایـەڵ وپـۆی کتێبـەکـە وخوێنـەر لـەو زانیاریانـەکـەڵـک وەردەگرێ.

قارەمانی سەرەکی ئەم کتێبە یانی" زائر برۆخ" لەکۆتایی تەمەنی دا تووشی نەخۆشی خەرفان (جنون ادواری) بوو ئەم نەخۆشیە لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەن دا تووشی هەندێ لەپیاو وژنان دەبێ، دیاردەی هەرە ساکاریشی لە بیر چوونەوەی دەورانی پیری بە کە بەشێک لە بە ساڵدا چووەکان پێیەوە گرفتار دەبن . تەنانەت ئەو دەردە ساکارە لە بۆ دیتەرانیش بێ خەتەر و زەرەر نیە چونکە ژن یا پیاوێکی بە ساڵا چوو رەنگە ئەو بەڵێنەی بە کەسانی دی داوە فەرامۆش بکا و کابرای تووشی سەرگەردانی یان خەتەربکا .

جەرپێندراوە ئەو کەسانەی تا کۆتایی تەمەن یادەوەری خۆ دەکار دەکەن تووشی فەرامۆشی دەورانی پیری نابن.مامۆستایانی زانکۆ لەو کەسانەن و چونکە لە چاخی زورهانیش دا وەک تافی لاوەتی هەروا لە یادەوەری خۆ کەڵک وەردەگرن گرفتاری خەرفانی دەورانی پیری نابن.

زائر برۆخ چونکینێ پیاوێکی زانا بوو ، وەک زانا و بلیمەتەکانی تر لەدەورانی پیری داموتالای کتێبی دەکردو لێنەدەگەرا یادەوەریەکەی دابخرێ ،نەدەبوو تووشی فەرامۆشی،کەگۆرا سەرخەرفاوی ببێ، هەر بۆیە وەزعی روحی زائر برۆخ دیاردەیەکی دەگمەن بووەو پیاوێکی وا نەدەبوو لە کۆتایی تەمەنی دا تووشی خەرفان بێ و لەبەر شێتی وی ئەو کارەساتانە رو بدەن کە لەم کتێبەدا دەیان خوێنینەوە .

ژارگۆن تۆرڤاڵد ی نووسەری ئەم بەدووداچوونە ئێستا پیاوێکی شێست ونۆ ساڵەیەولەئەیالەتی" باوڤێر" ی هەڵکەوتوو لە ئاڵمانی رۆژئاوا دا دەژی و کور و کچێکی لاوی هەن کە هەردووک خێزانیان پێکەوە ناوە .

ذ بیح ا لله حکیم الهی دشتی

(منصوری)

## بەشێك لەشاكارەكانی نوژدارێك

لـەوڵاتــی ئاڵـمـانیا، هــەرلــەکۆنــەوە، کــەسـێکی کــەکاروبـاری دارایــی زانستگایەکی پڕیشکی ونوژداری دەگرتەئەستۆبەناوی "راوێژکار" نـاو دێردەکرا. لەپاش شەری دووهەمی جیهانی کە ئاڵمان دابەش کرا بـە دوو وڵاتــی ئاڵـمـانی رۆژهــەڵات و ئاڵـمـانی رۆژئـاوا، کـاری راوێژکـاری زانکۆی پزیشکی و نوژداری لە نێو نەچوو.

لەگەڵ ئەوەی لە ئاڵمانی رۆژهەڵات دا زانکۆکـان وەک بـەرێ سـەربـە خۆییان نەبوو وگشت لەژێرچاوەدێری دەوڵـەتـی ئاڵـمـانی رۆژهــەڵاتـدا بوون، لەهەر زانکۆیەکی پزیـشکی و نـوژداری دا "راوێژکـار"ێـک کـارو باری دارایی زانکۆی بەرێوە دەبرد.

لەرۆژی ١٥ی مانگی مای ساڵی١٩٤٨ی زاییـنـی راوێژکـارێکی زانکـۆی پزیـشکی ونـوژداری بـەنـاوی"هـاڵ" لـەژووری سـەرپـەرسـتی لـەش ساخی،لەبرلینی رۆژهەڵات،وەژوورکەوت.

لەوان رۆژان هێشتا دەوڵەتـی ئاڵـمـانی رۆژهــەڵات بـەشـێوەی فـەرمـی دانەمەزرابوو،بەرلێن لەژێردەستی چواردەوڵـەتـی سـۆڤیەت،ئـەمریکـا، ئینگلیزوفەرانسە دابوو،پرۆگرامێکی ئیداری تایبەت بەخـۆی هــەبـوو ، کەچی بەرلینی رۆژهەڵات کە ئێستا پایتـەختـی ئاڵـمـانی رۆژهــەلاتــە، بەشێوەیەکی نارەسمی هەربەناوەندی ئاڵمانی رۆژهەڵات دەژمێرا

لەئاڵمان دا هەرلەکۆنەوە باوبوو ئەو پزیـشک ونوژدارانـەی کـە لـەبـۆ نەخۆشخانەگشتیەکـان هــەڵـدەبژێردران،بـەدیـاری کردنـی دام ودەزگـا لەش ساخیەکان بـەربژێـر دەکـران وراوێژکـارانی زانکۆکـانی پزیـشکی

ونوژداری لەهەڵبژاردنی دوکتۆرونوژداری نەخۆشخانەکانی گشتی (ئەو نەخۆشخانانەی بەپارەی دەوڵەت یان شارەوانیەکان بەڕێوە دەچوون)دا خاوەن رابوون، ئەوی رۆژێ دوکتۆر هاڵ،چووە ژووری سەرپەرستی لەش ساخی ئاڵمانی رۆژهەلات هەتا سەبارەت بە هەڵبژاردنی نوژدارێک بیرو رای لە گەڵ وەگۆڕێ.

پاش ئەوەی دوکتۆر هاڵ چووە ژووری بەرپرسی لەش ساخی و دانیشت،گوتی هاتووم سەبارەت بە کۆمەکێکی تازە، کە دەبێ لە نەخۆشخانەی شاریتی دا خەریکی کار بێ،قسە بکەم.(*)

بەرپرسی لەش ساخی وڵامی داوە منیش بیستوومە کە دوکتۆر "ویلفرێد" گەرەکە لەو نەخۆش خانەیەدا کار بکات.

دوکتۆر هاڵ گوتی داخوا ئاگاداری کە دوکتۆر ویلفرێد ئەندامی حیزبی نازی بوو.

سەرپەرستی تەندروستی وڵامی دایەوە لەم مەبەستە ئاگادارم بەڵام پرۆفیسۆر زائربرۆخ ئەوی بۆ یاریدەری خۆی هەڵبژاردووە.

دوکتۆر هاڵ لاو بوو، زائربرۆخی بە باشی نەدەناسی هەرلە بۆیە هەڵیدایە، ئاخۆ چونکە زائربرۆخ ئەوی دیاری کردووە لە بۆ یاریدەری خۆی دەبێ گشت رێوشوێنەکان بخەینە ژێر پێ ؟ ئاياپێت وانیەئەگەر ئێوە لەگەڵ ئەم دەسنیشان کردنە رازی بوونی خۆ دەرببرن لە سەروو سەبارەت بەم پرسە چ دەڵێن.

* شاریتی: لەزمانەکانی ناوەندوخۆرئاوای ئوروپادا بەمانای چاکەیە بەتایبەت دەسگیرۆیی لەهەژارولێقوماوان و وشەیەکە لە فەرانسەیی را چوتەنێوزمانەکانی ترودەڵێن"شاریتێ". ' و، ف '

بەرپرسی تەندروستی لەوڵام داگوتی ئۆڵبرێخت(**) لەبەرکەم بوونی نەشتەرگەر بۆخۆی دەگەڵ کارکردنی دوکتۆر ویلفرێد وەک یاریدەری زائربرۆخ رازی بوونی خۆی راگەیاندووە.

دوکتۆر هاڵ کەزانی پێشنیاری دوکتۆرزائربرۆخ لەبۆ ئەوەی دوکتۆر ویلفرێدوەک یاریدەرلەگەڵی کاربکا،لەلایەن بەرپرسانی سەروو رەزامەندی لەسەردەرچووە،ئیتردژایەتی نەکردوهەستاوەدەرکەوت.

❊ ❊ ❊

پرۆفیسۆر"فێردیناند ـ زائربرۆخ" لەو کاتی دا پیاوێکی ٧٢ ساڵانە بوو ولە برلێنی رۆژهەڵات دادەژیا وتا ماوەیەکی جێ ئێرەیی گشت نوژدارەکانی ئاڵمان دەهاتەحەساو. بەڵام ئەولەبەرانبەرخەڵکی دی دائەوەندە دیاروبەرچاو بوو کەنەشتەرگەرەکانی تر وردەوردە ئێرەیی خۆیان لەبیر چووەو لە جیاتیان رێزێکی زۆریان لێ دەگرت .

هەندێ کەسی وا هەن کە ئەوەندەیان گرشەورووناکی هەیە، تروسکەیان چاوی لەبەرهەڵنایە،بۆیەرەقیب خەریک دەبن قور ولیتەیان پێ داهەڵپرژێنن،هەتاوەک خۆیانیان لێ بەسەربێ وتروسکە و نوورەکەیان لێ دابرندرێ.

** واڵتێر ئۆڵبریخت :کە هەشتا ساڵی ماڵاوایی لەژیان کرد پێشتر لەساڵی١٩٧٣لە تەمەنی سەرۆکایەتی ئاڵمانی رۆژهەڵاتی لەسەرشان بووە. و،ف

بەڵام زائربرۆخ لەنێو نەشتەرگەرانی ئاڵمان وئۆروپادابەشێوەیەک بەرچاو ودیار بوو کە هیچ کەس بە خەیاڵی دا نەدەهات کەلیتە و چڵکاو بە رویدا برشێنێ،چوونکەلێی رون بووبەو کارەی پترخۆی بۆژۆ دەکا و بەڵگەی پەستی خۆ دەداتە دەستی خەڵکی .

لەگەڵوەش دالەنێو نوژدارانی ئاڵمان دا هەندێ کەسی وا هە بوون کەپاش ئەوەی "زائربرۆخ"هەنگاوی گوێستەوەبۆ قۆناخی بە سالاچوویی وپیری ،یانی قۆناخی دوای شێست ساڵەیی، لە قولایی دڵەوە هیوایان وابووکەرۆژێ لەرۆژان دەستەکانی زائربرۆخ لەرزۆک دەبن ولەوکاتی بەدواوە ناشێ کێردی نەشتەرگە ری بەدەستەوەبگرێ وله ژووری عەمەل داخۆنوێنی بکا.

بەڵام گەلێک ساڵ لەشێست ساڵەیی زائربرۆخ تێپەری ولەرزۆکیەک لەدەستەکانی ئەو نابیغە پیتۆڵە دا پەیدا نەبوو.

لەدوای ئەوەی کە نازیەکان لە ئاڵمان دا هاتنە سەرکار، هیتلەر ویستی زائربرۆخ بێنیتەنێو حیزبی نازی چوونکەناوبانگی وی بە رادەیەک زۆربووکەئەگەرهاتبانێو حیزبی نازی وەک قورساییەکی بەرچاودەهاتەئەژمار،بەڵام زائربرۆخ رازی نەبوو بچێتە نێو حیزبی نازی، کەچی ئەوهەندە لە نێوکۆمەڵ دا خاوەنی رێزبوو کەپاش ئەوەی نازیەکان بێ مەیلی ئەویان بۆ نێو حیزبەکەی خۆیان دیت بەپێچەوانەی ئەوەی دەگەڵ خەلکی دیکەدەیانکرد،نەهاتنەسەر ئەوەی ئازاری بدەن.

بەرچاوبوونی نەشتەرگەرێک،بەستراوەبەژمارەی ئەوعەمەلانە نیە کەجێ بەجێیان دەکا،بەڵکو بەوەی بەستەیەکەلەبەشی نوژداری دا چ

شێوەگەلێکی نوێی لێ دیتراوەوچشتێکی تازەی داهێناوە، زائربرۆخ ئەوندەی شتی دەنوێ لە نەشتەرگەری دا بەدی هێناوە کەیەکێ لەوان بەس بوو تا ناوبانگی بڵاوبکاتەوە وناوی بەنەمری بێڵێتەوە.

یەکەم کەسی کەلەسەدەی ئێمەدا کێردی نەشتەرگەری لە دڵی ئینسانێک دادەکارکرد زائربرۆخ بوو،بەسەرکەوتنەوە عەمەلیاتی نوژداری سەردڵی کۆتایی پێ هێناو بۆئەوەی خوێن لە لەشی نەخۆشدا بگەرێ، لەدڵی ئالی کەڵکی وەرگرت.

دڵی ئالی زائربرۆخ کەلەداهێنانەکانی خۆی بوو،وەک دڵە ئالی یەکانی ئێستا کامڵ نەبوو، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا بە باشی خوێنی دەگەیاندە لەشی نەخۆش و هەرنەخۆشەی عەمەلی نەشتەرگەری دڵی بۆبکرێ وچارەی بێ، بەرمنەتی زائر برۆخە، چونکەئەوبوو کەرێگای بۆ نەشتەرگەری دڵ دوزیەوە.

بەرلەزائربرۆخ ئۆلسێری مەدە (زامی مەعیدە)یان بەکێردی نوژ داری چارەسەر دەکرد، ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتە یەکەم جار بۆ دەرمانی ئۆلسێری مەعیدە کەڵکی لەشلەی سارد وەرگرت وبە هۆی لوولە (بوری)یەکی زیادی، هەندێ ئەلکۆل (سپرتۆ) ی کە ساردیەکەی بیست پلەلەژێر خاڵ بوو دە مەعیدەی نەخۆش کرد بەچەشنێ کە زامی مەعدە ئەلکۆلەکەی وێبکەوێ و بە لوولەی دووهەم دا هەڵیکێشا دەرەوە.لەپاش ئەوەی چەندجارولە چەند رۆژدا ئەم کارە دووپات دەکرایەوە و ئۆلسێری مەعیدەی نەخۆش لەپەنای ئەلکۆلی ساردرادەگیرا ئولسێر لەنێودەچوو، نەخۆش لە چەنگ

عەمەلی نەشتەرگەری لەبۆ چارەسەری زامی مەعیدەی ئاسوودە دەبوو.

زائر برۆخ یەکەم نوژدارەکە، کەوتە سەرئەو بیرەی کە لەنێو ژوورەوەی مەعیدەوێنەهەڵگرێ،بەلاّم نەک بە هۆی تیشکی X، بەڵکوبەهۆی کامیرایەکی بچکۆڵەی وێنەگری کەلەرێگای کرکرا کە (لوولەی گەردن) ی دەینارده نێو مەعدە وکامیراکەبەچەشن ێکی راستەوخۆ ولەرێگایەکی نزیک وێنەی لە ناوەوەی مەعیدە هەڵ دەگرت.

بەرلە زائربرۆخ نەخۆشی شێرپەنجەی قرقرۆچکە (لوولەی گەردن)بێ دەرمان وعیلاج بوو،دەبووە هۆی مردن و تێداچوونی نەخۆش. بەلاّم زائربرۆخ نەشتەرگەری لە قرقرۆچکەدا داهێناو کردی بەباو. ئەو بەشەی لە کرکراگە داکەتووشێ شێرپەنجە هاتبوو،برێ و فرێیدا،لەپاشان بۆئەوەی بەتالاّیی دروست نەبێ هەردوو جەمسەرە لێک هەڵبراوەکەی تێک کردەوە.

ئەمرۆش نوژداران کەمترخۆدەنەشتەرگەری قرقرۆچکەدەگەیەنن، بەچەشنێکی واکەئێستاش نەخۆشی شێرپەنجەی گەروو وەک نەخۆشیەکی بێدەرمانەوهۆی تووشبوونی نەجووتنی خۆراک و هەڵ لووشینی خۆراکی زبرو نووک تیژە ،بۆ نموونە نانی زۆر برژاوی برشتەیە، و زائر برۆخ دەیگوت لەگەڵ ئە وەی دا کەنانی برشتە (تۆست) لەباری تەندروستی "جهاز هاضمە"وە لە نانی هەویرەخاسترە،من بەباشی دەزانم نانی هویرەی نەبرژاو بخۆم هەتا نەکەومە بەر خەتەری شێرپەنجەی گەروو .

لەشاكارەكانی تری نەشتەرگەری زائیربرۆخ ئەوەبوو كەلەشەری یەكەمی جیهانیداچەندجاران دەست یان لاق كەبەیەكجارەكی پەری بوون توانی لەلەش موتوربەیان بكاتەوە،
تەمایگرت دەست و قاچی پەریو دانێتەوە سەر جێگای خۆی و سەربازی دەستوقاچ پەریو دەست و پێی خۆی وێدرایەوەو تا كۆتایی تەمەن، وەک كەسانی ئاسایی كەڵكیان لێ وەرگرت.
ئەورۆژەی كە زائیربرۆخ دەست و لاقی پەریوی لە لەش موتوربە دەكردەوە دەواودەرمانی ئەمرۆیی، بۆ نموونە"ئانتی بیوتیک" نەبوون وداوی هەنووكەیی كەلەنێو برین دا لەبەین دەچن هەر نەبوو نەبوو، زائیربرۆخ دەست و قاچی لێبۆوەی بە هۆی داوی ناودێر بە "كات گوت" كەلە ریخۆڵەی ئاژەڵان دروست دەكران و جورەژێیەكی گەلێک باریک بوون لە لەش دەدرووە و لەوە پاش مەترسی ئیلتیهابی برین ( چڵک كردنی زام ) هەبوو، كەچی نوژداریەكانی وی ئەوەندە وردو خاوێن بوون كە هیچ كات برین تووشی چڵک نەدەهات .
لە وان رۆژان دا نوژدارەكان،لەترسی پیس كردنی برین بە دەستەكانیان ، بەرلە عەمەلی نەشتەرگەری بۆماوەی پانزدە خولەک لەسەریەک دەستیان بە ئاو و سابوون وئاوەقسڵ دە شووشت تامیكرۆبەكانی دەستوپەل لەنێو بچن، لەحالێک داكە ئەمرۆ،نوژداردەستێک دەستەوانەی نایلونی یان جیری ئستریل كراو دەدەستی خۆدەكاو بەومتمانەیەی كەبەدەستەكانی خۆی برینی نەخۆش ئالوودەوپیس ناكا، عەمەلی نەشتەرگەری جێ بەجێ دەكا.

زائربرۆخ یەکەم نوژدارە کەبەهۆی عەمەلی نەشتەرگەری لە سیپەلاکدا،ئازارەباریکەی سییەکانی،کەنەخۆشیەکی کوشندە بوو ،دەرمانکرد و بە عەمەلی نوژداری، "لۆب" (کوارگ=بییرۆ)ێکی لە سیی نەخۆشێک کەبەنەخۆشی ئازارە باریکە زامداربببووهەڵ دەگرت ونەخۆشی دەردەداری ئازارەباریکەی لەمردن رزگار دەکرد.

دەرێنانی لووی شێرپەنجەیی،لە سیی و جگەر،لەلایەن زائر برۆخەوەبەشێک لەعەمەلەئاسایی وبێدەردەسەری نەشتەرگەر یەکانی دەهاتنە ئەژمار،ئەگەر مێتارتازیش (مێتارتاز یانی تەنینە وەی تانوپۆی شێرپەنجە لە بەشێکی لەش رابۆ بەشێکی تری، کەلەوحاڵەدا لەوبەشەش داتۆمۆر(لووی شێرپەنجە)ی تردێتە پێک هاتن_و،ف) روی نەدابا ئەونەخۆشەی کە گرفتاری "تومۆر " ێک لە سی یان جەرگدا بووبا،دەرمان دەکرا ولەمردن رزگاری دەبوو.

داهێنەری دەرهاوردنی لووی شێرپەنجەیی لە سییەکان و جەرگیش هەرزائربرۆخ بوو،هەرکەس لە هەرنوختەیەکی جیهان داکەبەهۆی نەشتەرگەری لووی شێر پەنجە یی سیی و جەرگ رزگاری دەبێ وگرفتاری مێتارتازنایێ، دووبارە سەلامەتی خۆی قەرزداری زائربرۆخە. زائربرۆخ لە نوژداری پلاستیکیش دا،یانی نەشتەرگەری لەبۆ جوانتر کردنی کەسانیش داهێنەر بوو، شێوە یەکی نوێ وتازەی بۆ جوانکردنی ئەوکەسانەی کەدەهاتنە لای داهێنا.ئەو دەشیا وەک نوژدارانی پلاستیکی ترشکڵی کەپوو ، گوێ، گۆناو دەموزار بگۆرێ، بەڵام هونەری ئەو نوژدارە بلیمەتەلەوە دابوو کەبەدەستێوەردانی لووەدەروونیەکانی کەسەکان ئەوانی جوان دەکرد،ئەویش جوانی

هـەمیـشەیی،نموونـەشـی"مـارلێن دیتـریش"ی دەورگێـڕی سـینەمـای ئاڵمانی یەکەئێستالەئەمریکادا خەریکی هونەرنوێنیـەوئـەمـرۆ نزیکـەی هـەشـتا سـاڵی لـەتـەمـەن را دەبرێ،هـەرکـەسـی کـە بیبینـێ ئـەگـەر نەیناسێ پێی وایـە ژنێکـی بیـست وپێـنج یـا بیـست وشـەش ،سالانە دەبینێ،هیچ کەس پێی وانیە ژنێکی سـی سـاڵەی چاوپێکـەوتـووە چ بگابەژنێکی هەشتا ساڵی، ئەو لەو کەسانەیەکەبە هـۆی زائربرۆخـەوە بووەخاوەنی جوانی وشەنگی هەمیشەیی.

گـەلێـک سـاڵ تێپـەریـون وهێـشتا هـیچ نـوژدارێکی پلاسـتیکی نەیتوانیوەلەم بەشە یانی جوانکردنی کەسان لەرێگای دەستێوەردانـی تەرایدانەوەی لووەدەروونیەکان کاری زائربرۆخ درێژە پێبدا.

بەراشکاوی دەکرێ بڵێین کەلەزوربەی زنجیرەکـانی نـوژداری سـەدەی بیستەم دا، کەئێستا چوارلەسەرپێنجی لێ رابراوە ، شـوێن پـەنجـەی داهێنان ولەهێدێکیان دا شەقڵی بلیمەتی زائر برۆخ بە روونی دیارە ، چـەنـد کـەس لـەسـەروک دەوڵـەتـانی جیهـان لـەلایـەن زائربـرۆخ خرانەژێرعەمەلی نەشتەرگەری کەیەکێ لەوان "سـتالین"بـوو،زائربرۆخ پاش برانەوەی شەری دووهەمـی جیهـانی لـەبـۆ عـەمـەلـی وی چـووە سۆڤیەت .ئەگەرچی دیار نیەکەکوێی عەمەل کردووە،چوونکـەهـەنـدێ دەڵێن لەبۆ عەمەلـی ئاپاندیـست (ریخۆڵـەکـوێرە)ی سـتالین نـاردرا سۆڤیەت و هێدێکیش گوتیان عەمەلی ریخۆڵەکوێرە ئەوەندەئـەسـتەم نیەکەنـوژدارێکی وەک زائـر برۆخـی بۆببـەنـە سـۆڤیەت ولـە خـوودی سـۆڤیەت نـوژداری ئـەوەنـدە لێزانـی لـێ هـەبـوو کـەدەیـانتوانی ریخۆڵەکوێرەی ستالین عەمەل بکەن ، ئەمانە دەڵێن زائربرۆخیان بـۆ

دەرێنانی لوویەکی شێرِ پەنجەیی ستالین بردۆتە سۆڤیەت، خوودی زائربرۆخیش تائەو رۆژەی زیندووبوو نەیگوت کە ستالینی بۆ چ نەخۆشیەک عەمەل کردووە، چوونکە بە پێی سوێندە کەی "بوقرات"بروای وابوو کە پزیشک دەبێ رازی نەخۆش بپارێزێ.
ئالفۆنسی سێزدەهەم، پاشای پێشووتری ئیسپانیاش لە لایەن زائربرۆخەوە خرایە ژێر عەمەلی نەشتەرگەری.
بەرلەشەری دووهەمی جیهانی دانوسانێک کرابۆئەوەی زائر برۆخ بچێتە تاران وشای پێشووترعەمەل بکا. بەڵام چوونکە لە تارانی ئەو کاتی دائامێروکەلوپەلی نوێی ئەوێ زەمانی وەک بەرلینێ نەبوو و راگوێستنی ئەوانیش بۆ تارانێ کارێک نەبوو کە لەچەندمانگ دا بکرێ،زائربرۆخ داوای لەشا کردبچێتە بەرلین تا بخرێتەبەر نەشتەر گەری. کەچی هەنگی کەویستی برواتە بەرلین، هیتلەر هێرشی کردەسەرلەهیستان (پۆلۆنیا)وشەری دووهەمی جیهانی قەوما، ئەو سەفەرەش پەکی کەوت.

## دەسکاریکردنی لووە شاراوەکان

لووە شاراوەکانی لەشی مرۆڤ بە زاراوەی پزیشکی نێو نەتەوەیی ناودێر کراون بە لووەکانی"ئێندوکرین"، وشەی ئێندو کرین وەک زوربەی زاراوەپزیشکیەکانی ترلە ریشەی یوونانیەوە وەرگیراوە، ئەم زاراوەش دووبنەمای یوونانی هەنە، "ئێندون" یەکێکەوئەویتر"کری نین". ئێندون لەزمانی یوونانیدایانی ناخی، دیوی ژوورو،دەروونی. وە

کری نین،یانی تەردانەوە، نمدانەوە وبە گشتی یانی ئەولووانەی لەناوەوەی لەش داتەرایی دەدەنەوە (رژێنەکان).لەزمانی فارسیشدابۆئەوەی لەگەڵ لووەکانی دیکە ی لەش،کە ئەوانیش تەراییدەدەنەوە،بەهەڵەوەرنەگیرێن،ناویان ناون "لووە شاراوەکان"چوونکێ شوێن دانانی تەرایی دانەوەی ئەوان لە ئەرک گەلی کۆ ئەندامی لەشی مرۆڤ،شاراوەترلە نمدانەوەی توسپیگەلی دیکەیەولەگەڵ ئەوەش داکەزانستی پزیشکی لە سەدەی شانزەهەمەوە هاتەنێوقۆناخی گەشە سەندنەوە ، هەتانیوەی دوو هەمی سەدەی نۆزدەهەم هیچکەس ئاگاداری لەشوێن دانانی تەرایی دانەوەی لووەدەروونیەکان لەسەرئەرکە کانی کۆئەندامی لەش نەبوو،لە پاش ئەوەی کە ئاگاداریشیان پەیداکردیسان تاماوەیەکی نەیاندەتوانی دەس دەئەرکی لووە دەروونیەکان،بەقازانجی دابین کردنی سەلامەتی خەڵکی، وەردەن.کەوابوو کەسیش نەیدەتوانی لەرێگای نەشتەرگەریەوە دەست دە لووە شاراوەکان وەردابە شێوەیەک کەلووەکان پتر یان کەمترتەرایی بدەنەوە.مێژووی پزیشکی دەری ناخاکە هەتا سەدەی بیستەم هیچکەس لەرێی نوژداریەوە دەستی دەلووە دەروونیەکان وەردابێ،یەکەم نوژداری کەتوانی لەرێگای نەشتەر گەریەوە دەست دەلووەکانی شاراوە وەردا، زائربرۆخ بوو.

هێندێک لەزانایان ئەرکگەلی کۆئەندامی جەرگی (کەزراو دەدا تەوە) و"پانکراس" ( کەئەنسوولین دەداتەدەر)بەبەشێک لە لووە دەروونیەکان دەژمێرن،بەلام زوربەی زانایانی توێگەری (ئاناتومی)

ئەم دووانەیان پێ بەشێک لەلووەکانی دەروونی نیە،لەروانگەی ئەوان لووەکانی دەروونی لەش بەپلەی یەکەم، لووەکانی : "هیپۆفیز"و "تیرۆئید"و "سورنال"ن،کەلووی یەکەم لە ژێرمێشکدا قەراری گرتووەولووی دووهەم لەگردن ولەوبەشەی دایە کە پۆزایی گەروو (کەڵەبابە)ی لێ هەڵکەوتووە وئوروپایی گوتەنی ئەو شو ێنەی کە "سێوی ئادەم وحەوای"تێدا وسورنالیش دوو لوون کە هەر یەکەی لەسەر گورچیلەیەک داندراون.(زانستی توێکەری لە لەشی مرۆڤ دا باسی حەڤدەلووی شاراوە دەکا، کەناوبردنیان دەبێتەهۆی درێژبوونەوەی باسەکە.و،ف).

تەرایی دانەوەی ئەم سێ لووەشەقڵی بەسەرگەلێک لەدیاردە کانی ژیانی مرۆڤ دا،هەرلە هاتنەدنیای را تامردنی، دیارە. ئەوانەی لەدەسپێکی ئەم سەدەیەوە تائەمرۆلەبۆدرێژکردنەوەی تەمەنی هەرمرۆڤێ خەریکی توێژینەوەن،یان وازیان لێیەجوانی وشەنگی تافی لاوەتی بەنەمری بێڵنەوە،چاوی هیوایان بریوەتە تەرایی دانەوەی ئەم سێ لووەولووەکانی دەروونی تری لەش.

لەدیاردەکانی ژیانی مرۆڤ، دەستەیەک بەشێوەیەکی راستە وخۆ بەسراوەن بەتەرایی دانەوەی ئەم لووانە ،ودەستە یەکیش نا راستەوخۆ،بۆنموونە بەرزی وقوڵەیی بەژنوبالا،یان قەڵەوی و لاوازی لەشولاربەسراوەن بەتەرایی دانەوەی ئەم لووانە، ئەگەر تەرایی دانەوەی لەباری ئەم لووانە نەبن زۆرخۆری مرۆڤ قەڵەو ناکا وبەژن وبالا بەرز نابێ،هەندێ لە زانایان پیر بوونیش پێوەنداربە نمدانەوەی هەندیک لەولووانە دەزانن.

❊ ❊ ❊

رۆژی سێیەمی مانگی جونی ساڵی١٩٤٨ی زایینی،زائربرۆخ وەک رۆژەکانی پێشترکاتژمێرحەوتی بەیانی لەخەو هەستا.ئەو بەپێی خووی هەمیشەی پاش لەخەوهەستان ریشی دادەماڵی ودەچووە حەمام،جا هەنگی بەرچایی دەخوارد. بەرچاییەکەی هەمیشە هێلکەورۆن وفنجانێک قاوەبوو.خووی هێلکە خواردنی بەیانانەهەرلەمنداڵییەوەلەزائربرۆخ داسەری هەڵدا،چوونکەدایک وباوکی هەژاربوون ولەئاڵماندا هێلکە خۆراکی هەرە هەرزان بوو، و چینی نەداری ئاڵمان بۆ بەرچایی هێلکەیان دەخوارد.

لەوان رۆژانی دوای شەرلەبەرلینی رۆژهەلاتدا،کەنشیمەنگای زائربرۆخ بوو،هێلکەجیرەبەندی کرابوو، ئەونوژدارەمەزنەش کە چ بەرچایی دەدیکەی نەدەخواردن رۆژێ بەهێلکەیەک رایدەبارد . زائر برۆخ لەدوای بەرچایی خواردن بەرەونەخۆشخانەی "شار یتی" کەوتەرێ تا بەکارەکانی تری رۆژانەی رابگا، ئەوێ رۆژێ دەبووپیاوێکی بەناوی"هینریخ گرێیف"کەئەکتەری سینەماو سی ونۆ ساڵی لەتەمەن هەڵبواردبوو،عەمەل بکا.

گشت رۆژێ سەرلەبەیانی لەنەخۆشخانەی شاریتی یاریدەرە قدیمیەکەی زائربرۆخ ئەمری دەکرد"وەتاغی عەمەل"ئامادەکەن وئەوکاتەی زائربرۆخ دەگەیشتەبەشی نەشتەرگەری هەموو شت لەبۆ عەمەل تەیارولەبەردەستان بوو،ئەوی رۆژێ بێجگەلە یاری دەری کۆن بەردەستەتازەکەی زائربرۆخ،کەگوتمان لەبارەی هەڵ بژاردنەکەی رەخنەیان دەگرت،حازربوو.نەخۆشەکەیان هێنا ژووری نەشتەر گەری کەلوویەکی لەژێرەوەی مێشک هاتبوو و زائربرۆخ دەبوو ئەو لووە

دەرێنی، زائربرۆخ بە یارمەتی کارگێرانی بەشی نەشتەرگەری بەرگی کاری پۆشی و دەستەوانەی لە میکرۆب دارناوی پلاستیکی کردەدەست ووەژوور دیوی عەمەل کەوت، لەباس کردنی بەوردی ژووری عەمەل وئەوکەسانەی کەدەبێ لە کاتی نەشتەرگەری (ئەویش نەشتەرگەری ورد لە سەرمێشک) لەم ژوورەدا حزووریان هەبێ وهەریەکەی ئەرکێک بگرێتە ئەستۆ چاو دەپۆشین،چوونکە ئەمرۆ بەبەربلاوبوونەوەی تەلەفیزیۆن، وئەوەی کە تەلەفیزیۆنەکان زورجاران دیمەنی ژوورە کانی نەشتەرگەری پیشانی بینەرانیان دەدەن گش ئەزانن کە لەنێوژوورێکی نەشتەر گەری گەورەدا وەتاغی نوژداری چ شکلێکی هەیە وچ کەسانێ لەوێدان.ئەوێ رۆژێ لەپاشوەی کە نەخۆشەکەیان بێهۆش کرد،لەحالێکداکەهەرتک یاریدەری کەون و نوێ لەملاوئەولای نوژداری مەزن راوەستابوون،زائربرۆخ دەستی کردبەهەلەشکاوتنی کازەلاکی نەخۆشەکە. دەستەکانی ئەو پیاوەحەفتاودووساڵەیەلەکاتی نەشتەرگەری دابەچەشنێ توندو تۆڵ وچالاک دەجوولان هەردەتگوت ژەنیارێکی بیست ساڵەیەو بە تلیەکانی خەریکی چەنگ ژەنینە،لووەزیانبەخشەزیادیەکە بە دەستی نوژداری مەزن لەمێشک هاتەدەرو کەوتە نێوزبلدان، ئیستێک دوایەیاریدەرانی زائر برۆخ کە چاویان لەسەرجێگەی نەشتەرگەریەکە هەلنەدەگرت،لە پر دیتیان کەکێردی زائربرۆخ بەرەو توسپی"هیپۆفیز" خوشی، وئەونەشتەرگەریە هیچ پێوەندی بەلووی هیپۆفیزەوە نەبوو . لەگەل ئەوەی یاریدەرانی کۆن وتازە دیتیان کەکێردی زائر برۆخ بە رەو

هیپـۆفیز رۆیـی و عـەمـەلـی ئـەو توسـپی یـەشـیان پـێ بـەخـۆرایی بوولێویان هەڵنەپچڕی، وەبیر یشیان نەهێنـاوە کـەنـابێ دەسـت لـەو لووەبدرێ.

تاکەسێ خوێندکاری زانکۆی پزیشکی نـەبـێ و دەورەی خوێنـدن و ئەوجـارفێری کـاری نـەشـتـەرگـەری لـەژێـردەسـت وچـاوەدێـری مـامۆ ستادانەدیبێ وپاشان نەبێتە یاریدەری نوژدارێکی مەزن، ناشێ بزانـێ کەئەوکەسانەی کەلـەژێـردەسـتی نـوژدارێکی مـەزنـدا رادێـن، چـەنـدە رێزلەکارەکانی زانـستی ونـەشـتـەر گـەری وی دەگـرن. مامۆسـتـایەکـی نوژدارلە روانگەی شاگردان و یاریدەرانیـەوە،جێـی لێنـەبـێ،وەک خـوا بەرزوبەتوانایەوبەخیاڵی خوێندکارێک،تەنانەت یاریـدەرێکدا،تێناپـەرێ کەئیرادلەمامۆستایەکـی نـەشـتـەرگـەربگـرێ. هـەرلـەبۆیـەدوویاریـدەری زائربرۆخ لەگەڵ ئەوەی دیتیان نەدەبوو کێردی مامۆسـتابەرەوتوسـپی هیپۆفیز خۆی باوێ ولووەکە ئازار بدات،وریایان نـەکـردەوە،عـەیبیـان لێ نەگرت چوونکی زائربرۆخ یان لەزانست وکردەوەدا پێ زاناوتوانـای رەها بوو، وەیانـدەزانـی کـە نـوژداری کـردن لـەسـەر لـووی هیپـۆفیز بەهۆی ئەو مامۆستا بلیمەتە پاڵی بەچاکەیەکەوە بـەسـتووەکـەئـەوان لێی ئاگادار نین. عەمـەلیـاتی نـەشـتـەرگـەری کۆتـایی هـات وئـەمـری بەستنی برین لەلایەن مامۆستاوە دەرچوو.

نەریتی نوژدارە گەورەکان ئەمەیە (یـان ئـەمـەبـوو)کـەهـەردوای تـەواو بوونی نەشتەرگەری لەژووری نـوژداری دەچنـەدەر و دەسـتەوانـەکـان لەدەست دادەرن ودەزبڵدانیان داوێن چوونکە پلەی خۆیان لـەوەبـەرز تردەزانن تالەپاش نەشتەرگەری،لەژووری عـەمـەل دا،بۆ پێچـانی زام

خۆیان ماتڵ بکەن،یاریدەرەکانیان برینە کەبەیارمەتی ئەوکەسانەی دی کەلەژووری نوژداری داحازرن دەپێچن،بەلآم زائربرۆخ لەدوای تەواوبوونی عەمەل لەژوورەکە نە دەچووە دەر ورادەوەستا هەتازامە کەپانسمان دەکرا. پاش ئەوەی برینەکەپێچرا هێشتانەخۆش هەر بێهۆش بوو، ئەو کاتەی لەژووری نوژداری دەیان بردەدەربەیاریدەرانی گوت پەلە نەکەن لەوەهۆش هێنانەوەی.

نەخۆش چوارکاتژمێر پاش ئەوەی لەژووری عەمەلرابردبوویانە ژووری سانەوەی هاتەوە هۆش بێ ئەوەی هەست بەژانەسەر بکا.

ئەونەشتەرگەریەی زائربرۆخ جێبەجێی کردبوولە سەر مێشکی نەخۆش بوو،مرۆڤ هەموو ژانەکان بەهۆی مێشک هەست پێدە کا ئەگەربگونجێ ئینسانێک بەبێ مێشک زیندووبێ ووەک مرۆ ڤێکی ئاسایی درێژە بەژیان بداهەست بە هیچ جورەدەردوژانێک ناکا،ئەمەیەکێ لەراستیەکانی پرلەسەر سامیە کەئەگەرچی مرۆڤ گشت ئێش وئازارەکانی بەهۆی مێشکەوەهەست پێدەکاکەچی مێشک خۆی،لەبەرانبەر ئەو زامانەی تێیدەکرێ کرە،یانی هەست بەژان ودەردناکا و چوونکە ناوەندی هۆش وئاوەزە ولەهەموو خانەکانی لەشی مرۆڤ بە هۆشترەهەرکەهەستی پێکردمەرگی مرۆنزیکەئیتربەهۆی رەگە هەستیارەکان عازابی لەژان بەرپابوو بەمرۆ ناچێژێ، لەبەروەی دەزانێ مەرگ نزیکەوپێویست ناکامرۆڤی بەدەرد وژانەوە گرفتاری ئازارێ بکا،هەتانەویش ناچاربێ بەر پەرچی مەرگ بداتەوە.

چاكەی بەدیهاتنی ژان وئازارلـەلـەش دا،بـەئـەمـری مێـشك، ئـەمـەیـە كەمرۆڤ ئاگاداربكرێتەوەوهەوڵ بداوبەرگری لـەمـەرگ بكا،ئـەودەمـەی كەمێشك تێگەیشت كەمەرگی مرۆڤ نزیكەو خـۆی لێناپـارێزرێ ئیتـر ئەمرناكابەرەگەهەستیارەكان كەلـەئینـسان دادەردوژان بـەدی بێـنن و لەوچەندساتەی بەرلەمەرگ هەموو جـورەدەردێـك لـەمـرۆڤ دا بنـەبـر دەبێ،پزیشكانی كۆن ئەم راستیەیان نەدەزانی وبەپێچەوانـەوە پێیـان وابووبەرلەمردن مرۆڤ تووشی ژانەكانی هەرەتوند دەبێ و بەخـەیـاڵی ئەوان ئەو عازابەدژوارەگیان لەلەشی مرۆڤ دەردەكا،و (عازابی گیـان دان)كـەلـەگـوت وبێـژی رۆژانـەی خـەڵكـی داجێـی خـۆی كردوتـەوە زاراوەیەكە پزیشكانی قەدیمی فێریان كردوون.

چوونكـە مێـشك بـەهـیچ بـرین وزامێـك هـەسـت بـەئـێش وژان ناكـا، هێنریخ گریف پاش ئەوەی وەهۆش هاتەوە لەمێشكی دا هەسـتی بـە ئازارنەكرد،بەڵام ئەوكەسەی مێشكی عەمـەل دەكـرێ لـە بـەشـێك لـە ماسـولكەكـانی لـەشیـشی دادەخرێتـە بـەرنـەشـتەرگـەری ولـەدوای ئەوەیكەهاتەوەهۆش خۆی لە ماسولكەكانیداهەست بەژان دەكا، بەڵام دەستی كارامەی زائربرۆخ ماسولكەكانی نەخۆشی ئەوەنـدە بـە وردی بریبوو كەئەولەماسولكەكانیشداهەستی بەدەردنەدەكرد.

لـەهـیچ زانكـۆی پزیـشكی داشـێوەی بـەجموجـوڵ دەرێنـانی كێـردی نەشتەرگەری،لەكاتی عەمەلێ دا، فێری خوێندكار ناكەن وتەنیا پـاش ئەوەی خوێنـدكار چـووەنێوتـالاری توێكـەری ولـەبـەرانبـەر كـەلاكێـك دارایانگرت تاكەلەش هەڵەشكێوێ ویـەكـەمـین ئـەزمـوون لـەنـەشـتەر گـەری داوەرگرێ،مامۆستاشـێوەی بـەدەسـتەوەگرتنـی كێـردی فێـر

دەكاوتێیدەگەیەنێ كەماسولكەكانی مردوویەك لە گەڵ مرۆڤێكی زیندووفەرقی هەیەودەبێ نەختێك پتركێردەكەی داگرێ هەتا ماسولكەی مردوو دەبردرێ. لەوە بەدواوە كە خوێند كار دەورەی توێگەری تێپەردەكاوهەنگی لەژێردەستی مامۆستا یەكی نوژدار دەست دەكابەفێربوونی كارولەپاشان خۆی دەبێ بەنەشتەرگەر وبەسەربەخۆیی درێژەبەكاردەدا،دەبێ لەبۆ هەڵ سوراندنی كێردی نوژداری لەماسولكەكانی جوراوجوری لەش دائەزموون وەسەریەك بنێ (دەلەشی مرۆڤ دالەباری تەنرانەوە حەوت جور ماسولكەی سەرەكی ونزیكەی سی جورماسولكەی ناسەرەكی هەنە).

بنچینەی ئەزموون لەبەشێك لەماسولكەكانی لەشدا ئەوەیە كەكێردی بەپێچەوانەی راكشاوی ژێیەكانی ماسولكە نەخاتەگەڕ، ئەوژێیانەی كەبەكۆ تەنراوێكی ماسولكەیی پێك دێنن لەنێوگۆشتدا بەباشی دێنە بەردەست ونوژدارتانەوجێگەی بۆی دەلوێ نابێ لە ماسولكەكانی جوراوجوری لەشدا كێردە كەی وابگرێ كەهێڵەكانی راكشاوی ژێیەكانی ماسولكە لە پانایی ژێیەكاندابېرێ. بەلام چونكە ماسولكەگەلی جوراوجوری لەش یەك شكڵ نین بەم دەستوورە هەمەكی یەلەكاتی نەشتەرگەری دا تووشی زۆر تەنگ وچەڵەمە دەبێ.

زائربرۆخ مامۆستایەك بوودەیزانی لەهەرماسولكەیەكداكێردە كەی چلۆن بخاتەگەركەبەرلەهەمووشتێ عەمەلەكە زووتر تەواوبێ ولەپاشانیش ئەوكەسەی خراوەتەژێرعەمەلی نەشتەر گەری، كە گێرایانەوەبۆژووری سانەوەی، هەست بەئێش وژان نەكا.

"هێنریخ گرێف"یش لەدوای ئەوەی کەوەهۆش هاتەوە هەستی بەژان نەدەکرد،بەڵام رۆژەکانی دواتر،ئیشتیای فرەی تێدابەدی هات بۆخواردنێ وهەرلەوحاڵەشداهەستی بەسستیوبێتاقەتی دەکرد. برینەکانی سەرومێشک بەشێوەیەکی ئاسایی زووچاک دەبنەوە هەربۆیە،هێنری گرێف دەبوو بەو زووانە لە نەخۆشخانە دەرچێ. بەڵام چوونکەهەستی بەبێتاقەتیەکی زۆردەکردو ئەو سستیەی پاش عەمەلی نوژداری مێشک حاڵێکی نائاسایی دەنواندوبەپێی رێوشوێن نەدەشیا بەوشێوەیە سست بێ، لە نەخۆشخانە ئیزنی دەرچوونیان نەدەدا.

زیادبوونی چاوەروان نەکراوی ئیشتیای ئەوپیاوە بووەهۆی ورمان وئەوجارنارەحەتی کارگێرانی نەخۆشخانەی شاریتی. ئەوان بۆیە پێیان ناخۆش بووکە لەو زستانەی١٩٤٨ ـ١٩٤٩ دابەرلین کەوتبووە ژێر گەمارۆی ئابووری سۆڤیەت وئیتر دانەوێڵەوخۆراک لەرێگای ئاو وبەژ دا نەدەگەیشتە بەرلین (یانی رێگای شاجۆیەکانی بەرلین کە وەک جادەن لەپایتەختی ئاڵمان دا) .

ئەگەرچی بەرلینی رۆژهەڵات لەباری ئیداری و خۆراکەوە وەزعێکی تایبەت بەخۆی هەبوو،قەلاچۆی بەرلینێ تەئسیری نالە باری لەجیرەخۆراکی دانیشتوانی بەرلینی رۆژهەڵات نە دەکرد و خەڵکی بەرلینی رۆژهەڵات،هەروا جیرەخۆراکی خۆیان وەردەگرت. بەڵام تائەورۆژەی کەبەرلین لەلایەن دەوڵەتی سۆڤیەتەوە گەمارۆنەدرابووهەموورۆژێ لەبەرلینی رۆژئاواوە رادەیەکی زۆرخۆراک ودانەوێڵە دەچووە بەرلینی رۆژهەڵات و لە بازاری رەشدادەفرۆشرا

وئەوانەی پارەیـان هـەبـوو وەدەیانـەویـست خـۆراكی زیاترووباشـتربخۆن لەبازاری رەش داشتیان دەكری.
ئـەودیـوارەی كـەئێـستالەنێـوان بـەرلینـی رۆژاوارۆژهـەڵاتـدا لێـدراوە لەورۆژگاری دانەبوو،دەگەڵوەی كەكرین وفرۆشتنی شتومەكی بەرلینی رۆژاوا لـەبـەشـی رۆژهـەڵاتـدا یاسـاغ كرابـوو كـەچـی بـە قاچـاغی دەفرۆشران.بەڵام پاش ئەوەی بـەرلینـی رۆژاوا كـەوتـەبـەر گـەمـارۆی ئابووری بازاری رەشی بەرلینی رۆژهەڵات داخرا.
لەنـەخۆشـخانەی شـاریتی داچـەندنـەخـۆش دەشـیان لـەبـازاری رەش داخۆراك بكرن،بەڵام لەدوای داخرانـی بـازارەكـە ئیـتـر خۆراكیـان پـێ نەگەیی. هێنری گرێفی ئەكتـەریـش پێـی نـەدەكـرا لـەبـازاری رەشـدا ئازووقە پەیدا بكا.
ئەوزەوەریەی دەدرانەخۆشخانە بەربەست بووكەچی ئیشتیای هێنـریخ گرێـف نادیـار وكـارگێرانی نـەخۆشـخانە سـەرسـام بـوون كـە بـۆچی ئـەوپیـاوەی كـەلـەخـواردن تێرنـاخوا،دەگـەڵ ئـەوزۆرخۆریـەشـی دائەوەندەسست وبێ هێزەكەتەنانـەت هـەسـتانەولـەسـەرجـێش بـۆی دژوارە،لەحاڵێكدا كە خۆراكی زۆرلـەلـەشـدا تـین وەبـەر دێنـێ دەبوو ببێتـە هـۆی هێز،یـان لانـی كـەم ئـەوەنـدەی گـوڕ بـەدی هێنابـا كـە ئەوپیاوە توانیبای بێ گرفت لەسەرقەرەوێڵەكەی هاتبا خوار.
رۆژێكی كـە هێنـریخ گریـف لـەسـەر جێگاكـەی هاتـەخوارولـە ئاوێنـە داخۆی دی بەسەرسورمانەوە هەستی كرد بەژنیَ درێژ بووە.
زەنگی لێدا وپەرستاری نەخۆشخانە هات.نەخـۆش پێـێ گـوت داخـوا دەبینی كە بەژنی من چەندە راكشاوە؟.

ژنەی پەرستار چاوێکی بە سەرتاپای گرێف دا گێرا وگوتی ئەز ناهێتە بەر چاوم کە قەدوبالآت درێژ بووبێ.
لەپاش ئەوەی کە پزیشکی کێشک، بەپێی نەریتی گشت خەستەخانەکانی تر،بەیانی لەژووری نەخۆشەکە وەژوور کەوت هێنری گرێف بە ویشی گوت کەبەژنی درێژ بووە.پزێشک کە هە ستی کرد نابێ گوتەی پیاوەکە لەسەر خەیاڵ وگومان هەڵچنرا بێ چووە سەر پەروەندە (دوسیە)کەی.
لەپەروەندەکەدابەژنوبالآی ئەوپیاوەیان نووسی بوو یەکوحەفتا وسێ سانتیمەتر،بەڵام کەقەلافەتیان پێوا وەدەرکەوت کەدرێژی بەژنی دەگاتە یەکو حەفتاوهەشت سانتی مەتر ولەو ماوە کورتە دا پێنج سانتیمەتر لەدرێژایی بەژنی زیادبووە! کە ئەم مەبەستە لە تەمەنی سی ونۆ ساڵەیی دا روداوێکی لەسروشت بەدەرە، چوونکە هەڵکشانی قەدوبالآی مرۆڤ چاخێکی تایبەتی هەیە و پاش ئەوەی ئەو دەورەیە رابرا ئیدی بەژنی بەشەر درێژ نابێ، و لەدەورانی بە سالآچوویی دالەبەر لەکورتی دانی ئەو ماددانەی کەکەرەستەی سەرەکی ئێسکەکانی لەش پێک دێنن تەنانەت رەنگە لە درێژایی بەژن وبالآی مرۆڤ کەمیش بێتەوە.
راپۆرتی پزیشکی کێشک گەیشتە سەرۆکی نەخۆشخانەی شاریتی وخوودی خۆی کەباوەری بە راپۆرتەکە نەبوو وپێی وابوو هەڵەیە کەوتە سەر ئەوەی توێژینەوە بکا، سا دیاری دا لەو ماوە کورتەی کەبەسەرنەشتەرگەری نەخۆش دا تێپەریوە پێنج سانتیمەتر لە

قەلافەتی هێنری گرێف زیادی کردووە ونارەحەتی و کەم هێزیەکەی بە ئیحتیمالی نزیک لە یەقین پێوەندی بەو روداوەوە هەیە.
چەند رۆژ کەلەم روداوە رابرا زیادبوونی قەدوبالای نەخۆش لە پێنج سانتی مەتر تێپەری وگەیشتە حەوت وهەشت سانتی مەتر بەشێوەیەکی وا کە قەرەوێڵەکە بۆ هێنریخ گرێف قوڵە بۆوە.

## چەند وشەیەك سەبارەت بە: هیتلەرە هەلو

هەڵکشانی بەژنی پیاوێک بەهۆی دەستوەردانی لووی هیپۆفیز لەولاتی ئاڵمانداروداوێکی دەگمەن نەبوو.بەرلەزائربرۆخ نوژداری تری دەئالمانی ئەم کارەیان لەبۆ بەرزتر کردنی ئەندامی مرۆڤ (هەڵبەتە پاش ئەو دەورەیە لەتەمەن کە ئیتر بەرزبوونی بەژن را دەوەستێ،نەک لەقۆناخی منالی وتافی لاوەتی دا)جێبەجێیان کردبووبەوفەرقەی کەنوژدارانی تربەئەنقەست دەستیان بۆ لووی هیپۆفیز دەبرد وزائربرۆخ بەناقەست وهەروالەخۆوە دەسکاری توسپی کابرای ئەکتەری کرد.
ساڵی ۱۹٤۰ی زایینی لەپاش ئەوەی سپای ئاڵمانی هیتلەری فەرانسەی لەپێ پەراند،هیتلەربەدەگوێداهەڵخوێندنی فیلسوفە کانی نازی بەتایبەت "روزانبێرک" و "ژولیوس ئیشترایخێر" خۆی ئامادەکردتابێ بەفەرمانرەوای جیهان. ئەم دووفیلسوفەی نازی لە لایەنگرانی هەرەتوندوتیژی ئەسڵی سەروەتر بوونی رەگەزی ئاریایی بوون سەبارەت بەرەگەزەکانی تری مرۆیی،یەکێ لەکارا کتەرەکانی

مەزنایەتی رەگەزیی ئەوەیە کەژنـانی ئاڵمـانی بـەژن زراوتـرن لـەژنـی رەگەزەکانی تری مرۆیی.

لەراستەراستی ئەم دیمانەیـەدا،پـاش ئـەوەی کـەفـەرانسە لـە سـاڵی ١٩٤٠کەوتەژێررکێفی نازیەوە،دەوڵەتی ئاڵمانی هیتلەری لەژێر بەگوێدا هەڵخوێندنی فیلسوفانی حیزبی نازی کەوتە خۆ، لەبـۆ ئیـدارەکردنـی کاروباری دنیایە لەلایەن دەوڵەتی ئاڵمانەوە ، کەپێیان وابووبەزوویـی بەسـەرجیهانداسـەردەکـەوێ کـەسـی دەوا پـەروەردە بکاکـەسـەنبـولی رەگـەزی ئاریـایی ودیاریـدەری ئاکـاروخوو گـەلـی دەسـەڵاتـدارێکی نازی (بەپێی پێداهەڵدانی خوودی نازیە کان)بن.

لەبۆ هاتنـە دی ئـەم مـەبـەستە هـەزارکـەسیان لـەژن وپیـاگی لاوی ئاڵمانی کەلەباری قەلافەت وهەیکەلەوە نموونەیەک بـوون لـەرەگـەزی ئاریـایی (بـەرانبـەر دەگـەڵ پێناسـەی فیلسوفانی نـازی)هـەڵبـژارد و رایانگوێستن بۆناوچەی کوێستانی "باڤیر"ی هەڵکەوتوو لـە باشـووری ئاڵمان ونیشتەجـێ یـان کردن،لـە چیایـەکـی بـاڤیر بـەنـاوی "هێلانـە هەڵۆ".

ئەو پیاو وژنانەی کەلە هێلانە هەڵۆ دا نیشتەجـێ کـران گـشتیان بـە داخـوازی خـۆ چـو بـوون وپرۆگرامـی فێرکـردن وپـەروەردەی ئـەو نـاوەنـدەیـان لـەنـاخی دڵـەوە وەردەگـرت ودەشـیانزانی کـەلـەکۆتـایی خوولی پێگەیاندن وراهێنان دا،هەریەکەیان، دەبنە فەرمانرەوای یەکێ لە وڵاتەکانی جیهان.

یەکێ لەوکارانەی کەلە ناوەندی فێرکردن وبارهێنانی هێلانە هەڵۆ دا جێبەجێ دەکرا،درێژ کردنی بەژن وبالآی ئەوان بوو، لە رێگای دەسکاری کردنی لووی هیپۆفیزەوە.

ئەرک گەلی کۆئەندامی لەشی مرۆڤ لەگەڵ مێشک لە پێوەندی دانە.ئەگەر بەژن وبالآی بە دەستێوەردانی لووی هیپۆفیزەوە درێژ بکەنەوە،ئەودیاردەیە،لەتەواوی ئەندامەکانی ناوەوەی لەش دا تەئسیر دەکا هەربۆیە لە هێلانە هەڵۆ دا پزیشکان و نوژدارانی ئاڵمانی شوێن دانانی بەرزبوونی قامەتیان لەسەر ئەندامە سەرەکیەکانی لەشدا وەک دڵ،سی ،جەرگ،گورچیلەکان،مەدە وهتد... دەبەر چاو دەگرت.

لەگەڵ وەی ئاگاداریمان لەسەر ژمارەی ئەو نوژدار وپزیشکانەی کە لە هێلانە هەڵۆ دابوون نیە،دەزانین کە زائربرۆخ لە نەشتەرگەرە کانی ئەوێ نەبوو.

هەرچۆنێک بێ، دەسوەردان دەلووی هیپۆفیزی مرۆڤێکی باڵغی رەسیو کە سەردەمی هەڵکشانی بەژن وبالآی تێپەریوە،لە ئاڵمان دا بێ پێشینە نەبوو،دوکتۆر"وێلفرێد"ی یاریدەری زائربرۆخ کەگوتمان لە نازیەکان بوو دەیزانی کەلە هێلانە هەڵۆ دا،نوژدارەکان،بۆ درێژتر کردن یان لەحاڵێکدا کە بەژنیان لەرادەی پێویست پتر بڵند بووبا، بۆ کورت کردنەوەی بەژنی داخوازەکان،لووی هیپۆفیزی ئەوانیان دەخستە ژێر نەشتەرگەریەوە.

ناوەندی فێرکردن وبارهێنانی هێلانە هەڵۆ هەتا ساڵی ١٩٤٤ بەردەوام بوو ولەپاش ئەوەی کەلە مانگی ژووئیەی ئەوێ ساڵێ

بەدژی هیتلەروبەهۆی بۆم هێرشی کرایەسەر تابیکوژن وئاڵمانیٚ لەمەترسی تیاچوون بەدەستی دەوڵەتە سەرکەوتووەکان بپارێزن، رێکخراوی هێلانە هەلّو لەبەریەک هەڵوەشا و وەدەرکەوت کەبەر پرسی ئەوێش بەدژی هیتلەر بەشداربووە ودەشزانین کەزیاتر لە هەزار کەس، کەتاوانبار کرابوون بە دەست هەبوون لە تیرۆر کردنی هیتلەر دا، لەسێدارە دران.تاساڵی دواییش کەهیتلەر زیندووبوو وازی لەو کەسانە نەهێنا کەخەریکی لەنێوبردنی بوون وهەرکەس کەدەکەوتەبەر شکی تاوانی ئەو تیرۆر کردنە لەداری دەدا،تەنانەت بیستویەک رۆژبەرلەوەیکەلەحەشارگەی بینای سەدری ئەعزەمی ئاڵمان داخۆکوژی بکا یانی لەدەیەمی ئەپریلی ١٩٤٥دەریاسالار "کاناریس" بەرپرسی رێکخراوی سیخوری ودژە جاسووسی ئائمانی لەگرتووخانەیەک بەناوی"فلوس بێرک"لەسێدارە دا.

ئاریٚ،پاشئەوەی درێژ بوونی بەژن وبالآی هێنریخ گرێف لە نەخۆشخانەگەیشتەپلەیەکی وا کەترس بەدی بێنیٚ،سەرپەرستی نەخۆشخانە راپۆرتی روداوەکەی دا بەسەرووی خۆی وبە ئەمری سەرۆکی نەخۆشخانە قەرار دراکەلووی هیپۆفیزی هێنریخ گرێف جارێکی دیش بخرێتەوە ژێر عەمەلی نەشتەرگەری،بەلآم ئەمجار لەبۆ ئەوەی کە قەدوبالآی کورت کەنەوە،دوکتۆر ویلفرێد راسپێردرا بۆ نوژداریەکە.

لووی هیپۆفیز وەک ئەندامەکانی تری لەش بەشێوەیەکی ئاسایی خێوی دوو رەگە،یەکیٚ رەگی هەستیار ویەکیٚ رەگی بزوێنەر،رەگی دووهەم رێک وپێک کردنی هەرەکات وسەکەناتی بەستۆوەیە،بەلآم

ئەگەررەگی دووهەم ببرن ئەولووە لەکار ناکەوێ. ئەگەر رەگی بزوێنەری پێ یادەست هەڵبرن ئیتر ناکرێ دەست و پێ بجوولێ،کەچی هەرگا رەگی بزوێنەری لووی هیپۆفیز ببردرێ ئەولووە درێژە بەکاری خۆ دەدا بەڵام بەبەربڵاویەکی زیاتر وزائربرۆخ رەگی بزوێنەری ئەکتەری سی ونۆ ساڵەی بری بوو، لەئاکام دا کار کردنی ئەولووە ئەوەندەی خۆ بەرفراوان کردکە بەژنی هیریخ گرێف درێژ بوو . دەبێ ئەوەش بزانرێ کە پاش ئەوەی کار کردنی لووی هیپۆفیز خۆی بەربڵاو کرد،ئەوزێدە کاریە بەرنامەیەکی هەمیشەیی نابێ.بەڵام دوکتۆر ویڵفرێدلەبۆئەوەی لەدرێژایی بەژنوباڵای کابرای ئەکتەر کەم کاتەوە، چاوەروان نەمایەوە هەتا کو ئەوەی لووی هیپۆ فیزهەربۆخۆی لەزێدەکاریەکەی راوەستێ،چوونکو تائەوکاتی درێژا یەتی قامەتی کابرا دەگەیشتە درێژی "عوج"، هەر بۆیە تەمای گرت کەرتێ لە لووی هیپۆفیزی ئەو پیاوە ببرێ هەتاکو لەچالاکی توسپی کەم بێتەوە، هەر ئەوکارەی کرد وراپۆرتی کارەکەشی دا بە سەرۆکی نەخۆشخانە.

یەکەم ئاکامی عەمەلی دووهەم لەسەر لووی هیپۆفیزی هینریخ گرێف ئەوەبوو کەئەو ئیشتیا نائاساییەی خۆی کەلەبۆ کارگێرانی نەخۆشخانە سەرسورێنەر بوو، لەدەست دا. لەو رۆژانەی بەرلینی قەڵاچو دراو لەلایەن دەولەتی سۆڤیەتەوە،لەنێو چوونی ئیشتیای هینریخ گرێف بۆ ئەوبەشە لەکارگێرانی نەخۆشخانەی شاریتی کە بەرپرسی گەیاندنی خوراک وئازووخەی خەستەخانەکە بوون خۆی لەخۆی دا سەرکەوتنێک بوو،دوکتۆر ویلفرێد بە کاربەدەستانی

نەخۆشخانەی گوت کەبەزوویی لە درێژایی بەژنی نەخۆش کەم دەبێتەوە.

بەڵام ئەندامەسەرەکیەکانی لەشی مرۆڤ لەوپێوەندەی کەپێکەوە هەیانە،بۆنموونە،وەک خوشینی ئاوە لەکاسەگەلی پێک لکاودا.لە کاسەگەلی پێک لکاودا،ئاو،لەیەک رووداا رادەوەستێ وهەربەو هۆیەشە کەلەگشت جیهاندا،ئاوی دەریاوئۆقیانووسەکان لەیەک روو دادەوەستن،مەگەر لەوەختی هەڵسانی دەریا وتوفاندا.

لەلەشی مرۆڤیش دائەوکاتەی یەکێ لەئەندامە سەرەکیەکانی تووشی نەخۆشیەک دێ لەئەندامەکانی تردا شوێن وشەقڵ بەدی دێنێ چ بگابە ترایی دانەوەی لووەکانی رێژێنی لەش،.یەکێ لەوان لووی هیپۆفیز،کەئەگەر لەسەرهەموو ئەندامە سەرەکیەکانی لەش تەئسیر دانەنێ لەسەر زوربەیان کاریگەر دەبێ.

رۆژێ لەرۆژان زائربرۆخ بەناقەست،لووی هیپۆفیزی کابرای ئەکتەری خستە ژێر نەشتەرگەریەوە وکاردانەوەی عەمەلەکە،لەئەندامەکانی لەشی هینریخ گرێف دا وەدەرکەوتن، ئیشتیاسەری لەزێدەیی داو خانەکانی لەش بەربڵاویان لەخۆ نیشاندا،بەڵام ئەو رۆژێ کە دوکتۆر ویلفرێد لەبۆنەوەی کە قەدوباڵای کابرای ئەکتەر کۆتا بکاتەوەولووی هیپۆفیزی خستە ژێر عەمەل،ئەگەرچی کاسەگەلی پێک لکاو،پێکەوە پێوەندیان هەبوو ـ بەڵام لە رێچکەی نموونەوە ــ دەکرێ بڵەین ئاویان پێدا نەدەخوشی کەلەکاسەیەکەوە بچێتە کاسەیەکی تر.

ئەو رۆژەی کەهینریخ گرێف لەپاش نەشتەرگەری مێشک لە خەستەخانەدا خەوێندرا نەخۆشێک بوو وەک نەخۆشانیتر، کەچی

دوای ئەوەی لەدرێژایی بەژنی زیادبوو وهەنگی لووی هیپۆفیزیان عەمەل کردهەتا لە داهۆڵی قەدی کەم کەنەوە،لەبۆ پزیشکانی نەخۆشخانە بووبە"سوژێت"ێک،ئەمە زاراوەیەکی پزیشکیە لە بۆ "میکرۆب"ێک،یان"خانە"یێک، یان"کەس"ێک کەدوکتۆران لەبەر وەدەست هێنانی ئەزموون وزیاد کردن لەزانیاریەکانی خۆیان بیخە نە بەر توێژینەوە.

ئەوکاتەی کەشتێک لەبۆ پزیشکان دەبێتە"سوژێت"،مەبەستی دەرمان کردنەکەی دەکەوێتە پلەی دووهەمی گرینگایەتی وئەوەی لەپلەی یەکەم دا بۆپزیشکان گرینگە ئەمەسە کە سوژێتەکە چ ئاڵوگۆرێکی بەسەر دادێ.

تەواوی دوکتۆرەکانی نەخۆشخانە،سەبارەت بە هینریخ گرێف،لەو بابەتەیەوەکەلە دیمانەیان دا" سوژێت"ێک بوو،کەیفیان پێ دەهات، ورۆژبەرۆژ ئەویان دەخستەژێر نۆرینی وردەوەهەتا ببینن داخواچەندە لە داهۆڵی باڵای کەم بوتەوە ،وەک بڵەی بەباشی دەیانزانی کە ئەرکگەلی کۆ ئەندامی لەشی مرۆڤ وەک کردەی کلیلێکی چرای کارەبا نیەکە بەئەنگوست پێوەنانی دوگمە چرا روشن وئیستێکی دیکە بەکرتە لێهێنانی دوگمەکە چرا بکوژێتەوە،ماوەیەک دەبێ تێپەڕێ تاتەئسیری نەشتەرگەری لەگشت بەشەکانی لەش ئاشکرا بێ.

پەروەندەکانی پزیشکی ونوژداری هێلانە هەڵۆ لەبەردەست دانەبوون ـ رەنگە پاش ئەوەی رێکخراوی هێلانە هەڵۆ لەبەریەک هەڵوەشا، خوودی ئاڵمانیەکان ئەو پەروەندانەی ئەوێیان لەنێو بردون ـ

وەچوونکە ئەو پەروەندانە لەگۆڕێ دانەبوون دوکتۆرویلفرێد و نـوژدار وپزیشکەکانی تری نـەخۆشـخانەی شـاریتی ئاگاداریـان نـەبـوو کـەلـە هێلانە هەلۆ دا پاش ئەوەی کە لـەبـۆ قوڵـە کردنـەوەی قامـەتـی زۆر هـەڵچـووی داوخـوازەکـانی ئـەوێ،دەسـکاریان لـەلـووی هیپۆفیزیـان دادەکرد،چەندی ماوە پێویست بوو تا بەژنیان کورت بێتەوە.

بەڵام لەبارەی هینـریخ گرێف،بـە سـەرنـج دان بـە نموونـەی سـەروو، ئیترئاو لەکاسەگەلی پێک لکاوداخوشینی نـەمـا و دڵـی نـەخـۆش لـە لێدان کەوت،بەیانیەک کەپـەرسـتار هاتـە ژووری نـەخـۆش دیتـی کـە مردووە. زائر برۆخ ئاگاداری عەمەلی دوکتۆر ویلفرێد لـەمـەر هینـریخ گرێف نەبوو چوونکە لەبەر وەرزی هاوینێ چووبووە ئیجازە ولەڤیلای بچووکی خۆی داکەلەئەیالەتی"ماگێدبورگ"ی هـەڵکـەوتوولـە ئاڵمـانی رۆژ هەڵات دابوو،رایدەبارد.

لەو زەمانی دا، هێشتا، دەوڵەتی ئاڵمانی رۆژهەڵات بەشێوەی فـەرمـی دانەمەزرابوو،بەڵام لەئەیالەتەکانی رۆژهـەڵاتـدا زەوی وزاری وەرزێـری دەکرانـە هـەرەوەزی،کـەچـی خانووبـەرە وئـەو ڤیلایانـەی کـە جێگـە دانیـــشتنی کـــەس وبنـــەماڵـــەو خێزانـــەکـــان بـــوون لێیـــان نـەدەسـاندن،لەبـەرئـەوەی کـەبـەشـێک نـەبـوون لـەکـەرەسـتە ی وەبەرهێنان،بەڵام کەیەکێک خانوو یاڤیلای خۆی بەکرێ دابا ، لێیـان زەوت دەکرد چوونکە دەبووە کەرەسەی وەبەر هێنان.

زائربرۆخ ڤیلابچکوڵەی لەئەیالەتـی ماگێدبورگ بۆمایـەوە،ئـەم پیـاوە پشووی هاوینەی ساڵی١٩٤٨ی لەڤیلای خۆدا رابارد ، لە دوای پشوو تـەواو بـوون گـەرایـەوە بـەرلـین وهـەر ئـەودەمـی بریـاردرا کـەئـەو

نوژدارەمەزنەپیاوێک بەناوی "کارێل" کەکادیری حیزبی کۆمونیست لەیەکێ لە ئەیالەتەکانی رۆژھەلات بوو،بخاتەبەرعەمەلی نەشتەرگەری.

کارێل لەپاشەوەی کەسەری لەنەخۆشخانەی شاریتی دا گوتی دەبێ بەدەستی زائربرۆخ نوژداری بۆبکرێ نەک بەدەستی نەشتەرگەرەکانی تر،چوونکەپیاوێکی نێوبەدەرەوەوبەداخوازی کات بەرچاو بوو ناچاربوون داواکەی وەربگرن. کارێل بەردی گورچیلەی هەبوو و پزیشکان نەیان توانی بوو بەدەوا ودەرمان بەردەکەی بۆ دەرخەن ، گوتیان دەبێ نەشتەرگەری بۆ بکرێ. ئەو وێنانەی لە گورچیلەیان هەلگرتبووجەختیان لەسەرهەبوونی دووبەرد دەکرد، کەچی دوکتۆرەکان پێیان وابوو رەنگە لە نێوان ئەو دوو بەردە دا بەردێکی تریش هەبێ کەلە وێنەکەدا نابینرێ.

رۆژی نۆیەمی سیپتامبر لەبۆ عەمەلی نەشتەرگەری کارێل دیاری کرا،لەوێ رۆژێ دازائربرۆخ لەوەختی دیاری کراو دا هاتە نەخۆشخانەودەستەکانی شوشتودەستەوانەی کردە دەستان و لە ژووری نەشتەرگەری وەژوور کەوت.

هەموولا دەزانن کە لەو عەمەلانەی کە لەسەر دیوی دەرەوەی لەش جێبەجێ دەکرێن بێهۆش کردنی نەخۆش پێویست نیە و بە سڕ کردنی شوێنەکە نوژداری لەسەر دەکەن بەلام هەنگێنێ کە گورچیلەی نەخۆشێک دەخرێتە بەر نەشتەرگەری دەبێ، بێهۆش بکرێ.

لەژووری عەمەلدایاریدەرانی زائربرۆخ حازر بوون،لەپاش ئەوەی کەئەو نوژدارەمەزنە شوێنی هەڵدرینەکەی دیاری کرد ئەوەندە بە دەستوبرد گورچیلەی نەخۆشی هەڵەشکاوت وسێ ورتکە بەردی لێ دەرێناکەدەتگوت قەیسیەک دەقەڵێشێ هەتا دەنکە کەی لێ دەرخا .دەستەکانی ئەو پیرە پیاوە حەفتاودوو ساڵەیە ئەوەندەبەتوندی وپەلەدەجووڵان کەهیچ کام لەدوویاریدەرەکەی نەیاندی کە پاش عەمەلەکەکێردی نەشتەرگەری زائربرۆخ بەرەو لووی"سورنال" ی جێگرتوو لەبان گورچیلە،خۆی هاویشت وبڕی.

لووی سورنالیش یەکێکە لەلووە دەروونیەکانی لەشی مرۆڤ،لە لەشی هەر ئینسانێک دادوو لووی سورنال هەنەکەهەریەکەی لەسەرگورچیلەیەک جێیان گرتووە،مانای وشەی سورنال "سە رووی گورچیلە"یە،ئەم دوو لووەش وەک لووەکانی تری رێژێن لەباری ئەرکەکانی کۆئەندامەوە،هەروەک دەکەوێتەبەرچاومان، زۆر گرینگن و تێزانەوەیان،ئەرکەکانی لەش رێکوپێک دەکاویەکێ لەمانە مایەی ناوداری"کۆرتیزۆن"و لووەکەیتر مایەی ناسراو ی "ئادێرنالین"دەداتەوە، ودەبێ ئەوەش بزانرێ کەتەرایی دانەوەی هەموو توسپی گەلی دەروونی لەش ناوێکی گشتی پزیشکیان هەیەوئەویش"هورمۆن"ە، سابۆیە کۆرتیزۆن هورمونێکە و ئادێرنالین هورمونێکی تر.

لەپاش تەواوبوونی کار،برینی نەخۆشیان پێچاولەژووری عەمەل را رایانگوێست بۆ ژووری سانەوەی، چوونکە کادیرێکی ئاڵمانی

ڕۆژهەڵات بوو چاوەدێرێکیان بۆئاگالێبوون لەزاردەرکی ژوورەکەی دانا .

## سوور هەڵگەرانی هەموو لەش

ڕۆژی دوایی، ڕاپۆرتی پزیشکی کێشک نیشانی دەداکە حاڵی نەخۆش باشەو لەڕۆژەکانی سێ وچواریش دا وەزعی نەخۆشەکە باش بوو.کەچی بەیانی ڕۆژی پێنجەم ئەو کاتەی ژنەپەرستارەکە هاتە ژووری نەخۆش وچاوی بەروخساری کارێل کەوت،واقی وڕ ما، چوونکە دیتی کەرەنگی دەموچاوی سوور هەڵگەراوە .
سوور هەڵگەرانی ڕەنگی روخسار،ئەگەر بەهۆی حاڵی خنکانەوە نەبێ،بەشێوەی ئاسایی لە پشووسواریە .ژنەپەرستارەکە،وەک گشت پەرستارەکانی ترئاگای لە سەرەتای"پاتۆلۆژی" هەبوو،یانی لە دەسپێکی نەخۆشیەکان دەگەیشت،زانی کەسوورهەڵگەرانی سیمای کارێل لەبەر ڕاوەستانی دڵ ومێشک نیە . وێرای ئەوەش دەیزانی کە هێشتا کارێل دەموچاوی خۆی لە ئاوێنەدا نەدیوە،بۆیە نابێ پێی بگوترێ کەروخساری سوور هەڵگەراوە ،چوونکە ترس دایدەگرێ .
ژنەی پەرستار بەبێوەی چ بڵێ کەنەخۆش بترسێ برێک لەگەڵ کارێل دوا تا تێبگاکە داخوا سوورایەتی سەروسیمای لەبەر پشوو سواریەیان نا،بەڵام بۆی دەرکەوت کەئەوبەبێ گرێ هەواهەڵدەمژێ وحاڵی گەلێک باشەو تاشی لێنیە .
پزیشکی کێشک لەوەختی دیاری کراودا هاتە نێو ژووری کارێل و ئەو لە ڕاپۆرتی ژنەپەرستارەکەوە دەیزانی کە سەروچاوی سوور

هەڵگەراوە. ئەوبە بیانووی چاولێکردنی برینی نەخۆش،پەتوی سەر کارێلی هەڵداوەتا سک وسینگی ببینێ،تەماشای کرد زگ وسینە گشتی سوورهەڵگەراوە بێوەی کەنەخۆش هەست بەنارەحەتیەکی هەرە بچکوڵەش بکا.

سوور هەڵگەرانی سیماولەشی نەخۆش،لەگەڵ هیچیەک لەپێوانە کانی پزیشکی یەکی نەدەگرتەوەو هیچ کام لە دوکتۆرەکانی ئەوێ پەیان بەبنووس وهۆی نەدەبرد.

بەزانربرۆخیان گوت ئەو نەخۆشەی کەئێوە نەشتەرگەریتان کردووە حاڵی باشە بەڵام رەنگی سوور هەڵگەراوە.

نوژداری بلیمەت وڵامی داوەکە ئەزنەشتەرگەرم نەک پزیشک وئێوە کەپزیشکن دەبێ بزانن بۆ رەنگی سوورهەڵگەراوە،وچارەی بکەن.

بەڵام لەونەخۆشخانەداهیچ پزیشکێک نەشیاپەی بەگۆرانی رەنگی "کاریل"ببا،چوونکە سوورایی روخسارولەشی لەگەڵ نیشانەکانی هیچ نەخۆشیەک یەکی نەدەگرتەوە.

هەندێ نەخۆشی هەن کەئەگەرهاتوو مرۆڤ تووشیان بووروخسار ولەشیان سوورهەڵدەگەرێ،بەڵام نەخۆشیەکان نیشانەگەلی تریان هەیە ولەپلەی یەکەمدا تاولەرزیەیدا دەبێ، جاسوورایی روخسار و لەش لەونەخۆشیانەدابەنیشانەکانی لاوەکی حەساودەکرێن.کارێل تای لێنەبوو وهیچ روکەشی لاوەکی تریشی لێ ندەبینرا، تەنانەت بەئیشتیا دەیخوارد وبەباشی دەنووست.

چەند رۆژ دواتر چەند کەس لەدۆستانی سیاسی کارێل ،بەدیاری کردنی کاتی پێشوو هاتنەنەخۆشخانەهەتا بەسەلامەتی دەرچوون

لەعەمەل وبێوەی بوونەوەی پیرۆزبایی لێبکەن،هێشتاش کارێل نەیدەزانی سوور هەڵگەراوە. بەڵام چوونکە رەنگ بوو کەئاشناکانی کارێل لەپاش دیتنی لەبەر سوورهەڵگەرانەکەی سەرسورماو بن یا بترسێن ،بەرلە بردنەژووریان پێیان گوتن لەسوورهەڵگەرانی دۆستەکەتان مات و وڕ مەمێنن چوونکە ئەم رەنگ گۆرانە لە شوێنە دانانەکانی دوای عەمەل کردنی گورچیلەیەو پاش چەندرۆژان وەلادەچێ.

کارێل بەکەیف خۆشیەوە پێشوازی لە هاوبرواکانی کردویەکێ لەوان بۆ ئەوەی قسەیەکی خۆش بکا گوتی رێبەری خۆشەویست و گەورەمان هەمیشەلەناخەوە سووربوو ئێستادەبینین کە لەرواڵە تیش دا هەر سوورە.

کارێل کە لەسوور هەڵگەرانی خۆی ئاگادار نەبوو مانای قسەی کابرا تێنەگەیشت وژنێکی پەرستار کەبەبیانووی خزمەتی میوانان لەژوورەکە بوو،بۆئەوەی نەخۆش تێکنەچێ باری باسەکەی گۆری ونەیهێشت نەخۆش سەبارەت بەو تیزەلە دۆستەکانی داوای تێبینی پتر بکا.کەچی لەدوای رۆیشتنی ئەوان،کارێل زیت بوو، لەجێی خۆ هەستا و چوونکە لەو ژوورە دا ئاوێنە نەبوو نەخۆش لە پەنجەرە نزیک بووەو پەردەی سەرشووشەکانی لاداولە شوو شە کاندالەخۆی روانی. چوونکە شووشە ئاساییەکانی پەنجەرە تەنیا لەسەتا .چواری نوور دەداتەوە،دیتی کەرەنگی سیمای گۆراوە، بە جەختەوەئاوێنەی داواکردوبەدیتنی رەنگی روخساری،کەبەتەواوی سوور هەڵگەراوەبەتوندی شڵەژا.

لەسەدەی نۆزدەهەمی زایینی دا هەندێ زانای واهەڵکەوتن کەبە کەشفەزانستیەکانیان لەبەشی پزیشکی داخزمەتی بەرچاویان بە رەگەزی مرۆڤ کرد.

یەکێ لەوانە"سیمڵ وێس"ی مەجارستانی بوو ویەکی تر"توماس ئادیسۆن"ی پزیشکی ئینگلیسی،کەلەساڵی ١٨٦٠ لەتەمەنی ٦٧ ساڵەیی دا ماڵاوایی لەژیان کرد.

دوکتۆر "ئیگناز فولوپ سیمڵ ویس"ی مەجارستانی کەسێکە توانی هۆی نەخۆشی تای (نفاسی)دوای منداڵ بوون، لەژنان دا بدۆزیتەوە.

لەهەر سووچێکی ئەم جیهانە دا،هەرژنێکی دووگیان کەدەزانێ منداڵی دەبێ،ئەشێ بەرێزەوە ناوی ئەم پزیشکە مەجاریەی لەیاد بێ کەلەتەمەنی ٤٧ساڵەیی،لەساڵی١٨٦٥ زایینی ماڵاوایی لەژیان کرد،چوونکە ئەوبوو کەژنە زاوەکانی لەمردن بە هۆی تای (نفاسی) یەوە رزگار کرد.

تای (نفاسی)ئەو تا ولەرزەیەکەسەرتاپای لەش سوور هەڵدەگێرێ، باپیرەوداپیرەکانی ئێمەئەم نەخۆشیەیان بە"ئاڵ بردنەوە"ناو دەبرد، ئاڵ لێدان، یانی سوور داگیرسان وپێیان وابوو "ئاڵ" ونی و دێوێکە جەرگی ژنی زاو دەخوا،هەرگیز پیاو تووشی ئەم نەخۆشیە نابێ و تەنیا ژن لەپاش منداڵ بوون دەیگرن،یانی دەیانگرت چوونکە ئەمرۆ ئیتر هیچ ژنێک لەپاش منداڵ بوون تووشی ئەم نەخۆشیە،کەسەر تاپای لەشی ژنە زاوەکە سوور هەڵدەگێرێ، نابێ.

لەورۆژەیەوە کەدوکتۆر سیمڵ ویس هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشی تای (نفاسی)دۆزیەوە هەتائەمرۆ،سەتان میلیۆن ژن لەسەرانسەری

جیهاندا،لەدرێژەدانی ژیانیان بەرمنەتی ئەوپزیشکەمرۆڤ دۆستەن، ئەوبوو کەهەڵیهێنا هۆی سەرهەڵدانی ئەم نەخۆشیە کەلەدرێژایی هەزاران ساڵ،سەتان میلیۆن ژنی لەپاش منداڵ لێجودا بوونەوە بە رەو گۆرستان رەوانە کردووە چتێ نیە لەدەستە پیسەکانی مامانە کان بەو لاوە زیاترکە زارۆڵەکەی پێدەگرێ و دەستەکانی دەگەنە ، عەیبەگوتەنی،جیهازی مێینەیی ژنەزاوەکە،ئەگەر ژنە مامانەکە نیتۆکی دەخۆ بکاو دەستەکانی پاک بشواو میکرۆبەکانی لێبکوژێ، ئیدی ژنە زاوەکە تووشی ئەم نەخۆشیە کوشندەیە نابێ.

مەبەستی ئێمە لەو تێبینیەی سەروو ئەمەیە ؛ کەبێژین لە نێو نەخۆشیە ناسراوەکانی رەگەزی مرۆڤ دا هیچ نەخۆشیەک نیە یا (نەبووە)کە گشت لەش سوور هەڵگێرێ مەگەر نەخۆشی تای نفاسی،کەئەویش تەنیا تووشی ژنان دێ لەپاش منداڵ بوونیان.

نەخۆشی دەدیش هەن کە پاش ئەوەی ئینسان دوچاریان بوو ، تەنیا بەشێک لەلەش سوور هەڵدەگەرێ،وەک نەخۆشی سوورێژە (تایبەت بە زارویان)کە پەڵەی رەنگ سوور لەسەرلەش بەدی دێنێ ونەخۆشی گەرمژە (تایبەتی منالان)کەپەڵەی دەسووریاو وبەربلاو تر لەلەش دا دێنێتەدی ونەخۆشی "بای سوور" کە رەنگی روخسارو گەردن و هەندێ جاریش سینگ سووردادەگیرسێنێ.

پزیشکانی نەخۆشخانەی شاریتی دەیانزانی کە سوورایی لەشی کارێل کەهەموو جەستەی داگرتووە،بەهۆی نەخۆشی بای سوور نیە چوونکەبای سوورنۆبەتێ بەدی دێنێ،ئەویش تایەکی بەسفتوسۆ و

نەخۆش ئوقرەی لێدەبڕێ،لەحاڵێک داکارێل تای لێنەبوو، هێور بوو و تەنانەت کەیف خۆشیش دەهاتە بەر چاو.

"ئادی سۆن"یش کەناوەکەی زیاتر بە"ئەدیسۆن"دەنووسن وبۆیە لەگەڵ داهێنەری ناوداری ئەلەکتریک لێک دەدرێن،لەچاخێک دا کە هیچ کام لە کەشف کراوەکانی زانستی ئەمرۆ لە جەلەی ژینەوەری و توسپی ناسی دا نەهاتبووە ئاراوە،پەی برد بە نمدانەوەی دوو لووی سورناڵ،کەگوتمان لەسەرووی دوو گورچیلە هەڵکەوتوون،و گوتی کەئەگەر"کۆرتیزۆن"کە شیلەی نمدانەوەی یەکێ لەدوو لووی سورناڵە وشک بێ رەنگی لەش سوورهەڵدەگەرێ وهەنگی تێکەڵ پێکەڵیەکانی دیکە لەلەشدا رودەدەن.

لەئەنسیکلۆپیدیای پزیشکی دانەخۆشی پەیدا بوو لەوشک بوونی نمدا نەوەی "کۆرتیزون"یان بەناوی دۆزەرەوەی نەخۆشیەکە ، "ئادی سۆن"ناودێر کردووە، بەڵام ئەو نەخۆشینە بەرادەیەک دەگمەنە کە کەسی تووش نابێ،مەگەرئەوەی بەهۆی روداوێکەوە وەک پێکادانی ئامێروماشێنەکانی گواستنەوە یان زامەکانی گۆرەپانی شەڕ،یەکێ لەدوولووەکانی سورناڵ کە کۆرتیزون دەداتەوە ببردرێ وکۆرتیزون ئیتر نەگاتە لەشی.هەربۆیە دوکتۆرەکان نەخۆشی ئای دی سۆن فەرامۆش دەکەن،چوونکە ئەغڵەب لەتەواوی دەورەی پزیشکی دا تەنانەت یەک جاریش دەگەڵ ئەو نەخۆشیە روبەرو نابن.

رەنگە لەپەنجا دوکتۆری کەلەنەخۆشخانەیەکی گەورە داکاردەکەن، هەرلەورۆژەیەوەکە بۆخوێندن پێ دەنێنە زانکۆی پزیشکی تا ئەو کاتەی کەبۆ هەمیشە واز لەکاری دوکتۆرایەتی دێنن تەنانەت تاقە

جارێکیش چاویان بە نەخۆشێک نەکەوتبێ کەبەهۆی برانی" کۆر تیزون "ەوە تووشی نەخۆشی سوور هەڵگەرانی سەرتاپای لەش بووبێ. هەربۆیە نابێ لەسەرسامی پزیشکەکانی نەخۆشخانەی بەرلینی رۆژهەڵات لەبەرانبەر نەخۆشی کارێل دا کاسی دامانگرێ کەلەبۆچی هیچ کام تێنەگەیشتن کەئەو نەخۆشیە بەهۆی ئادی سۆن یان برانی نمدانەوەی کۆرتیزونە .

بەهەرحاڵ ئەورۆژە گەیشتێ کەکارێل دەبوو لەنەخۆشخانە دەرچێ چوونکە لەمەرگورچیلەکانیەوە، بەتەواوی دەرمان کرابوو،کەچی ئەو نەرۆیی وگوتی من بەم رەنگوروە ناشێم لەنێو خێزان وخەڵک دا بژیم و دەبێ بمهێننەوە سەر رەنگی خۆم،ناچار لەنەخۆشحانە دا هێشتیانەوە هەتا بەڵکو عیلاجی بکەن.

رۆژێک ژنەپەرستارەکە دوای ئەوەی هاتەژووری کارێل دیتی کەلە سوورایی رووی کارێل کەم بوتەوە وپێی گوت رەنگی روخساری ئێوە ئەمرۆ وەک رۆژەکانی رابردوو سوور نیە وئەمە نیشانەی وەیە کە بەزوویی چارەت دەکرێ. بەلام لەرۆژەکانی دوایی دا دەرکەوت کە کەمبوونەوەی سوورایی کارێل هۆی سەرهەڵدانی دیاردەیەکی تازەو سەمەرەیە کە رەش هەڵ گەرانی رەنگورویەتی.

بەرلەوەی رەنگی سیما ولەشی کارێل رەش هەڵگەرێ،دوکتۆرە کانی نەخۆشخانە سەرەنجام بەهۆی گەران ولاپەرەهەڵدانەوەی ئەنسکلۆپیدیاکانی پزیشکی وژیناوەری تێگەیشتبوون کە سوور هەڵگەرانی بیچم ولەشی کارێل بەهۆی برانی تەرایی کۆرتیزونە. بەلام

نـەدەشـیان بـزانن ئـەوپیـاوە لـەبـۆ رەش هـەڵگـەرا، ئـاخر "ئـا دی سۆن"یش ئەم مەبەستەی پێش بینی نەکردبوو.

ئەوان ئاگاداریان هەبووکەلەهێندێک لەنەخۆشیان،رەنگە چروچاوی نەخۆش" کەوە" بێ.بەڵام لەنێو هەزاران نەخۆشی داکە نیشانەکانی ئەوان لەکتێبگەلی پزیشکی داتۆمارکراون تـەنانـەت یـەک نـەخۆشـی نەبوو کەرەنگـی دەموچـاو ولـەشـی مـرۆڤ رەش هـەڵگێـرێ. لـەدوای ماوەیەک کارێل وا رەش داگریسا کەبێجگەلە سپیەتی نینۆک وچاو لە گشت جەستەی دا ،خاڵێکی کەرەش نەبووبێ،پەیدا نەدەبوو.

دوکتـۆرەکـانی نـەخۆشـخانە لـەبـەرانبـەر ئـەو دیـاردە سـەمـەرەیـەی پزیشکی وژیناوەری سەرسورێنەردا،نەخۆشەکەیـان فـەرامـۆش کـرد و لەیادیان نەماکە ئەرکی یەکەمی ئـەوان ئـەوەیـە نـەخـۆش چارەسـەر بکەن.ئەوان بەزاراوەی پزیشکی"سین دروم" ێکیـان لـەبـەردەم بووکـە لەزەمانی بوقراتی پزیشکی یونانی را تائەوی رۆژێ هیچ دوکتـۆر ێـک نەیدیبوو.

ئەو دیاردە عەجیب وسەیرە، لەبۆ یەکێ لەیاریدەرەکانی زائربرۆخ کـە گوتمان پێشینەی" نازی" هەبوو، ئەندیشەیـەکـی هێنـادی کـەلـەگـەڵ بەشێک لەدیمانەی رەگەزایەتی نازیەکان پێچەوانە دەکەوت.

لەدەورەیەک داکـەهیتلـەر لـەپـاش تێکشکاندنی فـەرانـسە لـە سـاڵی ١٩٤٠گەیشتە ئەوپەری گـەورەیـی خـۆی وئـەندیـشەی فـەرمـانرەوایـی بەسەر هەموو جیهاندا لەمێشکی مـەزنـەکـانی نـازی دا دروسـت بـوو ولەهێلانەهەڵۆ داهەزار کەسی داخوازی نازی خۆیان تەیـار دەکـرد تـا لەداهاتوودا لەلایـەن دەولـەتـی ئاڵمانـەوە بـەسـەر سـەرانـسەری دنیـا

داحوکمرانی بکەن، ئەم بیرۆکەیە گوورا کە رەچەڵەکی ئاریایی ـ کە نموونەی هەرەدیاری رەگەزی ئاریایی ئاڵمانە؛ بە بەژن وبالآی بەرز و سیمای هێلکەیی،چاوی دەمەیلەوکەوەیی وقـژی زێـرین یاخۆرمـایی ــ لەدنیایەکی دیکەوە هاتبووە سەر گوی زەوی.

نازیەکانی رەگەزپەرستی خیاڵپەروەر،بە بەرجەستەکردنـی ئـەو بیـرۆ کەیە بەگومانی خۆیان رەچەڵەکی ئارياييان دەکـردە خـاوەنـی پلـە و پایـەی خـودایی، بـەو مانایـەی کـە رەگـەزی ئاریـایی رەچـەڵـەکێکـی ئاسمانیە ورەگەزەکانی ترلە رەچەڵەکی زەوینـین و ئارياييـەکـان لـە نوور ساز کراون ورەگەزەکانی دیکە لە خاک.

لەو کات وساتانەدا لـەبـەرچـاوی یاریـدەری زانربـرۆخ پیـاوێکی سـپی پێست گۆرابوو بەرەش پێست،ئاخۆ ئەم گۆرانە هـەسـت پێکـراو ولـە شک بەدەرە نیشانی نەدەدا کەرەش پێستەکانیش لەهەوەڵـەوە سـپی بوون ودوایە رەش هەڵگەران ؟ دوکتۆرەکان کە دیتیان پیـاویَ سـپی پێست نزیکەی بەتەواوی بوو بەرەش پێـست،زیت بـوون وبـە خۆیـان گوت کەرەنگەپەردەلەسەر رازی پەیدا بوونی رەگـەزی رەشـی مرۆیـی هەڵدرابێتەوە.

لەو رۆژەیەوە کە ئەفسانەگەلی هـەڵقـولاو لـەخـەیاڵپـەروەری مـرۆڤ، جێگەی خۆی دا بە توێژینەوەی زانستی تائەویَ رۆژیَ زانایان نـەیـان تـوانی بێـژن کـەلـەسـەر گـۆی زەوی رەگـەزی رەش چلـۆن هاتـە دی.ئەوان تێدەگـەیشتن کـەتـەنیـا تێچـەقینـی خـۆر رەگـەزی رەشـی نەهێناوەتەرو چوونکە ئەورەگەزە تەنیا لەبەر رەنگـی پێـست لـەگـەڵ

تۆرەمەکانی تر لێک جیانیەبەڵکو لەباری شکڵ وقەوارەی هەندێ لەئەندامەکانی لەشیش دەگەڵ رەچەڵەکی تر دا توفیری هەیە.

ئاخۆ رەگەزی زەنگی لەم رووەوە هاتۆتە دی کەدە لەشی بەشێک لەسپی پێستان دا نمدانەوەی کۆرتیزون کەم بوو ولەئاکامدا رەنگی پێستیان رەش هەڵگەرا؟ ئەگەر وایە بۆچی قژی رەش پێستان قرژن وبەکرووزەیە لەحاڵێک دا کەمووی سپی پێستان لوول نیە،ئەدی بۆ رەش پێستان خێوی لوتی پانن وشکڵی کەپوی سپی پێستان قەڵەمی یە؟

داخوا ئەم جیاوازیانە شوێنەوارگەلی گۆرانی رەنگی پێستە ولەپاش ئەوەی کە تاقمێک لەسپی پێستان بوونە رەش پێست، لەسەرەخۆ وبەدرێژایی هەزاران ساڵ،روکەشکاریەکانیان تێدابەدی هات وبرێک لەئەندامەکانی لەشی ئەوان لەگەڵ باپیرە گەورەکانی سپی پۆس یان فەرقی کرد؟.

ئەگەر رەش هەڵگەرانی تاقمێک لەسپی پۆسەکان لەوەرا سەری هەڵدا کەلەواندا تەرەزنی کۆرتیزون لەکمێی دا لەبەرچی رەگەزی رەش پێست تەنیا لەناوچەی گەرمەسێردا ،کەخۆر راست دەوێ دەچەقێ، دەژیا ودەژی وئەو ناوچە گەرمەسێرەش بەربەستە بە وشکانی ئەفریقا ولەدەرەوەی ئەفریقا رەش پێست ناژی ولەهەر کوێ رەش پۆسێ ببیندرێ،بۆنموونە لەئەمریکادا،ئەو زەنگیانەن کە خۆیان یا باوباپیرانیان لەئەفریقاوە براونە ئەوێ. بەم پێودانە زێدە لە مەوزووعی کۆرتیزون (ئەگەر ئەوە هۆی سەرهەڵدانی رەگەزی رەش پێست بووبێ)و مەسەلەی ئەنگاوتنی خۆر،مەوزووعی ئیقلیمیش لە

پەیدابوونی رەگەزی رەشدا تەئسیر بەخش دەبێ، چوونکینێ خۆر لەتەواوی ناوچەکانی ئیستیوایی زەوی دا راست عەردی دەنگێوێ،بەلام رەگەزی رەش تەنیا لە ئەفریقا هاتوتە دی ولە ناوچە ئیستیوایی و گەرمەسێریەکانی دیکەدا نیژادی رەش هەر دیار نیە.

لە حالێکدا کەدوکتۆرەکانی نەخۆشخانە کارێلیان بە سەرنج گەلی زانستی وحیرفەییەوە خستبووە ژێر توێژینەوە،هیچ کامیان دەبیری ورەی ئەو پیاوەچارەرەشەدانەبوون،چوونکە سەمەرەیی ئەو دیاردە پزیشکیە بەرادەیەک هەست وهۆشی ئەوانی بەخۆوە خەریک کرد بوو،نەدەپرژانە سەرنەوەی بیر لەورەی نەخۆش بکەنەوە.

کارێلی مالکاول لەبەر پەژارەی فرە و ورەی دۆراوی،نەتەنیا دۆست گەلی سیاسی وهاوبیری دەخۆی وەخۆنەدەکردن، بەلکو لە وەخۆ کردنی خزم ونزیکانیش خۆی دەپاراست.دەیزانی ئەوان بە دیتنی تووشی ترس وهەراس دەبن،تەنیا دوکتۆرەکانی نەخۆشخانە و ژنە پەرستارەکان رێگەی ژووری نەخۆشیان پێدەدرا،ئەو چاوەدێرەی کە شەو ورۆژلەبەردەرکەی بوو نەیدەهێشت کەسی دیکەبچیتە ژوورە کەی. کارێل لەخەستەخانەداکە هەمیشە تەنیا بوو بەو هیوایە و چاوەنۆریەی کەپزیشکان بتوانن رەنگی بگۆرن،هەولی دەدا کەبە گوێگرتن لەرادیۆ وخوێندنەوەی کتێب ورۆژنامە وگۆڤارخۆ بخافلێنێ.

لەو سەروبەندە دا دوکتۆر ویلفرێدی یاریدەری زائربرۆخ کە رەش هەلگەرانی کارێل ،گەلێکی زیت وبەپرسیارکرد بوو، تەمای گرت سەبارەت بەئەو دیاردە پزیشکی یەی کەلەکارێل داسەری هەلداوە دەگەل زائربرۆخ بدوێ.

هەروەکی ئاماژەی پێکرا،ئەودیاردەی کەلەکارێل داسەری هەڵدا، لەپاش دیاردەکەی هینریخ گرێف لەبۆ پزیشکەکانی نەخۆشخانە ببوە سوژێت (مەوزوع)ێکی توێژینەوەوچارەسەرکردنی کارێل کەوتە ژێر سێبەری ئەو شیتەڵکاریە. نەوەکی کە پزیشکانی نەخۆشخانە نەیانەوێ چارەسەری کارێل بکەن بەڵکەخواستی ئەوان،بۆ تێگەیشتنی هۆی رەش هەڵگەرانی ئەو پیاوەی گەلێک زیاتر بوو لەوەی کە رەشاییەکەی لەنێو بچێ ورەنگە سپیەکەی وەگەرێ.

ئەمجار دەڵێین هۆی ئەوەی کە زائربرۆخ لەئیشەکەی هینریخ گرێف دادەسکاری لووی هیپۆفیزی کردوئەوکاتەش کەبەردەکانی گورچیلەی کارێلی دەردێنا دەستی دەیەکێ لەلووەکانی سورنالی وی (لووی کۆرتیکۆسورناڵ) وەردا،چ بوو ؟!.

ئەو نوژدارەبلیمەتە لەوەی زاناتر بوو کەکێردی نەشتەرگەریەکەی، لەروی بەسەرچوونەوە ،دە لوو یان ماسولکەیەک رۆچێ.

ماوەیەک بوو،بەشێک لە خانە (سلوول)کانی مێشکی زائربرۆخ وردەوردە تووشی راگیران (تـ×لب)دەبوو،ئەو ئاڵوگۆرە لەوبەشەی مێشکی نوژداری بلیمەت دا بەدی دەکرا کەخانەکانی یادەوەری لەوێدان. خانەکانی یادەوەری لەبەشێک لەمێشک دا،لەروبەری دەرەوەیی دا هەڵکەوتوون وئەو تەئسیرەی راگیرانی خانەکانی یادەوەری لە تاکەکان دادەیکا بەشێوەیەکی هەمەکی وێکدەچن وبەڵام لەروانگەی تاکی ولاوەکی لێک جیان.

تەئسیری هەمەکی گرژبوونی خانەکانی یادەوەری لەتاکەکاندا ئەمەیە کەیادەوەری بێ هێز دەبێ وشوێن دانانی هەندەکی و لابەلاش ئەمە

دەبێ كەسستی یادەوەری،لەهەركەس دا كە رو بەروی گرژی خانەكانی مێشك بووە لەگەڵ ئی دەدیكە جیاوازە.
گرژی وراگیرانی خانەكانی ناوەندی یادەوەری دەمێشك دا وەك ئاوسانی لووی پرۆستات لە نەخۆشینەكانی پیری یە،بەلام ئەوە شتێكی حەتمی نیەوهەندێ كەسی وا هەنە كەلە سەردەمی بە ساڵاچوویش دا نەتووشی راگیرانی خانەكانی یادەوەری دێن و نە تووشی ئاوسانی توسپی پرۆستات.( گەرەك ئەمەش بزانرێ كە ژن لە هەڵمسانی لووی پرۆستات پارێزراون،چوونكە پرۆستاتیان نیە،بەلام بێ هێز بوونی یادەوەری وپاشان لەدەست چوونی لە ژن وپیاگ دالەدەورانی پیری یەكسانە،یانی نەخۆشی زورهانی تایبەت بە پیاوان نیە.)
زائربرۆخ،نوژداری بلیمەت ومەزنیش، بەهۆی پیری تووشی بێ هێزی یادەوەری بوو،بە زوویی دەبینین كەئەم نەخۆشیە لە ویدا بەچ پەلەیەك چووە پێش و چ ئاكامگەلی پرلەكارەساتی لێكەوتەوە.
ئەگەر زائربرۆخ دەیزانی كەتووشی بێتوانایی یادەوەری بووە وبە هۆی ئەو نەقوستانیە، كێردە نوژداریەكەی لەكاتی نەشتەرگەری دا خۆ بۆجێی واداوێ كەنابێ بیانگاتێ،بێگومان ئیتردەستی نەدەكردە هیچ عەمەلێكی نەشتەرگەری. كەم هێزی یادەوەری بە هۆی سەر هەڵدانی راگیراوی خانەگەلی مێشك لەزائربرۆخ دا،بەوشكڵە خۆی دەنواند كەلەكاتی نەشتەرگەری داشوێنێكی دەبری كەنەدەبوو دەستی تێوەردا.

یەکەم دەوڵەتی کەکەوتە بیری ئەوەی کارمەندانی خانەنشین بکا پاش ئەوەی گەیشتنە تەمەنێکی دیاریکراو لەبەرئەوەی نەبوو کەبە هۆی پیریەوە بیستن یان بینایی خۆلەدەست دەدەن،بەڵکو لەبەر ئەوەی لێیان گەراکارنەکەن کەتێگەیشت هێندێک لەوان دوای وەی کە پێیان دە قۆناخی پیری نا تووشی سستی یادەوەری دەبن یان هەر بەئێجگاری یادەوەری ئەوان دەفەوتێ.

دەوڵەتەکان دەیانزانی هەندێ کەسی واهەن کە تەنانەت لە تەمەنی هەشتاساڵیش دا خاوەنی یادەوەری بەتوانان،بەلاّم بۆ ئەوەی هەڵاواردن لە ئارادانەبێ کارمەندانی باش یادەوەریشیان پاش گەیشتن بەو تەمەنە تایبەتە خانە نشین دەکرد،هەروەکی تۆلستۆی نوسەر وئەفسەری تزاری یان لەپەنجاوپێنج ساڵەیی دا خانەنشین کردلەحاڵێکدا کەئەو بیستوپێنج سال دواتریش ئەگەر ویستبای سواری هەسپ بێ بەبێ کەڵک وەرگرتن لە رکێفێ خۆی داویشە سەر خوانی زینی ویادەوەریشی ئەوەندە بەهێز بوو کە ئینجیلی لەبەر دەخوێندەوەو ناوی باپیرە گەورە کانی گشت رەسەن زادەکانی پلە یەک ودووی روسیای هەتا حەوت پشتان لەبیربوو و هەرکاتێکی لێیان ویستبا ناوەکانی بەدووی یەکدا ریز دەکرد.

بەهەرحاڵ دوکتۆر ویلفرێد داوای چاوپێکەوتنێکی تایبەتی لە زائر برۆخ کردبۆماڵێ،نوژداری مەزن وەختی پێدا ولەکاتی دیاری کراودا ویلفرێد هاتە ماڵی زائربرۆخ،بابەتی کارێلی هێناگۆرێ و بەم چەشنە ئاکامی دانیشتنەکەی گەیاندەوەیەک:کە ئایا زائر برۆخ رازی دەبێ کە چەند شیکاری لەبارەی ئەو دیاردەپزیشکی یەبکەن ؟.

زائربرۆخ پرسی: مەبەستت چیە ؟

یاریدەر هەڵیدایە؛ئەمەیەکەمجارەکەسێک بەهۆی برانی "کۆرتیزون" ە وە رەش هەڵگەڕێ وئێوە باشتر دەزانن کە برانی کۆرتیزون رەنگە مرۆڤ سوور هەڵگێرێ کەچی تائەمرۆ نەدیتراوە کەبرانی ئەم هۆرمونە کەسێک رەش بکا،ئێمە ئێستا لەزانستی پزیشکی دا لەبەرانبەر دیاردەیەکی تازەباوی بێ پێشینە دا هەڵکەوتووین و نازانین کەئاخۆئەم دیاردەیە لایەنی ناوازەو دەگمەنی هەیە یان کەسانی دیش بەهۆی برانی هۆرمونی کۆرتیزونەوە رەش دەبن،لە جەنابتان دەپرسم کەئایائێزن دەدەی هەندێ جەرباندن بکەین هەتا بزانین ئەم دیاردەیە لەکەسانی تریش دا سەرهەڵدەدا یان نا؟

پروفیسور زائربرۆخ چەند ساتێ بێدەنگ بوو،لەپاشان گوتی:

دەزانم کە جەنابت لەرابردوودا ئەندامی حیزبی نازی بوویە و ئاگادارم کە هەندێ لەدوکتۆرونوژدارانی نازی بێ مولاحەزە و ترس،خەڵکیان لە بۆئەزموونگەلی پزیشکی ونوژداری دەخستە ژێر جەرباندنەوە،بەڵام ئەزلەگەڵ پێشنیاری تۆ هاودەنگ نیم و ئەم مرۆڤکوژیەپەسندناکەم. یاریدەر بێ ئەوەی بشێ دەم لێک هەڵپچرێ،ماڵاوایی لەپرۆفیسور کردولەماڵی وەدەرکەوت،و مەوزووعی جەرباندن لەبارەی کەسانی ترباسی لێنەکرایەوە.

## هونەرمەند چی بەسەر هات!

لەحاڵێکا کەدوکتۆرەکان بۆسپی کردنەوەی کارێل، پەنایان دەبردە بەر هەمووئامرازێک وچیان بەدەستەوەنەدەهات ،وا دانراکە یەکێ لە

ژنەئارتیستەکان،کەلەرابردوودائەندامی هونەر پیشە کانی کۆمپانی فیلم هەڵگرتنەوەی "ئۆفا"ی ئاڵمانی بوو، بۆ لە بەین بردنی گواتری لەنەخۆشخانەی شاریتی دابخرێتەبەر نەشتەرگەری .

دامەزراوەی "ئۆفا"لەئاڵمانی هیتلەری ولەوشکانی ئوروپادا، یەکێ لەدامەزراوەکانی هەرەپێشکەوتووی تەیاری هەڵگرتنە وەی فیلم بوو و لەهەڵبژاردنی هونەرمەندانی سینەما داگەلێک ورد بینی دەکرد،ئەگەر بەویژدانەوە دادوەری بکرێ دەشێین بێژین کەبەر لە شەری دووهەمی جیهانی زوربەی ئەوفیلمانەی کە لە دامەزراوەی ئۆفا دا هەڵدەگیرانەوە،باش بوون.

کارگێرانی دامەزراوەی ئۆفا بەوردی سەرنجیان دەداوەی کە هونەر پیشەی فیلمەکانیان،تائەوجێگەی لەتوانادابوو لەباری قەدو بالاو بیچم وقەڵافەتەوە یەکسان بن لەگەڵ ئەوبایخگەلەی کەلەو کاتی دا بۆ رەگەزی رەسەنی ئاریایی لەلایەن دیمانە سازەکانی حیزبی نازیەوە، دیاری کرابوون .

نەوەی ئەمرۆ کەلەدەورەی فیلمەبەدەنگەکان دالەدایک بووە و هەڵیداوە لەپێداویستیەکانی فیلم گەلی بێدەنگ بەباشی ئاگادار نیە و نازانێ کەبەرلەشەری دووهەمی جیهانی وتا دەور وبەری ساڵی ۱۹۳۰ی زایینی فیلمەکان بێدەنگ بوون وهونەر پیشەکان لەسەر پەردەی سینەما قسەیان نەدەکرد وهەرچی ویستبایان بیڵین بە ئامازەوخۆ چەلوچۆم کردن دەریان دەبری و لەپاشان،لەمەودای نێوان سەحنەکان دا،نووسراوە دەهات.

هەربۆیە دامەزراوەی فیلم هەڵگرتنەوەی "ئۆفا" لەئاڵمان دا، پێی باشتر بووکەتەنانەت هەتا کەمێ پێش قەومانی شەری دووهەمی جیهانی فیلمی بێدەنگ بەرهەم بێنێ ولەو فیلمانە دا هونەر وجوانی هونەرپیشەکان گەلێک دەکەوتە بەر سەرنجی بەرێوەبەرانی فیلم هەڵگرتنەوەوهونەری هێندێ لەوهونەرپیشا نەی فیلمە بێدەنگەکان وەک ئەفسانەی بەسەر هات،بەشێوە یەکی واکەپاش نیوسەدەی کەلەساڵی١٩٣٠رادەبرێ ناوی برێ لەوان،تەنانەت لەم دەورانەی کەشەپۆلەکانی رادیۆ وتەلەڤیزیۆن وچاپەمەنی هەرجۆرە ناوبانگێک دوای چەندحەوتو بێ جلوەوکپ دەکا،بەتەواوی فەرامۆش نەکراوەوهەندێ جارناویان لەکەرەستە گەلی پێوەندیە گشتیەکانی دیداری وبیسیاری ورۆژنامە وگۆڤارە کاندا دێتە بەرگوێ یان دەبیندرێ.

ئەو ژنە هونەرپیشەیەی کەدەبوو بخرێتە ژێرنەشتەرگەری گواتر ناوی"لیلی هێڵم"ویەکێ لەهونەرپیشەکانی فیلم هەڵگرتنەوە ی ئۆفای ئاڵمان بوو،ئەگەرچی لەوکاتی دا دیمەنی تەرِی و ناسکی ساڵی١٩٣٠ی پێوەنەمابوو،بەلاّم چاوەشینەکانی، پرچ وقژە زێرینەکانی،دەمو چاوی هێلکەیی،بەژنی بەرز وبالاّی رێک ولەباری هێشتا دەریدەخست کەنموونەیەکە لەوبایەخانەی توند رۆیەکانی نازی لەبۆ رەگەزی ئاریایی دیاریانکردبوو.

لیلی هێڵم گوتبووی کە:دەبێ بەدەستی پرۆفیسور زائربرۆخ نەشتەرگەری بۆبکرێ وقبووڵ کردنی داخوازی نەخۆش،لەباری هەڵبژاردنی پزیشک یان نوژدار، بەشێکە لە دروشمەکانی پزیشکی

ولەکۆنەوە ئەم رایە بەدی هات کەنابێ نەخۆشی ناچار بکەن کەپزیشک یان نوژدارێکی تایبەتی بەسەردا بسە پێنرێ، چوو نکە تەئسیری نەباشی لەسەر ورەی دادەنێ وئەو تەئسیرە نالەبارەچارەسەری نەخۆش وەدرەنگ دەخا،یان هەر دەرمانکردن بێ کەڵک دەکا.لەمەڕ لیلی هێڵم داچوونکە چ کۆسپ بۆقبوولی داخوازیەکەی نەبوو،زائربرۆخ کەئەوی لەروی ناوبانگەوەدەناسی، رازی بوو عەمەلی بکا.

لەرۆژو کاتژمێری دیاریکراودا زائربرۆخ بەشێوەی ئاسایی لەپاش شوشتنی دەستەکانی ودەستەوانەی نوژداری دەدەست کردن هاتەژووری نەشتەرگەری،یاریدەران وژنەپەرستارەکانی کە دەبوو یارمەتی نوژدار بدەن لەژوورێ ئامادەبوون وبەرلەهاتنی زائربرۆخ نەخۆشیان حازر کردبوو.

عەمەلی نەشتەرگەری بۆهەڵگرتنی لووی گوواترلەباری وەدەس هێنانی ئاکامی باشەوەهاسانە،بەڵام لەباری تیکنیکیە وە عەمەلێکی وردودژوارە، لەولایەنەوە گوتمان"تیکنیک"کەزاراوەی خوودی پزیشکانەوزانایانی پزیشکی،نەشتەرگەریان کردووە بە دووبەش وئەوبەشەی کەناسینی دانەبەدانەی شوێنی نوژداری بێ پێیان زانستە،ئەوکەسەی کەدەیەوێ رۆژێ لەرۆژان کێردی نوژداری بە دەستەوە بگرێ دەبێ گەلێک ساڵان کتێبەکانی پزیشکی موتالا بکاوگوێ بۆ دەرسی مامۆستا شل کاو هەرلەو ساڵانەدا هەموو رۆژێ،یا رۆژێکنارۆژێک،بچێتە تالاری توێکەری جەستەی مردووان هەڵەشکێوێ هەتانەوەی هەرێیسک ، ماسوولکە، سوورەدەمار،رەشە

دەمار،رەگ وکرۆژەیەک بناسێ وهەرلەوان سالاّندایەخوێندکاری زانکۆی پزیشکی،کەدەیە و ێ ببێ بە نوژدار وردە وردە دەگەڵ کەلاک وئەوبۆنانەی کەلە مەیتان دێ خوودەگرێ.

بەشێوەیەکی واکەبۆگەنی نێوزگی ئەو مردووەی کەسێ مانگە مردووە لەکۆنەلوتی داجیاوازی نیە لەگەڵ بەرامەی عەترە گران بایەکان وهەرلەوسالاّنە دایەکەوەختێ لەنیوەشەوێکی تاریک دا دەچێتە نێوژووری تالاری توێگەری کە تژی تەرمی لەت لەت کراوە هەست بەترس وپەروا ناکا.

ئەوبۆیە لەنیوەشەوی تاریکدا دەچێتەنێوتالاری توێگەری هەتابە بێ روشن کردنی چراو تەنیابەیارمەتی وەرگرتن لەهێزی دەس لێدان (قوەلامسە)،ماسولکەکانی تەرمێکی کوت کوت کراولێک بکاتەوە.چوونکە ماسولکەگەلی لەش لەباری تەنراویەوەتوفیریان هەس،ئەم مەبەستەی تەنانەت کەسانی ناشارەزالەپزیشکی و نوژداریش دەیزانن.خاتوونێکی کابان کەبۆکرینی گۆشت دەچێتە بازار ئەزانێ کەشێوەتەنرانی ماسولکەی دڵ لەگەڵ ماسولکەی سینگ یا ڕان جیاوازە.نوژدارێک بەرلەوەی کێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێ ئەشێ هەمووجورە هێسک وماسولکەیەکی کەلەلەشی مرۆڤ داهەیە،لەتاریکایی داوتەنیابەهێزی دەست لێ خشاندن،بناسێ وهەرلەوتاریکیەدا تێبگاکە،وەک دەڵێن ؛ خابی قاڵی بەرەوکام لاشکاوە،چوونکی ئەم ئاگاداریەلەداهاتوو داو لە کاتی دەکارکردنی کێردی نەشتەرگەری لەبۆی بەکەڵک دێ.

ئەوەی خوێندکاری زانکۆی پزیشکی،هەتا پێش تەواو بوونی خوولی خوێندن وئەزموون،لەکلاسی دەرس ولەتالاری توێکەری دا فێری دەبێ زانستە.

بەڵام ئەورۆژەی کەکێردی نوژداری بەدەستەوەگرت وهەڵی سوراند کارەکەی دەبێتە"تیکنیک"،هەنگی ئەو وەک هونەرمەند ێکی کار جوانی"منەبەت کار"ەکەچەکوچ وقەڵەم تاودەداتێ لە سەر چێو و دارخەریک دەبێ تاشکلێکی بەشێوەی نێوکۆڵ و هەڵتۆقیو بێنیتەدی.یان وەک نیگارکێشێکەکەقەڵەم وفڵچەکەی بەسەربوومی تابلۆ دادێنی تاشکلێ بکێشیتەوە.

رون وئاشکرایە،ئەوکاتەی نوژدارکێردەکەی دێنیتە جووڵە لە زنیاری وئەزموونەکانی خۆی کەپێشترفێریان بووە،یارمەتی دەخوازێ،و نیگارکێشیش وەختێ فڵچەکەی دەبزێوێ، لەو شتەی کەلەرابردو دافێری بووەوئەزمووني وەسەریەک ناوە، کەڵک وەردەگرێ،بەلام ئەوان،هەرتک،خەریکی یەک هونەرن، نەیەک زانست. نەشتەرگەری بۆهەڵگرتنی لووی"گواتر"لەم رووەرادژوارەکەلووی گواتر، (دەزانین کەئاوسانی لووی تیروئیدە)لە پێشەوەی گەردن پەیدادەبێ وئەوێ شوێنێکەکەهەندێ لە هەو داکانی زیندوویی لەش وەک رەگەکان وشادەماری خوێن بەوێدا تێدەپەرن،خافڵ بوونێکی نوژداررەنگەببێتەهۆی هەڵبرانی یەکێ لەوهەودایانەی زیندوویی،لەوحاڵەداگیانی نەخۆش دەکەوێتە مەترسی یان ئەوەکەبەشێکی لەشی بۆهەمیشەلەکاردەکەوێ.

بەڵام زائیرۆخ نوژدارێک نەبووکەشتێ فەرامۆش بکاو بەهەڵە دەمار یان رەگێک ببرێ،یاریدەرەکانی دەیاندی کە دەستەکانی پرۆفیسوروەک هەمیشەبەلەزدەجوولێ ولەبەرتوندوتۆڵی ئاخێز ی دەستەکانی ئەونوژدارەبلیمەتە،نەیاندی کەئەولەکۆتایی عەمەلی گواتری ژنەکەدا،رەگی لووەکانی"پاراتیرۆئید"یشی هەڵبریون.

هەڵبرینی رەگی ئەولووانە لەلایەن زائیربرۆخ رالەبەر هەڵە باشی نەبوو،بەڵکو هەروەکی گوتمان لەساتی هەرەکۆتایی نەشتەرگەر یەکەدائەوەخۆی کوتانێو مێشکی نوژداری بلیمەت کە پێویستە رەگی لووەکانی پاراتیرۆئیدببردرێن وئەم کارە بە قازانجی نەخۆشە.

لووەکانی"پاراتیرۆئید" چوارن،لەگەردنی مرۆڤ ولەپشت لووی تیرۆئید هەڵکەوتوون،چوونکەرەنگی ئەم چوارلووە وەک رەنگی ماسولکەکانی دەوروبەرن،بێجگەلەچاوەتیژەکانی نەشتەر گەران، کەسێ ناتوانێ ئەوچوارلووەببینێ.بەم زووانەئێژین کەئەم چوارە، کەبەشێکن لەلووەکانی ئاندوکرین (لووەدەروونیەکان)ی لەش لە ئەرکگەلی کۆئەندامی ئێمە دا چ شوێنێکیان هەیە.

برینی خاتوو لیلی هێلم یان پێچاو ئەویان لەژووری عەمەل را راگوێست بۆژووری ئیسراحەت،هەتاچاک بێتەوە.دوای چەندرۆژ ئەوژنە چاک بوو،بەپێی نەریتی پاش چاک بوونەوە گوتیان بائەو ژنەچەندرۆژی تریش لەنەخۆشخانەبمێنێتەوەتادەورەی بناوبێری تێپەرێنێ جابچێتەوە ماڵێ.

بەڵام لەورۆژانەی کە لیلی هێلم دەورەی بناوبێری تێدەپەراند لەنەخۆشخانە،بێنێوەبر لاوازدەبوو،هەربەیانیەکی کەژنەپەرستار

دەچووەژووری ئەونەخۆشە دەیدی کەلەدوێنێ لاوازتربووەو رۆژێک ژنەی پەرستارهاتە نێوژووری لیلی هێلم بەدیتنی سیمای واقی بردەوە چوونکەهەردوولای رومەتی،ماسولکەی گونای،وا داچورا بوون کەدەتگوت دووپشکە گۆشتی چکۆلەن بەقولاپی دوکانی قەسابی داکراون.

لاوازبوونی دەموچاو وداچورانی ماسولکەکانی،چاوەشینەکانی ئەوژنەی ئەوەندە بەزەق نیشان دەدا کەوا دەهاتەبەر زەین چاوە کان دەیانەوێ لەچالی چاودەرپەرن.زێدە لەلاوازی سەرسورێنەر، ئەوژنەوەختێ کەکراسەکەی دەکردەبەر هەستی دەکرد قۆلی کراسەکەی درێژ بووە ودەستەکانی کورت بوونەتەوە؛

قەلافەتی ئەوژنە کەرۆژێ نموونەی جوانی تورەمەی ئاریایی بوو و ستێرەی فیلمەکان،واتوایەوە کە بینەری دەخستە ترس ولەرز.

لەپاش دیتنی ئەم وەزعە،یاریدەرانی زائربرۆخ،ئەویان بردە ژووری لیلی هێلم وئەوژنەکەنوژداری مەزنی دەناسی بەگریانەوە سوێندی دا"ئەنژیکسیۆن"ێکی لێبدا هەتابیکوژێ،چوونکە ئیتر ناتوانێ بەم دیمەنەوەخۆی بەخەلک نیشان بداولەنێویاندابژێت.

زائربرۆخ لەگەل دیتنی ئەوژنەسەری سورما،بەلام پەرۆشی داینەگرت ولەدوای هاتنەدەری لەژووری نەخۆش لێیان پرسی: ئاخۆتێگەیشت کەنەخۆشی ئەوژنەی چ نەخۆشیەکە ؟ زائربرۆخ گوتی ئەم نەخۆشیە لەوەیرا سەری هەلداوەکەنمدانەوەی لووە کانی پاراتیرۆئیدی تەراییان لێبراوە.

چوار لووی پاراتیرۆئید هورمونێک دەدەنەوەکەناوی "پاراتیرین" یان "پاراتورمۆن"ە وئەوهۆرمونە لەلەشی مرۆڤ دا دەبێتەهۆ کەهەر دوو مادەی "کلسیۆم" و "فۆسفۆر" بگەنە زووقانەکان،ئەم دوو مایە کەرەستەی سەرەکی ئێسکەکانی لەشن وئەگەرپێیان نەگەن هێسک گەلی مرۆڤ هێواش هێواش بەرەو توانەوە دەرۆن و لە درێژایی وپانایی وئەستوورابیان کەم دەبێتەوە،چوونکە هێسک ڕاگری ماسولکەیە هەرکەروی کردەلەنێوچوون دەبێتەهۆی بەرەو توانەوە رویشتنی ماسولکەگەلی لەش.

بێجگەلەوەش،بەشێک لەشتە حەیاتیەکانی لەشی ئێمەلەلایەن زووقانەکان وبەتایبەت لەمێشکی هێسکەکان (نخاع)دا دروست دەبێ وپاش ئەوەی کەئێسک روی لەتوانەوەکرد ئەوشتە ژیناوەر یانەی کەدەبێ بگەنەلەش وەبەرنایەن،موخی ئێسقان یەکێ لە کارگەکانی وەبەرهێنانی سەرەکی لەشی مرۆڤە.

یەکەم جارکەلیلی هێڵم قۆڵی کراسەکەی درێژهاتەبەرچاو پێی وانەبوو دەستی کۆتا بوتەوە. چوونکو دەیزانی کەسرۆڤ لەبەرچەندهۆیان رەنگەلاوازبێ بەڵام دەستی قوڵەنابنەوەولەدرێژایی بەژنی داناشکێ،ئەوپیرانەی کە بەنیسبەتی تافی لاوەتیان قوڵەخرەتردێنەبەرچاو لەبەرئەوەیە کە بربرەوپشتیان کور دەبێتەوە،کووری ،بەژن وبالآیان قوڵەترلەتافی لاوی وگەنجیەتی دەخاتەرو.

بەڵام پاش ئەوەی ڕۆژتێپەرین ئەوژنە تێگەیشت کەنەتەنیا دەمو چاوی ئاڵوگۆری بەسەرداهاتووە بەڵکو بێ شک درێژایی دەست و قاچەکانی لەکورتی دەدا.

ژنەی چارەرەش،کە چروچاوی ترسێنەری خۆی دەدی وتێ دەگەیشت کەلەدرێژایی دەست وقاچی کەم بوتەوە،تووشی جۆرێ شێتی بووکە لەحاڵی ئاسایی داوێنەی گەلێک کەمە و کەچی لەحاڵی خەوئوچکە وخیاڵ دا وێنەی زورجار دێتە دی، بەو شێوەی کەمرۆڤ خۆی لەقالب ولەشێکی تردادەبینێ و لەوحاڵە داکەلەهەبوونی خۆی هیچ گومان وشکی نیە باوەری وایە کەلە باری قەڵافەت وبیچمەوە کەسێکی ترە وبەژن وباڵا ورووخساری پێشووی خۆی،وەک ئەوەی لەخەون وخەیاڵ دادیبێ و واقعیەتی فەنابووبێ،دێتە بەر زەین.

ئەم جورە شێتیەی برانی نمدانەوەی لووەکانی پاراتیرۆئید لە مێشکدا، کەناوەندی هەستەکان وئاوەزەکانە،شوێن دادەنێ و ئەوکەسەی کەلووەکانی پاراتیرۆئیدی هەڵبرابێ ئەگەر تروشی شێتیش نەبێ خێوی ئاقڵ ودەرکی کەسێکی ئاسایی نیەچوو نکە ئیدی" فۆسفور" کەیەکێ لەمادەکانی زورپێویستی خانەکانی مێشکە نایانگاتێ وفۆسفوریش تەنیا لەبۆ کامڵ بوونی خانەکان نیە بەڵکو دوای دروست بوون وکامڵ بوونی ئەوخانانەش هەتائەو کاتەی کەمرۆڤ زیندووە دەبێ فۆسفور بگاتە خانەگەلی مێشک، هەتائەوان بتوانن ئەرکی خۆ بەباشی بەجێ بگەیەنن،هەڵبرانی نمدانەوەی لووەکانی پاراتیرۆئید رێگرەلەوەی کەفۆسفور بگاتە هەرنوختەیەکی لەش کەپێی ئاتاجە.

ژنەی هونەرمەند خۆراکیشی پێ نەدەخورا وئیشتیای تێک جوو بوو.
ئەگەرچی قەلاچوی بەرلین لەلایەن دەولەتی سۆڤیەتەوەدڕێژەی هەبوو بەلام هەروەکی گوتمان خۆراکی جیرەیی بۆبەرلینی رۆژ هەلات دەهات وخەلکی شارونەخۆشانیش لەنەخۆشخانەبرسی نەدەمانەوە،لەنەخۆشخانەی شاریتی تەنیا بۆ سوتەمەنی دە تەنگاوی دابوون،لەبەرلینی رۆژهەلات بەپێچەوانەی رۆژئاوا نەیان دەهێشت خەلک بۆگەرم کردنی مالەکانیان لەداریپارکەگشتی وشەقامەکان کەلک وەرگرن.
لەئالمانی رۆژهەلات داکەبەرلینی خۆرهەلات لەناوچەی ئیداری ژێردەسەلاتی سۆڤیەتیەکان هەلکەوتبوو،جورێک رەژووی بەردی بەناوی"لین بیت"،هەبوو وهەیەکەمیزانی زووخالە کەی،یانی مایەی قابیلی سووتانی ،کەمە،ئابەوحالەش لەدوو سەت سالی بەرلەو مێژووەش خەلکی ئالمان بۆتواندنەوەی کانزاکان وگەرم کردنی مالەکانیان لەزمسانا کەلکیان لە"لین بیت"وەردەگرت.
رەژووی بەرد؛هەروەک لەناوەکەی دەردەکەوێ بەردێکەدەسوو تێ ولەهێدێک جۆری دامایەی سووتەنی فرەو لەهەندێک جوری داکەمە.
لەجۆرەباشەکەی رەژووی بەردا مایەی سووتەنی هەتا ٩٠%یە ولەجۆری نەباشەکەی داهەتا ٦٠% دادەکشێ.لین بیت ،،ەگەل جیاوازی کانەکانی لە ٦٠% وە هەتا ٧٠% ی مایەی سووتنێ کە "کاربۆن"ە تێدایە.
بەوحالەی کەلەئالمانی رۆژهەلات دا"لینیێت"ێکی زۆرهەبوو، سۆڤیەتیەکانیش بۆگەیشتنی بەبەرلینی خۆرهەلات چتەگەرەیان

نەدەخستەبەر،بەرادەی پێویست لەوخەڵووزە نەدەگەیشتەئەوێ. چوونکە بۆمبارانی دەوڵەتەکانی ئەمریکا وبریتانیا لەشەری دوو هەمی جیهانی دا بەشێکی لەهێڵی رێگای ئاسنی ئاڵمانی رۆژ هەلاتی لەبەین بردبوو وهێشتانەیانتوانی بوو گشت هێڵەکان نوژەن بکەنەوە.لەبەر ئەم وەزعە لەنەخۆشخانەی شاریتی دا"ترموستات"یانی راگرتنی رادەی گەرم کردنی ژوورەکانیان، لەسەر نمرەی ١٩دانابوو.

هەندێ لەنەخۆشەکان لەگەرمای ژوورەکان رازی بوون بەلام برێ لەوان گازندەیان دەکرد کەهەوای هۆدەکەیان ساردە،لەهەموان پترلیلی هێلم گلەیی هەبوو،پزیشکانیش دەیانزانی هەقیەتی جوونکە لەشی ژنەی سیابەخت گەرمای ئاسای مرۆڤی،کە ٣٧ پلەیە،نەبوو.لەنەخۆشیەکانی برانی نمدانەوەی لووگەلی پاراتیرۆ ئید ئەمەیکە گەرمایی لەش کەمدەبێتەوە،ئەوکەسەی بەهەرهۆ یەک گەرمای لەشی کەم دەبێتەوە لەوەرزی زستان دالەدەست سەرمایەدەرەنج دایە،وهەرکەس کەجارێک تووشی هەڵلەرزین، کەسەرەتای هێندێک لەنۆبەتیەکان وبەتایبەت تای نەخۆشی زەردوویی وتای مالاریا وتاولەرزی هەندێ لەجۆرەکانی هەلامەت و سەرما بوون،بێ، دەزانێ کەدابەزینی گەرمای لەش،چلۆن دە بێتەهۆی دەردورەنج. ئەوانەی کەتووشی لەرزی ناوبراو،کەسەرە تای هێندێک لەتاونۆبەتیەکانەدەبن،گەرمی لەشیان،لەماوەیەکی کورتدا،تەنیابەقەد نیوهەتایەک پلەدادەبەزێ بەوحاڵەش ئەگەر لە وەرزی هاوینیش دا تووشی لەرزبێن ناتوانن بەچەند لێفەو پەتو

ساردی لەش لـەنێوبـەرن وخۆگـەرم دابێنن،هـەتائـەوساتەی نۆبـەتـێ دایانـدەگـرێ ولـەپاشـان چـەقوچـۆ دەرەوێ.لـەم نموونـەیـەرا دەکـرێ تێبگەین کەئـەوکـەسانەی گـەرمـای لـەشیان لـەبـەر هـەرهۆیـەک بـە شـێوەی هـەمیـشەیـی دادەبـەزێ،لـەوەرزی زسـتان دا چـەنـد لـەبـەر سەرماوسەخڵەتی دەرەنج وزەحمەت دان،ئاخر لەلەشـی ئـەوان دائـەو دەزگـاوردەی دەلـەشـی کـەسـانی ئاسـایی دا،لـەنێـوان تینـی لـەش وگەرمای دەوروبەردا لەزستان و وەرزەکانی دیکەدا هاو سەنگی بەدی دێنێ،ناتوانێ بەدروستی کاربکا.

لیلی هێڵم هەمیشەلەبن چەندبەتانی دابوو،بـەوحاڵـەش گلـەی دەکـرد ودەیگوت لەسەرمان ناتوانێ بخەوێ.هەرکەس لـەپێشدا لیلـی هێڵمـی نـەدیبـوو ئـەگـەرچـاوی بـەسـەروسـیمای کـەوتبـا پێـی وا دەبـوو کەئەودەموچاوە هی یەکێ لەسەرەبراوەکانە کەهۆزەکـانی بـەنێوبانـگ بە"جیڤاروس"کەلەنێودڵی"ئامازوون"دادەژین،وشکیان کردوتەوە.

دابی ئەو هۆزانەئەمەیەکەپاشەوەی سـەری یـەکـێ لـەدژمنانیـان بـری ئێسکی کاسەسەر ورددەکەن ولەنێو گۆشت وپێـست دەری دەکێـشن وئێـسقانی گۆناوشـەویلاکـەش لـەنێـو ماسـولکان دەردێـنن وهـەنگـی ماسولکەکانی سەروروەتێ لەبەرانبەر ئاگردا رادەگـرن بـەبـێ ئـەوەی بسووتێ،وشکی دەکەنەوە.

لەپاش ئەوەی کەئیشک کرایەوە،دەموچاوکەگشت پێناسەکـانی خـۆی پاراستووە تەنیا نەختێـک گـەورەترلـەمستی دەسـتێک دەبـێ وئیـدی تـارە بۆگـەن نابێ،ئـەوی بـەمیچـی کـەپـری خـۆدا شـۆر دەکـەنـەوە وژمارەی سەرەبـراوەکـانی وشـک هـەڵاتـووی کـەبـەبن میچـی کـەپـرە

کەهەڵاوەسراون مایەی گەورەیی وئابرووەونیشانەی مەزنایەتی خێوی کەپرەکەیە.

دوکتۆرانی نەخۆشخانەلەخێرایی گۆڕانی قەڵافەت ولەش ولاری لیلی هێڵم زیاترلەلەرزین وتوانەوەوکۆتابوونەوەی دەست وقاچی سەرسورماودەبوون،پێش بینیان نەدەکردکەبرانی نمدانەوەی لوو گەلی پاراتیرۆئید لەماوەیەکی کورتدا ئەوئاڵووگۆرەی لەماسولکەو ئێسقانی کەسێک دا بەدی بێنێ.

"لیلی هێڵم" هەربەوچەشنەی کەوردیلەتر دەبووە خووخدەی کچۆڵەی دەبچوکی لێ وەدەردەکەوت ورۆژێک داوای لە خانمی پەرستار کردکەدەستێک مۆبلی (قەنەفە)گچکەی لەبۆبێنێ،لەو مۆبڵانەی کەکچۆڵەی دەچکۆڵە یاری پێدەکەن،ئەویش داخوازیەکەی گەیاندەبەرپرسانی نەخۆشخانە وئەوانیش دەستووری کرینی ئەومۆبڵەیان داچوونکەپێیان وابوو نەخۆشی چارەرەش دە خافڵێنێ وبرێک لەئازاری روحیەکەی کەم دەکاتەوە.

## بەستنی کۆنگرەیەک لەبۆ توێژینەوە

ئەم مەوزووعەو دوو روداوەسەیرەکەی دی کەلەنەخۆشخانە ی شاریتی داقەومابوون،پزیشکەکانی هێنایەسەرئەوەی لە بۆ پێدا چوونەوەی ئەوسێ روداوە کۆنگرەیەکی پزیشکی ببستن: ولەو کۆنگرەیەدابێجگەلەپزیشکانی نەخۆشخانەی شاریتی کۆمەڵێک لەدوکتۆرونەشتەرگەرانی ئاڵمانی رۆژهەڵاتیش تێیدا بەشداریان کرد.بەرلەوەی کۆنگرەدەست بکابەباسەکانی خۆی ،لەلایەن

پزیشکانی نەخۆشخانەی شاریتی راپۆرتێک سەبارەت بەسێ نەخۆشی ئەو خەستەخانەیەدرا بەکۆنگرە کەیەکێ لەوان بالآی گەلێک بەرز ببوو وئەوی دیکەیان هاتەسەرشکڵی رەش پێستێ وسێهەمیش ئەوەندەبەپەلەگچکەدەبێتەوە کەترسی ئەوەهەیە لەباری قەلافەت وبەژنەوە وەک بووکەڵەیەکی بەسەربێ.

لەراپۆرتەکە داگوتراکە نەخۆشی یەکەم نەشیاوە ئەوئاڵووگۆرە بەرچاوەی بەسەری داهاتووە لەخۆدا رابگرێ.یانی ئەندامەکانی لەشی،توانای تەحەمولی ئەو ئاڵووگۆرانەی نەبوو،مالاوایی لە ژیان کرد.بەلام نەخۆشی دووهەم وسێهەم زیندوون،بێ ئەوەی متمانەبکرێ بەوەی کەزیندووبمێننەوەوگریمان زیندووش مانەوە لەباری مرۆیی وکۆمەلایەتی،بەمردوو دەژمێردرێن.

لەراپۆرتی ناوبراودا هۆی هەرکام لەسێ نەخۆشیەکە باس کرابوو،گوتیان کەلەهەرسێکان دا بنوسی نەخۆشی بەشیوەی ئەرێنی ونەرێنی،نمدانەوەی لووە شاراوەکانە بەوجیاوازیەی کە لەبارەی یەکەمیەکەدا،زیادبوونی نمدانەوەی لووی رێژێن بوو بەهۆی ئەوەکە قەدوبالآی نەخۆش درێژ بێ ولەمەڕ دووهەمی و سێهەمی دا،هەڵبرانی نمدانەوەی لووەکانی رێژێن بوونەهۆ یەکێ رەش هەڵگەرێ وئەوەی تر چکۆڵە بێتەوە. لەپاش ئەم پێشەکی یەراپۆرتی پزیشکانی نەخۆشخانەلەسەر دوو بنچینە رادەوەستا.

یەکەم:ئاخۆزیادبوون یا هەڵبرانی نمدانەوەی لوودکانی شاراوەلەکەسانی دیکەشدا هەرئەم شوێنەوارانەبەدی دێنێ،یا ئەم نەخۆشیانە بەتایبەت لەم سێ کەسەدا سەریان هەڵداوەو هەتا

ئەمرۆ،سەبارەت بەهیچکام لەم سێ بابەتە،شیکاریەک لەسەر کەسی ترنەکراوەهەتابزانین داخوا نەخۆشیەکانی وەک ئەمانە، لەخەڵکی دیکەشدا سەرهەڵدەدا یان نا ؟.

دووهەم: ئەوەبوو کە،لەبۆ عیلاج وچارەی ئەم نەخۆشانە چ بکرێ؟ و ئایا بەتێکردنی نمدانەوەی لووەکانی دەروونی دەکرێ چارەی نەخۆشی دووهەم وسێهەم بکرێ ؟.

لەوراپۆرتە داتەنانەت بەتەوسیشەوە ناوێ لە"زائربرۆخ"نەبرابوو، لەحاڵێکدا کەبۆ پزیشک ونوژدارانی نەخۆشخانەی شاریتی رون ببۆوە کەلەهەرسێک بابەت دابەرپرسی نەخۆشی زائربرۆخە کە لەروی هەڵەباشیەوە دەستی دەلووەکان وەرداوە.

لەسەروشەی"هەڵە"پێدادەگرین چوونکەپزیشکانی نەخۆشخانە نەدەشیان بیربکەنەوەکەدەسکاری کردنی زائربرۆخ لەلووەکانی دەروونی هەرسێک نەخۆش بەئەنقەست (هەڵبەتە ئەنقەستی پەیدابوو لەنەخۆشی خەرفان)بووە،نەک بەهەڵە.

بانەیشێرینەوە،ئەوپزیشک ونوژدارانەی کەئەوراپۆرتەیان ئامادە کردبوو ئێرەییان بەزائربرۆخ دەبردوپێیان ناخۆش نەبووهەر سێ هەڵەی مامۆستالەوراپۆرتەدا بێننەبەرباس.

ئەگەرئەوهەڵانەلەراپۆرتەکەداباسکرابان،زائربرۆخ نەتەنیاسەرزە نشت دەکرا،بەڵکوزۆرلەشکێ بوو، رادرابا وئیترنەیاندەهێشت بە هەبوونی سەربەخۆییەوە لەنەشتەرگەریدا بێتەنێوژووری عەمەل و کێردبەدەستەوەبگرێ،مووچەیەکی خانەنشینیان دەدایەو هەتا کۆتایی تەمەنی دەبوولەماڵێ رابێرێ.

دووشت رێگربوون لەوەی کەئامادەکەرانی راپۆرتەکە ناوی زائر برۆخ نەبەن وئەوی وەک بەرپرسی نەخۆشی یەکەم وتوانەوە و نەقوستان بوونی دوو نەخۆشەکەی تر بناسێنن : یەکەم پلەی زانستی وهونەری ئەو مامۆستایە بوو کەگشت نەشتەرگەرانی ئالمانی رۆژهەلات دەستی لەسەرووتربوونی زانیاری وتیکنیکی ئەویان لەلاملی خۆدەدا،دووهەم ئەمەیان دەزانی کە"زائربرۆخ" جێ سەرنج وچاوسووری دەولەتی ئەوکاتیە.

گوتمان کەهێشتادەولەتێکی خۆجێی وسەبەخۆلەئالمانی رۆژ هەلاتدانەهاتبووەسەرکار،بەلام حیزبی کومونیستی ئالمانی رۆژ هەلات بەکردەوەخاوەنی دەسەلات دەژمێردرا و سەرکردەکانی ئەوحیزبەرێزیان لەزائربرۆخ دەگرت وپشتگیریان دەکرد،لەحالێک داکەزائربرۆخ ئەندامی حیزبی کومونیست نەبوو.

بەلام بەشداری نەکردنی لەحیزبی نازی لەدەورانی هیتلەردا و هەلنەهاتنی بۆئالمانی رۆژئاوالەدوای کۆتایی هاتنی شەرئەوی لەلای کومونیستان کردبووە خاوەن کەسایەتیەکی مەزن.ئاگادار بوون "نازی"یەکان داوایان لەزائربرۆخ کردبێتەئەندامی حیزبی نازی وئەوقبوولی نەکرد،بەرپەرچ دانەوەی داوای نازیەکان، لە دەورەی هیتلەر،ئەویش لەکاتێکی داکەئوتریش (نەمسا)رەگەل ئالمان کەوتبوو وهیتلەرلەروانگەی نازیەکانەوە دەسەلاتدارێکی بەدەرلەمرۆیی حەساودەکرا،ئازایەتی گەرەک بوو،هەرکەسێکی ئەو گاس کردنەی رەت کردباوەدەبوو خۆبۆ دانبەجەرگ رۆگرتنی هەموو جورەرۆژەرەشیەک ئامادە بکا.

بەروبووی کارەکانی کۆنگرەی پزیشکی سەبارەت بەدوونەخۆش کەیەکیان رەش وئەوی دی چکۆڵە ببۆوەئاکامێکی دەمودەستی نەبوو.چونکینێ لەراگەیەندراوی دوای گوتوبێژەکان کەلەلایەن کۆنگرەوەدەرچوو،چ دەرمانیان بۆچارەسەری ئەودوونەخۆشە دانەنابەڵام گوتیان کەلەبۆدۆزینەوەی رێگاچارەپێویستەجەرپاندن وشیکاریەکی بەربڵاولەسەرگیانلەبەران بکرێ ونمدانەوەی لووی "کۆرتیکۆ سورناڵ"و لووەکانی "پاراتیرۆئید"لەوان دا ببرِدرێ.هەتا ئەوجێگەی شوێندانانەکەی ببیندرێ وهەنگی بۆدەرمان وچارەی وەخۆکەوتن بکرێ، جائەگەر رێگەچارە دۆزرایەوە بۆئەودوو نەخۆشەی کەلە نەخۆشخانەدا خەوتوون دەکاربکرێ.

رون وئاشکرابووکەنەدەکرا پێشبینی ئەوەبکرێ شیکاریەکانی کەلەسەر گیانلەبەران دەکرێ دەگاتەئاکام یان نا ،ئەگەرئاکامی ئەرێنی بەدەستەوەبێ کەی ئەوئاکامەوەگیردەکەوێ وچلۆنی سەبارەت بەودوو نەخۆشە دەکاربکەن.

❊ ❊ ❊

نەخۆشێکی دیکەی کەداوای کردبووبەهۆی پرۆفیسۆر زائربرۆخ بخرێتەژێرنەشتەرگەری بەناوی "ئیشتۆمب"ناوی دەبرا. ئەولەسەرەتای ژیانیداکرێکارێکی کانزاگەری بوو بەڵام لەوکاتەی کەدەیەویست بەدەستی زائربرۆخ نوژداری بۆبکرێ یەکێ لەپیاوە سیاسی وبەناوبانگەکانی ئاڵمانی رۆژهەڵات دەژمێردرا.

لەساڵی١٩٣٣دا ئیشتۆمب کرێکارێکی کانزاگەری وئەندامی حیزبی کومونیستی ئاڵمان بوو. هەرلەوساڵەدابەوچەشنەی کەلە مێژووی فەرمی ئاڵمان داهاتووە، نازیەکان ئەنجومەنی نەتەوەیی ئاڵمانیان بەناوی"رایشتاک" ئاگرتێبەرداوحیزبی کومونیستیان بە هۆی نانەوەی سووتمانەکەناساندو کۆمەڵێک کومونیستیان گرتن، یەکێ لەوانەئیشتۆمب بوو کەوتەبەندیخانە.

یەکێ لەکومونیستەکانی کەکەوتبوەبەندیخانەپیاوێک بووبەناوی "لیۆبێ"کە بەشێوەیەکی هەست پێکراو دەلووکاریش بووحوکمی لەسێدارەدانی بەسەرداسەپا.ئەوپیاوەبێتاوانەیان کوشت وبرێک لەکومونیستەکان زیندانی کورتماوەیان بەسەردابراو پاش دەورەی مەحکوم بوونەکە ئازادیان کردن،بەڵام ئیشتۆمب حوکمی هەتا هەتایی بەندکرانی بەسەردا سەپێندرا.

لەساڵی١٩٤٤داهێندێک لەئەفسەرانی سپای ئاڵمان بەهۆی ئەوەی کەدەیاندی شک لەشکستی ئالمان دانیە،ویستیان هیتلەربکوژن (دەزانین ئەوتەمای کوشتنەنەگەیشتەئاکام) وێرای ئەوکەسانەی بەتاوانی بەشداری کردن لەوبۆسەی کوشتنەدا کەوتنە بەندیخانەوئیعدام کران،چەندان کەسی کومونیستی ئازاد کراویش هەبوون.

ئەگەرلەوکاتی دائیشتۆمب ئازادبایە، زۆروێدەچوو وەک ئەوانیتر دەگیرا وئیعدام دەکرا.بەڵام ئەوپیاوەئەودەمی لەزیندان دابوو، و ساڵێک دواتر،پاش ئەوەیکە هیتلەرخۆی کوشت وئاڵمانی نازی دەستی بەردایەوەئیشتۆمب لەبەندیخانەبەربوو، چوونکەلەساڵی

۱۹۳۳ڕاهەتاکۆتایی دەسەڵاتی هیتلەرلەبەندیخانەداببوو،لەدوای ئەوەی کەئازادکرالەروانگەی کومونیستەکانی ئاڵمانی رۆژهەڵات داوەک قارەمانێک دەرکەوت.ئیشتۆمب بەرلەوەی بکەوێتەزیندان تووشی نەخۆشی زامی ریخۆڵەی دوانزەگرێ بوو.

لەماوەی سێزدەساڵی کەئەوپیاوەلەبەندیخانەدا رایباردلەبۆچارە سەری زامی دوانزەگرێ دەرمانی دەخواردبەڵام خۆراکی سازگار ولەباری نەبوو، ئەوکەسانەی تووشی زامی دوانزەگرێ یان برینی مەعیدەن دەبێ لەخواردنی برێک خۆراکان خۆبپارێزن،وەک ئێژن، لەپارێزێکی تایبەت پێرەوی بکەن وئیشتۆمب لەگرتووخانە داجگە لەخواردنی خۆراکەکانی ئەوێ رێگەچارەیەکی نەبوو،چێشتی تایبەتیان بۆ لێنەدەنا.

لەدوای هاتنەدەر لەزیندان چوونکەکەلوپەلی پتری بۆچارەسەری نەخۆشیەکەی کەوتەدەست هەوڵی دابەدەواودەرمان چارەیەک لەخۆی بکابەڵام پاش چوارساڵ دەواخواردن دوکتۆرەکان پێیانگوت کەبۆچارەسەری ئێجگاری دەبێ بخرێتەبەرنەشتەرگەری.

ئیشتۆمب هێنرایەنەخۆشخانەی شاریتی،ئەوچەندرۆژلەنەخۆش خانەدامایەوەهەتا لەبۆ نوژداری حازربکرێ،لەرۆژی دووی مانگی ژوئیەدا هێنایانە ژووری عەمەل وهەروەکی ئیشتۆمب ویستبووی پرۆفیسور زائربرۆخ بۆنەشتەرگەریەکەی دیاری کرا.

## بابەتی دەستەوانە

زائربرۆخ چووەلای دەسشۆری ودەستی بەئاوی شیرەوتێن و سابوون شووشت،هەنگی ژنێکی پەرستاردەستەوانەی نوژداری ئیستریل کراوی بە"پەنس"ێک هەڵگرت وبەرێزەوە پێشکەش بە مامۆستای مەزنی کردتابیانکاتەدەستی بەڵام زائربرۆخ دەستەوا نەکەی وەلانا،ویلفرێدی یاریدەری زائربرۆخ دیتی کەدەستەوانەی وەرنەگرت،پێی وابوو کەچەندساتێکی تردەستەوانەکان دەکاتە دەستی دەخۆی.

بەڵام مامۆستای بلیمەت بێ ئەوەی دەستەوانەی دەدەستی کردبێ هاتەژووری عەمەل.دەسکێشی نەشتەرگەری لەگەڵ ئەوەی داکەئامرازێکی ساکارە ،لەعەمەلەکانی نەشتەرگەری دا یەکێ لەشتە هەرەشوێن دانەرەکانە لەبۆ بەرگری کردن لەچڵک کردنی برین.

بەرلەوەی کەنوژداران کەڵک لەدەستەوانەوەرگرن،هەرچەندێکی پێش عەمەلی نەشتەرگەری دەستیان بەوردی دەشووشتەوە، دیسان چەند میکرۆبێک لەئەنگوست وپشت وبەری دەست دا هەردەمانەوە وئەومیکرۆبانە رەنگبوو شوێنی زامی نوژداری کراو پیس بکەن وبرینەکەچڵکێ بێنێ.

ئەمرۆ ئەگەربرینێکی نوژداری کراو چڵکێ بکا بەدەرمانەکانی "ئانتی بیۆتیک" چڵک وئیلتیهابەکەلەنێو دەبەن ورێگادەگرن لە مردنی نەخۆش.بەڵام لەرابردوودا دەرمانی ئانتیبیۆتیک نەبوون، یان لەوساڵانەدا وەک ئێستا برەویان نەبوو،پاش ئەوەی کەبرینی شوێنی

نـەشـتـەرگـەری کـراوپیس دەبـوو وچڵکـی دەکـرد رێـی تێـدەچـوو نەخۆشەکە تێدابچێ.

داهێنـان لـەدەسـتەوانـەدەدەسـتی کـردن داکـەئـەمرۆلـەگـشت جێگـا لەپێویـستیەکـانی نـەشـتەرگـەری دەژمێـردرێ مـەترسـی پـیس بـوون وئیلتیهابی برینی بەشێوەیەکی هەمەکی لەنێوبرد.

ئـەمـەش دەبـێ بزانـرێ کـەهـەرچـەنـدێکی لـەبـۆ ئیـستریل کردنـی جووتەدەستەوانەیەکی نوژداری سەرنج ووردبینـی بکرێ،ئیـستێ دوای ئـەوەی نـەشـتەرگـەری دەسـتی پێکـرادەسـتەوانـە بـەمیکرۆبـی دەرچوولەبرینی خـودی نـەخۆشـەکـەپـیس دەبێ.بـەڵام میکرۆبـی دە لەشـی نـەخـۆش کـەنیـشتوونەتـە دەسـکەشـەکـەوبیـراوەسـتان زاوزێ دەکەن (ئەگەرگەرمای دەوروبەرلەباروبـەقـەدەرلـەشـی نـەخـۆش یـانی ٣٧پلەبێ)بۆ نەخۆش مەترسیان نیە لـەبـەرئـەوەی کـە"ئـانتی بـادی" لـەشـی نـەخـۆش ئـەومیکرۆبانـە دەناسـێ و لـەشـێوەی قڕکردنیـان ئاگاداره.

"ئانتی بادی"کەلەزمانی پزیشکی جیهانی دا بـەوەرگیـراوی لـەزاراوەی فەرانسەیی "ئانتێ کۆر"دەکاردەکرێ،بەشـێکە لـەهـۆ گـەلـی بـەرگـری لـەشـی ئێمـە،کـەنـابێ لێمـان تێکچـێ ئـەوی دەگـەڵ 'خڕۆکـەی سپیەکانی"خوێن،کەئەوانیش بـەشـێکن لـەسیـستەمـی شـوێن دانـەری بەرگری لەشمان،بەهەڵەوەرگرین.

ئانتی بادی گشت میکرۆبەکانی ئاسـایی کـەهێـرش دێـنن بـۆ لـەشـی ئێمەولەنێوجەستەمان داهەنەدەناسـێ وتـەنیالـەبـەرانبـەر میکرۆبێکـی نەناسدا دەخەجڵێ،کەچـی ئـەوشڵـەژانـەش لـەساتێ پتـر ناخایـەنێ

وبۆبەربەرەکانی دەگەڵ ئەومیکرۆبەش ئانتی بادی تایبەت دێتە دی.ئەوەش بزانرێ باشەکەلە لەشی ئێمەدا ئانتی بادی بەربەست نەکراوەبەیەک جور،لەشی ئادەمیزادبۆهەرجورە میکرۆبێک ئانتی بادی تایبەت دروست دەکا.

میکرۆبیش دوای ئەوەی چووە نێولەشی ئێمەچەکی خۆی کە ناودێر کراوەبە"ئانتی ژێن"بەگژئانتی بادی وەدەنێ.شەری نێوان ئەم دووە شەرێکە کەژیانی مرۆڤی پێ بەسراوەیەوئەگەر چەکی ئانتی ژێن سەرکەوێ مرۆڤ بەلادادێ ودەمرێ.

لەشەری نێوان میکرۆب وئانتی بادی هۆکارەکانی تری بەرگری لەشی ئێمە،وەک خرۆکەسپیەکان،دێنە یارمەتی ئانتی بادی.

چلۆنایەتی شەری نێوان"ئانتی بادی" و "ئانتی ژێن"یەکێ لە سەرباسەکانی بەرفراوانی زانستگەلی ئەرکەکانی کۆئەندامی لەش وژینەوەرناسی وهەروەها زانستی میکرۆبیۆلۆجی (زانستی ژینەوەر ناسی میکرۆبی)یە وناکرێ لێرەدا بچینەنێوئەوباسەدوور ودرێژە،رێبوارانی هەردوو زانستی ژینەوەرناسی ومیکرۆبیۆلۆجی پاش ئەوەی کەهەموو قۆناخەکانی زانستگایی یان لەم زانستانە دا تێپەراند تازەدەبێ سەبارەت بەبنیچەو چیەتی"ئانتی بادی" و "ئانتی ژێن"توێژینەوەبکەن،هێشتا چارانێک هەڵنەکەوتووەهەتاکو بەدوورو درێژی باسی شەری هەمیشەیی" ئانتی بادی" لەشی مرۆدەگەڵ میکرۆبەکان بنووسێ وبەئاگاداری ئەوخەڵکەی رابگە یەنێ کەوەختی خوێندنەوەی کتێبەکانی زانستیان نیە، ئەگەر داستانی ئەم شەرەبێ

برانەوەیەبنووسرێتەوە حەماسەی ئیلیاد هۆنراوەی هومێری شاعیری یوونانی دەخاتە بن سێبەری خۆی.

جالەبۆیە بەوەندەی رازی دەبین بێژین کەچوونکە ئەومیکرۆبانەی لەسەردەستەوانەی نەشتەرگەر پەیدا دەبن میکرۆبی خوودی نەخۆشەکەن وئانتی بادی لەشی دەیانناسێ ودەزانێ کەچلۆن لەنێویان بەرێ، بۆنەخۆش مەترسیان نیە.

دوکتۆر ویلفرێد لەژووری عەمەل دا پاش ئەوەی دیتی کەزائربرۆخ بەبێوەی دەستەوانە دە دەستی بکا کێردی نوژداری بەدەستەوە گرت،گوتی؛مامۆستای بەرێز ئاخۆ بێ دەستەوانە نەشتەرگەری دەکەی؟

زائربرۆخ خێسەیەکی لێکردو وڵامی دایەوە،لەکەیەوە بریاردراوە کە تۆ ئەمر و نەهی بەمن بکەی ؟

یاریدەر سەری بەرداوە وئیتر چی نەگوت.

بێدەنگ بوونەکەی دوو هۆی هەبوو؛یەکەم بەخۆی گوت خۆ پاراستنی مامۆستا لەدەستەوانە دەدەستی کردنێ بێشک بێ مەسلەحەت نیە و دووهەمیش ئەوەی کەخۆی بە بەرمنەتی زائر برۆخ دەزانی.

ئەگەر چاوسووری زائربرۆخ نەبا،لەکەش وهەوای رامیاری ئەو کاتی ئاڵمان دا نەدەکرا ئیزن بدەن بەپیاوێکی وەک وی کەلە رابردوودا ئەندامی حیزبی نازی بوو،لەنەخۆشخانەدا کاربکا و دەرمانگەی تایبەتیش بکاتەوە.

گوتمـان کـەنـەخۆشـی ئیـشتۆمب زامـی ریخۆڵـەی دوانـزەگـرێ بـوو کەبەهۆی لەگرتووخانـەدا ژیـان نـەشـیا ئـەوبرینـە لـەرێگـای پـارێزی خۆراکەوە چارەسەربکا.

ئـەزانـین کـەریخۆڵـەی دوانـزەگرێ،بـەشـی یـەکـەمـی ریخۆڵـەکـانی ئادەمیـزادەکـەلـە مـەعیـدەڕا دەسـت پێـدەکـا وبـەریخۆڵـەی گـەورەوە کۆتـایی دێ،شـێوەی نـەشـتەرگـەری لـەریخۆڵـەی دوانـزەگـرێ ئاوایـە کەئەوبەشەی ریخۆڵەکە کەبەدەواودەرمان چارەی نەکراوە دەیقـرتێنن و هەنگی دووبەشە براوەکە پێکەوەدەدروونەوە.

پاشەوەی شوێنی عەمەلەکەدیاری کرائەوکەسانەی لـەژووری عـەمـەل دابـوون زامـی ریخۆڵـەکـەیـان دیـت ودوویاریـدەری مامۆسـتا دیتیـان کـەزائربـرۆخ لـەجیـاتی ئـەوەی کـەتـەنیاشـوێنی زامـەکـەببـرێ بـەدوو وەشاندنی کێردهەموو ریخۆڵەی دوانزەگرێی قرتاند بە شێوەیـەکـی وا کەلەنێوان مەعیدەوریخۆڵەی باریک (ریخۆڵەی دوانـزە گـرێ لـەنێـوانی ئەودوودا هەڵکەوتووە) داهیچ شتێک نەما.

لەبەیـن بردنـی گـشت ریخۆڵـەی دوانـزەگـرێ پێویـست نـەبوو،نـوژدار دەبوو وای کردباکەئەوبەشە ساخەبۆنەخۆش بمابایەوە چوونکـە هـیچ بەشێکی ریخۆڵان نیەکەلەباری هەزمی خۆراکەوەسوودێک نەبەخشێ.

قرتانـدنی بـەشـێک لـەریخۆڵـەیـەک بۆنـەخـۆش زیـانی نیـە چوونکـە بەشەکانی تری ئەو ریخۆڵەیەقەرەبووی بەشەبراوەکەدەکەنەوە. بـەڵام ئـەگـەرتـەواوی بـەشـەکـانی ریخۆڵـەیـەک هـەڵبگیرێ،ئـەگـەرئـەو ریخۆڵەیـەدوانـزەگـرێش بێ،لـەبۆنـەخـۆش کـەمایـەسـی بـەدی دێنـێ.

بـەجـەخـت کردنـەوەلـەسـەرئـەم بابـەتـەهـەرگیزریخۆڵـەی باریـک بـە

تەواوی فرێ نادرێ چوونکەئەگەرئەوریخۆڵەیەهەمووفرێ بدرێ نەخۆش توانای هەزمی خۆراک وگۆرینی ئەوشتانەی دەبێ بتوێنەوەی نابێ ولەئاکام داناتوانێ زیندووبمێنێتەوە وئەمرێ.

لەپاش ئەوەی نوژداری بلیمەت گشت ریخۆڵەی دوانزەگرێی برِی وفرێی دا دەبووریخۆڵەیبچووک بەمەعیدەوەبدروێ.بەڵام ئەوکارەشی نەکردولەجیاتیان براوایی ریخۆڵەو مەعیدەی کوێر کردەوە بەشێوەیەکی ئاوها کەلەسکی نەخۆشدا رێگاوپێوەندێک لەنێوان مەعیدەو ریخۆڵەدانەما.

پیاوبەبێوەی ئاگاداریەکی هەرەکەمیشی لەئەرکەکانی دەزگای هەزم هەبێ تێدەگائەوکاتەی جێگەی هەڵبراوی مەعیدەوریخۆڵە دورواوکوێرکرایەوە ورێگایەک لەنێوان مەعیدەوریخۆڵەدانەما،خۆراک پاش ئەوەی لەمەعیدەداقۆناخەکانی سەرەتایی هەزمی تێپەراند رێگایەکی نابێ هەتا بچێتە نێوریخۆڵە، دەشزانین کەخۆراک تەنیا دوای چوونەنێوریخۆڵە لەش جێژی لێوەردەگرێ ودەشێ مرۆڤی تێرو بەگورِ وتاوبکا.

بێجگەلەوەش خۆراک دوای وەی کە قۆناخەکانی سەرەتایی لە مەعیدەدا تێپەراند ئەگەرلەو تۆربەیە دەرنەچێ ونەچێتە نێوریخۆڵە نەخۆشی دژواردێنەئاراوە کەبۆگەنبوون ورزینی خۆراک لەمەعیدە داوهەنگی "سێپ تیسمی"یانی پیسبوونی گشتی خوێن یەکێ لەونەخۆشیانەیەودەبێتەهۆی لەنێوچوون.

بەڵام دوویاریدەری پرۆفیسۆرزائربرۆخ، دەگەڵوەی کەبەچاوی خۆ دیتیان ئەو مەعیدەو ریخۆڵەی باریکی کوێرکردنەوە،بەچەشنێ کە

ئیترلەنێوان مەعیدەوریخۆڵەدا رێگایەک نەما،ئەوەندەیان متمانەبە زانست وتیکنیک ودەسرەنگینی مامۆستا هەبووکەپێیان وابووئەو عەمەلە لەدوورنۆریەکی مەزنەوە سەری هەڵداوە.مرۆ سەری سوڕ دەمێنی کەپاش ئەوسێ روداوە،لەراستی دا،سێ کارەساتە،کە بەهۆی زائربرۆخەوەقەومان چلۆن ئەودووکەسە سەرنجیان نەدا نەوەی کەنوژداری بلیمەت تووشی شیوانی ئاوەز بووە وئاکامی کارەکەی مەرگی پڕلەرەنج وژان ونارەحەتی"ئیشتۆمب"ی نەخۆش دەبێ.

## چارەسەری دوو نەخۆشی بەداماڵینی مۆخ

زائربرۆخ ماوەیەک بەرلەومێژووەی کەئەوروداوانەی باسکراویان لەلاپەرەکانی پێشووتێداقەومابوو،گوتبووی؛دەکرێ برێ لە کەم و کورتی ونەخۆشیەکانی دەروونی بەماساژ(داماڵین)چارە سەر بکرێن،بۆوێنەگوتبووی کەدەکرێ یادەوەری ئەوکەسانەی بەبێ سەدەمەدیتنی مێشکی زوقان یادەوەریان لەدەست داوە، بگێردرێتەوە.مەبەستی زائربرۆخ لەبەلا دیتنی مێشکی ئێسک ئەمەبووکەبەشێک لەمۆخ بەهۆی پێک دادان یان هەرهۆیەکی دیکەلەنێوچووبێ .

پیاوێک،کەکرێکارێکی پیشەسازی بوو، هاتەنەخۆشخانەوگوتی یادەوەری تێکچووە.لێیان کۆڵیەوەچ هۆیەک تووشی فەرامۆشی کردووە،بەڵام ئەوپیاوەنەیتوانی هۆی فەرامۆشیەکەی بڵێ وهەر ئەوەندەی گوت کەرابردووی خۆی بەتەواوی لەبیرچۆتەوە.

کابرای فەرامۆشکارلەکاتی هاتن بۆنەخۆشخانەبراکەی لەگەڵ دا بوو،براکەی تووشی نەخۆشی فەرامۆشی نەبوو ،هەڵیدایە:من لە بیرم ناچێتەوەپرۆفیسۆر زائیرۆخ گوتی کەدەکرێ یادەوەری ئەو کەسانەی تووشی فەرامۆشی بوونە بەعەمەلی نەشتەرگەری بگێردرێنەوە .

ئەوکاتی کابرای فەرامۆشکارخۆی گەیاندەنەخۆشخانە نزیکەی بیست وچوارکاتژمێرتێپەری بوولەوزەمانەی کەسەرۆکی کرێکارە نەخۆشەکەبەهۆی نێردراوێک،کەزائیربرۆخی دەناسی، داوای لەمامۆستا کردبووکەچوونکە کرێکاری فەرامۆشکارکرێکارێکی لایقی پیشەسازیەو نەخۆشی دەروونی وی لەبۆ خۆی وئەودامەزراوەی کاری تێدا دەکاخەسارێکە،مامۆستابەپێرەوی لەمرۆڤ دۆستی با چارەسەری بۆبکا .

زائربرۆخ پیاوێ نەبوو راسپاردان بەهێندوەرگرێ بەڵام چوونکە دە رۆستی سۆزی مرۆڤ دۆستی خۆی نەدەهات بەدوکتۆرویلفرێدی گوت ئەگەر ئەونەخۆشەی یادەوەری تێکچووە هاتە نەخۆشخانە ئاگاداری بکەنەوە .

دوکتۆر ویلفرێد هاتنی نەخۆشی بەئاگاداری زائربرۆخ راگەیاند و مامۆستاگوتی ئەوپیاوەی بۆنەشتەرگەری مۆخ لەنەخۆشخانە وەر گرن وپێداویستیەکانی عەمەل جێبەجێ بکەن.

دوکتۆر ویلفرێد گوتی ئەم پیاوەیادەوەری خۆی لەدەست داوە،و ئاخۆ دەکرێ بەنەشتەرگەری لەمۆخی دا یادەوەریەکەی بێنیەوە سەرخۆ ؟.

زائربرۆخ گوتی: ئەز بەماساژ(دامالّین)ی مۆخ هێزی یادەوەری دە گێرمەوە سەرجێی خۆی.

دوکتۆر ویلفرێد رای وانەبوو کەبکرێ بەهۆی دەس پێداهێنانی مۆخ یادەوەری بگێردرێتەوە،بەلاّم چوونکەزائربرۆخ حالّی ئاسایی هەبوو یاریدەرەکەی وا تێدەگەیشت کەمامۆستاتووشی "خەرفان" نەبووە.

هەرلەبۆیەئەمری کردکەنەخۆشەکە لەخەستەخانەبۆعەمەلێکی نەشتەرگەری لەسەرمێشک ئامادەبکەن وبە تەما بوو لەکاتی عەمەلدابەوردی ئاگای لەزائربرۆخ بێ وهەرکەهەستی پێکردنەو پیاوەبەهەلّەدەچێ رێگەلەدرێژەدانی عەمەلەکەی بگرێ.

لەرۆژی دیاری کراودا،نەخۆشیان هێنا تەلاری نەشتەرگەری و زائربرۆخ لەپاش ئەنجام دانی ئەوکارانەی لەلاپەرەکانی پێشتردا باسمانکردن، هاتەنێوژووری عەمەلّ ولەدوای وەی کەئێسکی کەلەی لە کاسەسەرجیاکردەوەوبەسەرکاژەلاّک داقەدی کردەوە مێشکی نەخۆش بەدیارکەوت، کەرەنگی سپی مەیلەوخۆلّەمێشی هەبوو.

زائربرۆخ گوتبووی ئەگەربێتو ماسولکەکانی مێشک(ئەگەربکرێ ناوی ماسولکەی لەبەشەجوراوجورەکانی مۆخ بندرێ)وەرزش پێ بکەن ودەستیان پێدابێنن،سستیەکەیان لەبەین دەچێ وگوڕوتین دەگرنەوە.

ئەو وکەسانی تری کەلەژوورەکەداحازربوون پێیان وابووکەبەهێز کردنەوەی خانەکانی مێشک لەدەرەوەی مەیدانی کیمیاتراپی، یانی لەدەرەوەی کەوشەنی ئەو شوێن دانانەی کە دەرمانەکان لەمێشک دادەیکەن،کاری دەروون ناسان وناخ دۆزانە وئەوانن کە دەتوانن بەهۆی بەناخ دارۆچوون لەخانەکانی مێشک دا تەئسیر دابنێن

ویـادەوەری بگێرنـەوە وپیـاو یـاژنێکی رەش بـین وهیـوابراو بگـۆڕن بەکەسێکی گەش بینی هیوادار.

مامۆسـتادەسـتی کـرد بـەدامـاڵین وگوتمـان کـەرەنگـی مێـشکی نـەخۆشـەکـە سـپی مـەیلـەوخۆڵـەمێـشی بوو،هـەرچـەنـدی زائربـرۆخ زیاتربەدووقامک شوێنی تایبەتی یادەوەری دادەمـاڵی رەنگـی سێشک پترخۆڵەمێشی دەبوو.

زائربرۆخ کەلەجووڵەی مێشکی ژێرقامکـەکـانی خـۆی دەیتـوانی پـەی بەوەزعی دڵ ونەبزی نەخـۆش ببا،بۆمتمانـەوەرگـرتن پرسـی ژمـارەی لێدانی دڵ چەندەیە ؟.

پێیـان گـوت هـەشـتاوپێنج،رادەی تـەوژمـی خـوێنی پرسـی،وڵامیان داوە؛پـانزە و دوانـزە. زائربـرۆخ دەسـتووری دا ئۆکـسیژن بگـەیـەننـە نەخۆش.

یاریـدەری زائربـرۆخ چـاوی لـەسـەرئـەنگوسـتەکـانی نـەشـتەرگـەر هەڵنەدەگرت وهەندێ جارچاوێکی بەقەلافەتی دا دەخشاند تـا ببینـی داخوا لەسیمای ئەوپیاوە دانیشانەیەک لەتێکچوونی هەسـتگەل بـەدی دەکا یان نا.

بـەلام سـەروسـیمای نـەشـتەرگـەرئاسـایی بوو،لـەروخـساری دا نـە نیـشانەیـەک لـەتێکچـوونی هـەسـتگەل،نـەخـەجلانێـک ونـەهـەلـەهـەل نـەدەبینـرا وبـەجووڵـەیـەکـی یـەکدەسـت بـەهـەردووقـامکی مێـشکی نەخۆشی دادەمـاڵی وهـەرچـەنـدی داماڵینـەکـەدرێژتـردەبـۆوە رەنگـی مێـشک،لەوجێگـەی کـەلـەبـن ئـەنگوسـتەکـانی نوژداردابـوو،رەنگـی

تۆخترهەڵدەگەرا،سوورهەڵگەراوهەنگی سوورێكی تارولەپاشان كەوتەسەررەنگی خورمایی.

چەندجاران ویلفرێدویستی داوا لەمامۆستا بكاوازلەداماڵین بێنێ وزامەكەبپێچێ، كەچی نەیوێرا.

نوژداری مەزن بۆجاری سێهەم دەستەوانەكانی گۆری،دیاربوو ئەوەندە وریاو وردەكەناخوازێ بەودەستەوانەی بەمیكرۆبی هۆدە كە (كەلەسەرزامەكەنیشتوون) پیس بوونە،درێژە بەداماڵینەكەبدا.

ئەوكەسانەی لەنێوژووری عەمەل دابوون لەدرێژەكێشانی ماوەی داماڵینەكە وەرەزوپەشێو بوون،كە مامۆستا نیشانەی بێتاقەتی لەقەلافەتی ئەواندا دیت،گوتی:ئەگەرئێمەتوانیبامان پاش ئەوەی برینەكەمان دەبەستەوەچەندرۆژ دوایەسەرمان هەڵەشكاوتبایەوە وسەرلەنوێ دامانماڵیبایەوە من پێم دانەدەگرت لەسەرئەوەی كە درێژە بەداماڵین بدەم،بەلام ئێمە دوای چەندرۆژی دیكە بۆمان ناكرێ كاژەلاكی ئەم پیاوەبكەینەوە،دەبێ هەرئەمرۆئاكام لەكاری خۆوەرگرین وبەئێجگاری زامەكە ببەستینەوە.

دووجاری دیش زائربرۆخ پرسیاری لەلێدانی دڵ ونەبزی نەخۆش كرد وحەزی كردبزانێ داخوا نەخۆش بەرەوانی پشووی دێ یان نا،ولامیان دایەوەكەهەناسەكێشانی نەخۆش ئاساییە.

لەخاڵی داماڵینەكەڕا رەنگی مۆخ مەیلەورەش بوون بوو،ویلفرێد لە خەیاڵی دانەدەگونجاكە خانەكانی مۆخی ئینسانێكی زیندووبێتە سەرئەورەنگە.

سەرەنجام زائربرۆخ وازی لەدامالّین هێناو ویلفرێد چاوێکی بە سەعاتەکەی داخشاند،تێگەیشت کەمامۆستای، ماوەی سێ کاتژمێری بێ راوەستان خەریکی دامالّین بووە.

باسمانکردلەرابردوودا نەریتی نەشتەرگەرانی مەزن ئەوەبوو کە پاش تەواوبوون لە عەمەلێ پێچانەوەی برینیان بەیاریدەرانی خۆ دەسپارد ولەژووری عەمەل وەدەر دەکەوتن،کەچی ئەوێ رۆژێش وەک رۆژانی رابردوو، زائربرۆخ بۆخۆی برینەکەی بەستەوە، ئەو ئێسکەی شکاندبوویەوە هێدی خوونی کردەوەو بەسەرمێشکی دا رۆ گرتەوە،ورد دیقەتی کرد یێسکەکەبکەوێتەوە سەرئەوجێگەی لێی برابوو،هەنگی ئەوداودەرمانەی کەدەبوو دا بنرێتەسەرزامەکە - هێشتاش پزیشکەکانی ئوروپالەسەردابی حەکیمەکەونەکان بەو دەرمانەیان دەگووت "ئونگنێ = (هەتوان)"یانی مەلّحەم - داینا و سەری نەخۆشی پێچایەوە، ئەوکاتەی نەخۆشەکەیان لە ژووری عەمەلەوە دەگوێستەوە بۆهۆدەی سانەوە،زائربرۆخ گوتی ئەم پیاوە سێ رۆژی تردەبێتەوە خاوەن یادەوەری.

لەوسێ رۆژەدا،هەرلەونەخۆشخانەیەدازائربرۆخ بەرپرسایەتی چەندنەشتەرگەری دیکەی گرتبوە ئەستۆوگشت عەمەلەکانیشی سەرکەوتوو بوون بەچەشنێکی واکەویلفرێدی یاریدەری قایل بوو کەنەخۆشی هەستپەڕی نەشتەرگەری بلیمەت بەسەرداهاتنێکیی لەناکاو وزوو تێپەربووە.

ڕۆژی سێهەمی پاش عەمەلی نەشتەرگەری لەسەرمێشکی ئەوپیاوەی کەیادەوەری خۆی لەدەسدابوو،کابرا یادەوەریەکەی هاتەوەسەر جێی خۆ وچاک بۆوە.

هەتا ئەوی ڕۆژێ دوکتۆر ویلفرێد بڕوای نەدەکردکەعەمەلی دەسپێداهینان وداماڵینی زائربرۆخ کاریگەردەبێ و فەرامۆشکاری ئەوپیاوە چارەسەردەکرێ.چوونکەڕێگەچارەی زائربرۆخ لەڕوانگەی ویلفرێدەوە بەڕەچەشکێنیەکی نادروست خۆی دەردەخست وپێی وابوونەگەرئەم داهێنانەمەترسی نەبێ کوێرەوەریەکی بێ سوود وبەهرەیە.

بەڵام ڕۆژی سێیەم پاش ئەوەی نەخۆش یادەوەری خۆی وەگیر کەوتەوە ورابردووەکانی هاتنەوەبیرو وڵامی دروستی سەبارەت بەرابردووی خۆی دانەوە بە پرسیارەکانی ویلفرێد، ئەو دوکتۆرە نەشتەرگەرەلەدڵی خۆ دا سەلماندی کەهێشتازائربرۆخ خێوی داهێنانی بلیمەتانەیەو لەدەستی دێ بەکارە سەرسوڕهێنەرە کانی لە نەشتەرگەری دا کۆمەڵی دوکتۆرونوژدارەکان ناچاربکابە ئافرین لێکردن وپێداهەڵگوتن.

ماوەیەک بەرلەورووداوانەی باسکران زائربرۆخ قایل ببووکەڕۆژێک فیلم هەڵگرەوەکان لەژووری عەمەل داحازربن و لەیەکێ لەعەمە لیاتەکانی فیلم هەڵگرنەوە.بەڵام دوای وەی کەنیشانەکانی پەرتی لێوەدەرکەوتن یاریدەرەکەی بەباشی نەزانی کەفیلم هەڵگرەوە کان بێنە تەلاری نەشتەرگەری.

کەچی ئەوسێ رۆژەی کەعەمەلەکانی زائربرۆخ ئاسایی بوون، دوکتـۆر ویلفرێدی دڵنیـاکرد وفـیلم هـەڵگـرەوەکـانی ئاگادارکرد کـە چـوارەم رۆژبۆوێنە هەڵگرتنەوەلە عەمەلێکی زائربرۆخ بالەنەخۆش خانە حـازر بن.

لەوێ رۆژێ دا زائربرۆخ دەبوو ژنێکی کەدوچاری نەخۆشـینی "هیمـی بلێژی"بوو بخاتەژێرعەمەلی نـەشتەرگـەری وچـارەسـەری بکا.دەبـێ ئـەمـەش بڵـەیـن کـەلـەپـێش زائربـرۆخ داهیچکـەس قـەرەی خـۆی لەنـەخۆشـی هیمـی بلیـژی نـەدابـوو کـەبـەعـەمـەلـی نـەشـتـەر گـەری چارەسەری بۆبدۆزێتەوە.

نەخۆشی هیمی بلێژی ئیفلیج ولەکارکەوتنی نیوەی لەشەکە بە هۆی تـــەمـــەڵـــی وســـستی خانـــەکـــانی نیـــوەی مێـــشک ســـەر هـــەڵ دەدا.ئەگەرخانەکانی لـەتـی راسـتی مێـشک تـەمـەڵ وتووشـی خـاوی بووبن لای چەپی لەش لەکـاردەکـەوێ ونـەخـۆش وزەی نـابێ دەست وپێی چەپی بجـوولێنێ وئـەگـەر خانـەگـەلی نیـوەی چـەپـی مێـشک تووشـی سـستی وبێکـاری بـووبن لای راسـتەی لـەش ئیفلـیج دەبـێ ورادەی ئیفلیجیـەکـەش،لـەبـاری کـەم هێـزی و قـەوو بوونـەوە، بەستراوەتەوەبەرادەی تەمەڵی وخاوی خانەکانی مێشک.

نـەخۆشـی هیمـی بلێـژی بێجگـەلـەخـاوی خانـەکـانی نیـوەی مێـشک بەهۆیـەکـی دیکـەشـەوەسـەرهـەڵـدەداوئـەویش پـەیـدابوونی"لیژیـۆن" ێکـەلـەنیـوەی مێـشکدا،لیژیۆن زاراوەیـەکـی نێونـەتـەوەیـی پزیـشکیە کەهەربەم شکڵەلەگشت زمانەکاندا سەلمێندراوە وئەوگەلانەی بەزمانی

ئینگلیسیش داخێون هەربەم قەوارەوەریان وەرگرتووە، بەلام بە شێوەی خۆیان،دەڵێن"لیژێن" .

لیژیۆن زامێکە بەچەشنی برینەکانی براو یان دەمارپچراو خوێن نادەڵێنێ ووەک زامەکانی ئاوساویش بای ناکا، کەچی لەهەر شوێنێ پەیدابێ رەنگی بەشێک لەماسولکە دەگۆڕێ وخوڕوو یان کزانەوە بەدی دێنێ وبەژانە .

سەرهەڵدانی لیژیۆن لەئەندامەناسەرەکیەکانی وەک دەست وقاچ وسەرو زگ وتەختی پشت بەومەرجەی کەسەرەتای شێر پەنجەیەک نەبێ چ مەترسی نیە،ئەگەرچی مرۆڤ ئازاردەدا، کەچی خاوەن سەرەنجامێکی سەخت نیە .

بەلام ئەگەرلەئەندامەسەرەکیەکانی وەک مێشک،دڵ، سی، جەرگ وگورچیلە داسەرهەڵبداوچارەسەرکردنی وەپشت گوێ بخەن رەنگە ئەنجامێکی زۆرنالەباری لێبکەوێتەوە .

ئەگەر لیژیۆن لەنیوەی مێشک داپەیدابێ وبیتەنێتەوە رەنگە لابەدەنێکی ئیفلیج بکا،کەنابێ ئەم نەخۆشیە دەگەڵ راوەستانی مێشک (=سکتەمغزی، کەئەویش هەندێ جاردەبێتەهۆی لەکار کەوتنی نیوە یان هەموولەش)ی پەیدابووبەپچکرانی دەماروخوێن دەلاندن،بەهەڵەتێبگەین .

زائربرۆخ گوتبووی ئەگەرنەخۆشی هیمی پلێژی ئەوژنە سەر هەڵداوی"لیژیۆن"ی مێشک بێ چارەی بەمن نایە،بەلام ئەگەربە هۆی سستی وخاوی خانەگەلی مێشکەوەبێ ئەوەچارەسەری دەکەم .

لەوسەروبەندەدا"ئیشتۆمب"ی کرێکاری کانگا،کەگوتمان ئەندام لەحیزبی کومونیست دابوو ولەزەمانی هیتلەرداماوەیەک گیرا و لەپاش نوشوستی هێنانی ئاڵمانی نازی وەک قارەمانێکی رامیاری دەرکەوت، بەهۆی"سیپ تیسمی"یان بەگوتەیەکی دیکە پیس هەڵگەرانی گشتی خوێن مرد،دەزانین کە مردنەکەی بە هۆی عەمەلی نابەجێی پرۆفیسور زائربرۆخەوەبوو،کەلەجیاتی قرتاندنی برینی دوانزەگرێ تەواوی ریخۆڵەی ئەوپیاوەی لەنێو سک دەرهاویشت وفرێی داوسەروبنیشی بەست بەشێوەیەک کەلەنێوان سەرو خواری دەزگای هەزمکردن داپێوەندێک لەئارادا نەماهەتائەوەی دەیخوا وەدەری نێتەوە.لەئاکامدا بەبێوەی کەس هۆیەکەی بزانێ رۆژدەگەڵ رۆژێ حاڵی خەراوتردەبوو،لەکۆتاییش دالەبەرپیس هەڵگەرانی خوێن مرد.بەڵام مردنەکەی بە ئاسایی حەساوکرا وکەسیش سەرنجی نەدایە.

* * *

بەرلەوەی فیلم هەڵگرەوەکان بێنەنێو هۆدەی عەمەل کردن بە پێداگریەوە پێیان گوتراکە لەوژوورەدا ورتەیان لێ نەیەوسەبارەت بەکارو ئیشی مامۆستاو ئەوکەسانەی کاری لەگەڵ دەکەن هیچ داوای شیکردنەوە نەکەن وئاگادارین کەئەگەرقسەبکەن هەست گەلی مامۆستاوهاوکارەکانی دەشێوێ وگیانی ئەوکەسەی کە

لەژێرنەشتەرگەری دایەدەکەوێتەبەرمەترسی،سەرەرای ئەوەش تووشی تورەبوونی زائربرۆخ دەبن.
ئەوژنەی موبتەلای نەخۆشی"هیمی پلیژی"بوولەلای راستەوە شەپلەلێیدابوو،دەست ولاقی راستەی لەکارکەوتبوو،هەرلەبۆیە زائربرۆخ ئەوی رۆژێ لای چەپەی مۆخی ئەوژنەی وەدەرخست.
شێوەی عەمەل کردنی مامۆستا، هەرئەوەبووکە چواررۆژپێش لە سەرئەوپیاوەی کەیادەوەری تێکچووبوو،ئەنجامی دا؛ئەوەنەبێ کەلەوێ رۆژێ داتەنیا ناوەندی یادەوەری دادەمالی ولەمێشکی ئەوژنەیدا،گشت لای چەپی مۆخ،بووەناوچەی دەست پێداهێنان.
چەندرۆژ پێش نوژداری مەزن بەدووئەنگوست ناوەندی یادەوەری کرێکاری کانگەی رەژووی بەردی دادەمالی،بەلام لەورۆژەدابەهەر پێنج قامک تەواوی لای چەپەی مۆخی دەهەنوو.
دوکتۆر ویلفرێد کەچاوی لەسەردەستی زائربرۆخ هەلنەدەگرت ئاگای لێبووکە ئەوپیاوە،بەپێچەوانەی چەندرۆژ پێش کەبەئارامی مۆخی کرێکاری کانگەی دەهەنوو،ئەوی رۆژێ مۆخی ئەوژنەی هەلدەپشاوت.
یاریدەری زائربرۆخ تێگەیشت کەبەدی هێنانی تەوژم، لەلایەن مامۆستاوە،بۆ وەکارخستنەوەی رەگە بزوێنەکانە.
دەلەشی ئێمەدادووجورە رەگ هەنە،کە"شارە"ی هەردووکیان مێشکە،یەکێ رەگەبزوێنەکانن کەئەندامەکانی لەش دەجوولێنن وئەویتر رەگەهەستیارەکانن کەهەستگەلی پێنجەوهەستەکانی دیکە دەئێمە دەگەیەنن، لە شەپلەکانی سەرهەلداو لە "هیمی پلێژی"یان

راوەســـتانی مێـــشک دا رەگـــەبزوێنـــەکـــان لـــەکـــاردەکـــەون و رەگەهەستیارەکان درێژەبەکاری خۆ دەدەن.

چەندرۆژبەرکەزائربـرۆخ مـۆخی کرێکاری کانگـەی دەهـەنـوو نـەرەگـە بزوێنەکانی کـابرای لـەکارکـەوتبـوون ونـەرەگـەهـەسـتیارەکانی،تـەنیـا خانەکانی ناوەندی یادەوەری تووشی خاوی ببوون.

بـەڵام هیمـی پلێـژی رەگـەبزوێنـەکانی ئـەوژنـەی لـەلایـەکـی لـەشـی دالەکاریەخستبوو،هەربۆیەزائربرۆخ گوشاری دەخستەسەرمۆخی ژنـەی نەخۆش هەتاکاری ئەورەگانە بخاتەوەسەردۆخی جاران.

ویلفرێد بۆخۆی نوژدار بوو و لەشی مرۆڤی خاس ئەناسی و ئـەیزانـی کەبارودۆخی رەگەکان چلۆنە.

لـەدەورەی خوێندکاریداخوێنـدنی دوکتۆرونـوژداران وێکـدەچێ،بـەڵام پاشوەی پزیـشک و نـەشـتـەر گـەرچوونـەسەررێچکـەی پـسپۆری ولـە دوایە لەباری کارەوەلێک جیابوونەوە،نـوژدارەکـان، لـەمـەر"ئانـاتومی" یـانی ناسینی وردی ئـەندامـەکـانی لـەشـی مرۆڤ،کـەلـەزمـانێ مـەدا پێیدەگوترێ"توێکەری"، لەپزیشکان پتر شارەزادەبن و هۆیـەکـەشـی ئـەمـەیـەکـەنـەشـتـەرگـەر، هـەمـوورۆژێ لـەگـەڵ کـوت کـوتی لـەشـی مرۆداسەروکاری هەیە.

ویلفرێدکەبۆخۆی نەشتـەرگـەربـوو ولـەشـی مرۆڤـی خـاس ئـەناسـی، دەیزانی کەسی ویەک جووت رەگ،لەمێشکی زوقانەوەکەلەنێو بربـرەی پشت دایە،لێک جیـادەبنـەوە کـەهـەریـەک لـەوان لکێکـی سـەرەکیـە لەرەگەکانی لەش ولک وپۆی دیکەلەولقەسەرەکیانە دەبنـەوە،ئـەوسـی ویەک جووت رەگە،رەگەبزوێن وهـەسـتیارەکـانن. لـەخۆتـان ئـەپرسن

کەئاخۆ هونوونی نیوکورەی چەپی مێشکی ژنەی نەخۆش لەلایەن زائربرۆخەوە،لەرەگەبزوێنەکانی ژنەکەداکە بەمێشکی حەرام (مۆخ)ەوەگرێدراون،شوێندانەردەبێ ؟.

ئەوەی کەویلفرێدی ناچاردەکردئەم پرسیارەلەخۆی بکا ئەوە بوو کەهەتائەودەمەی هیچکەس دەخۆی رانەدیوەنەخۆشی (هیمی پلێژی) بەداماڵین وهونوونی مێشک چارەسەربکاو پزیشکانی سۆڤیەتیش کەلەپاش شەری دووهەم چەند شێوەی نوێی بێ پێشبینەیان بۆچارەکردنی هەندێ لەنەخۆشیان گرتەپێش،دەردی 'هیمی پلێژی"وراوەستانی مێشکیان بەم شێوەیەدەرمان نەکرد و بۆ چارەسەرکردنی تووشبووان بەمێشک راوەستان و "هیمی پلێژی" شێوەی "کیمیا تراپی"یان دەکاردەکردوبەدەوا پێدان وماوە یەک تیمارکردن،تووشبووان بەراوەستانی مێشکیان کەشەپڵەلە لایەکی لەشی دەدان،چارەسەردەکرد ولەبارەی ئەوکەسانەی تووشی لەکارکەوتنی هەموولەش دەبن بەهۆی خوێن دەڵاندنی هەردوو نیوکورەی مێشک هەتائەوی رۆژێ نەبیسراکەپزیشکانی سۆڤیەت توانیبیان یەکێ وەهاچارەسەربکەن کەبتوانێ وەکومرۆ سەلامەتەکان،لەدەست وپێی خۆ کەڵک وەرگرێ.

زائربرۆخ بەشێوەی ئاسایی،چەشنێ خەریکی کاری خۆی بوو کەهیچ سەرەنجی لای ئەوکەسانەنەبووکەلەهۆدەی عەمەل دا حازربوون.

تەنیاهاوکارانی خۆی کەلەکاتی کارکردندافەرمانی بۆدەردەکردن، وەک بەرپرسی بێهۆشی وئەوکەسەی کەچاوەدێری لەنەبزو دڵ و تەوژمی خوێن وپشووی نەخۆش دەکردوئەوژنەی کەدەبوو کەل وپەلی

نەشتەرگەری بداتەدەست،دەدیت.تەنانەت یاریدەرەکانی خۆی نەدەهاتەبەرچاو وسەرنجی نەدابۆیەکەچەندفیلم هەڵگرەوە لەنێو ژوورەکەدان وفیلم لەنەخۆشو شوێنی نەشتەرگەری وخۆی هەڵدەگرنەوە.

ویلفرێد بەفیلم هەڵگرەوەکانی گوتبوو کەنابێ قسەبکەن و ئەوانیش ورتەیان لێنەدەهات،بەڵام دوکتۆر ویلفرێدپێشبینی نە دەکردکەرەنگەیەکێکیان بکۆخێ یان بپشمێ،لەبەختی بەد یەکێ لەوان کۆخی.

زائربرۆخ سەری هەڵبری وچاوێکی بەفیلم هەڵگرەکان دا خشاندوپرسی ئەمانە کێن ؟.

ویلفرێدگوتی ئەمانەبۆفیلم هەڵگرتنەوەلەعەمەلیاتی نەشتەر گەری ئێوەهاتوونەوخوودی جەنابتان رازی بوون،ئەمانە بێن.

زائربرۆخ بەگرژی گوتی:کەی من وتم تاقمێک بێنەئێرەوبەر دەستی ئێمەبگرن.

ویلفرێد وڵامی داوە،بێ فەرمانی ئێوە بانگی ئەم بەرێزانەمان نەدەکردکەبێنەئێرە،جەنابت لەبیرت چووەکەئەم فەرمانەت دەر کردووە.

زائربرۆخ گوراندی:ئەمانەوەدەرنێن،ویلفرێدئاماژەی بەفیلم هەڵ گرەوەکان کرد بچنەدەرەوە وئەوانیش بەلالووتی وپەرۆشی، بۆ ئەوەی کەزائربرۆخ قەدری کوێرەوەریەکانیان ناگرێ،لەژوورەکە چوونەدەرێ،ئەوکاتەی کەدوامین کەس وەدەردەکەوت زائربرۆخ رۆبووە هەوری کەلوپەلەپیسەکانی نەشتەرگەری ورێیهاڵاند و گوتی

مەگەرئێرەتەماشاخانەیەکەئێوەبۆفیلم هەڵگرتنەوەهاتوون ،سەرتاپای لەشی کابراپیس بوو،بەڵام بێنەوەی قسەیەک بکا لە ژوورەکەچووەدەرێ.

سەرەنجی زائربرۆخ بۆلای فیلم هەڵگرەوەکان چەندساتێ دەسی پێ لەکارەکەی هەڵگرت،لەپاشان دەستیکردەوەبە هونوونی مێشکی نەخۆشەکەبێنەوەی هەست بەتێپەرینی زەمان بکا.

ئەوێ رۆژێ زائربرۆخ دەبوو نەخۆشیکی تریش کەتووشی زامی شێرپەنجەیی مەعیدەببوو،بخاتەبەرعەمەلیات،بەڵام هونوون و دامالینی مێشک ئەوەندەی درێژەکێشاکەدوای کۆتایی کارەکەو پێچانی برینەکەی،ئیترکاتێک بۆعەمەلی دووهەم نەمایەوەوزائر بروخ لەنەخۆشخانەدەرچوو،بەوماشێن (ترومبێل)ەی کەدەوڵەت بەتایبەتی دەخزمەتی نابوو گەرایەوەماڵێ.

لەساڵەکانی هەوەڵی دوای برانەوەی شەری دووهەم،خەڵکی ئاڵمانی رۆژهەڵاتوبەرلینی خۆرهەڵات بەسەختی دەژیان،بەڵام زائربروخ بەئیرنوویی رایدەباردولەو " ڤیلا"یەی دابوو،یانێ نیشتەجێ بوو،لەبەرلینی رۆژ هەڵاتدا یەکێ بوو لەوچەند کەسە دیارانەکەبەئازادی کتێبوگۆڤاری زانستی ئاڵمانی خۆرئاواو وڵات گەلی ئوروپاوئەمریکای دەگەیشتەدەست،لەبەرلینی رۆژهەڵاتا کەس بەقەدەرزائربرۆخ مووچەی نەدەدرایە،چوونکە مانگانەکەی سی هەزار مارکی ئاڵمانی بوو.

بەهەمەحاڵ،لەوێ رۆژێدا ویلفرێد رێهالاندنی هەورێ کەلوپەلی پیسی بەپەرتی زائربرۆخ نەزانی وئەوی بەتوورەیی مامۆستادانا ولەناخی

خۆیداسەلماندی کەنوژداری چازان هەقیەتی، لەحازر بوونی فیلم هەڵگرەوەکان لەژووری عەمەلدا،قەڵس وتوورەبێ.
زۆربەدەگمەن هەڵدەکەوێ ئەونوژدارە خاوەن ئەزموونانەی کە تەمەنێکی دوورودرێژ خەریکی نەشتەرگەری بوونە،خێوی خوو و خدەیەکی تایبەت بەخۆنەبن،ئەوکەسانەی کاریان لەگەڵادەکەن تێدەگەن کەئەوبارو دوخەدەروونیە لەگلاوی وچەپەڵی سروشتیان نیەبەڵکو خوویەکەلەپێشدا بەدووبارە بوونەوەی کاروئەرکەکانی رۆژانەوەبەدی دێ وبەتێپەرینی زەمان دەبێتەبەشێک لە خدەی هەمیشەیی.



رۆژی دواتر ،پیاوێکیان لەهۆدەی عەمەلێ حازرکرد لەبۆنەشتەر گەری،کەدەبوو لوویەکی شێرپەنجەیی لە مەعیدەی دەرێنن.
نەخۆشیەکەی ئەوپیاوەی وەبنی دابوو،پزیشکەکانی نەخۆشخانەدەیانزانی پاشەوەی کەلووی شێرپەنجەییان لەمەعیدەی دەرێنا شیمانەی سەرهەڵدانی لوویەکی دیکەی شێرپەنجەیی لەبەشێکی لەشی نەخۆش داهەیە،بەلام هیواداربوون بەهۆی "کیمیوتراپی"یانی دەکارکردنی دەرمانان،بەرگری لەسەرهەڵدا نەوەی لووی دەنوێ بکەن یا هەتاگەلێک سالان وەدوای بێخن.
لەوێ زەمانی داهێشتا زانستی پزیشکی بۆی هەڵنەهاتبور لەچ کاتێکدایەکەمین خانەی شێرپەنجەیی دەچێتەنێوخوێن.
بەلام ئەمەی دەزانی کەپاش ئەوەی نەخۆشی شێرپەنجە گوورا،لەهەرکاتژمێرێکدا میلیۆنان خانەی شێرپەنجەیی دەچنە

نێوخوێن وگەڕانی خوێن ئەوان بۆسەرتاپای لەش دەباو خاڵێک لەلەش وەگیر ناکەوێ کەخانەی شێرپەنجە بەپێرەوی کردن لە گەرانی خوێن نەیگەیشتبێتێ وهەربەم هۆیەیەکەهیچ خاڵێکی لەش نیەپارێزراوبێ لەنەخۆشی شێرپەنجە.

دەزگای بەرگری لەش،لەخوێن دا،تائەوجێگایەی بۆیان بکرێ خانەکانی شێرپەنجەلەبەین دەبەن،بەڵام ئەگەربۆیان نەکرا هەمووان قڕ بکەن،ئەوبەشەلەخانەکانی شێرپەنجە کەماونەوە، لەشوێنێکی لەشدا جێی خۆ خۆش دەکەن .

تەنیاگەڕانی خوێن نیە کەدەبێتەهەڵگری خانەکانی شێرپەنجە وئەوان دەگوێزێتەوەبۆگشت ئەندامەکانی لەش،بەڵکوهاتوچوی "لەنف =لێنف =لەمف" (جەغەتە یان ئاوی نێو تەنیاوەکان) یش خانەکانی شیرپەنجەبۆبەشەکانی جوراوجوری لەش رادەگوێزێ.

ئەوکاتەی لوویەکی شێرپەنجەیان،بۆنموونە، لەمەعیدە دەرێنا ئیترخانەی تازەلەولووەراناچیتە نێوگەرانی خوێن،کەچی ئەوخانە گەلەی کەبەرلە هەڵبرینی لووی شێرپەنجە لەخوێن یان لەمف دابوونە ولەوێداهەنە،گەرەک بەدەرمانەکیمیاییەکان چارەسەر بکرێن وبنەبرین هەتازاوزێ نەکەن وزیادنەبن ولوو یان لووگەلیتر بەدی بێنن،وئەولووانەش لەتەنراوەساخەکانی لەشدابلەوەرێن وخانە سەلامەتەکانی جەستەبەرەو نەمان بەرن.

## سەرکۆنەکردنی پزیشکانی ئاڵمان لەلایەن زائربرۆخەوە

زائربـرۆخ لـەگـەڵوەی کـەخـۆی بلیمـەتێکـی چـازانی نـەشـتـەرگـەری بـوو،پێی وابـوو نـوژداری لـەکـەمـدەسـەڵاتـی زانـستی پزیـشکیەوە سەریهەڵداوە ودەیگوت جێبەجێ کردنی عەمەلی نوژداری پـێ لێنـان لـــەبێـــدەســـەڵاتـــی زانـــستی پزیـــشکی ولـــەراســـتیدالەلایـــەن دوکتۆرەکانەکەنەیانتوانیوەگشت قایدەوقانوونەکانی کەبەسەر لـەشـی مرۆڤ دا فەرمانرەوایی دەکەن،بدوزنەوە.

تەواوی دوکتۆرەکانی ئاڵمان بەرلەشەری دووهەمی جیهانی لە تانـە وتەشەری زائربرۆخ دڵشکاوبوون،چوونکە ئەونوژدارەمەزنـە، بێئـەوەی دیمانـەوبیرۆکـەی خـۆی دەوشـەی دەنـەرم وەرپێچـێ بـە پزیـشکانی ئاڵمانی دەگوت؛هەرکەسەی بەهەرنەخۆشیەکەوە بمرێ دەبێتـەقـۆچی قوربانی نەزانی ئێوەوبەرپرسی هەرجورە لوویەکی لـەچـارەنـەهـاتووی کەلەلـەشـی هـەرکـەسـێدا دەرسکێ، ئێـوەن.ئـەگـەرمـەرگـی کـەسـان لـەکۆتـایی خوولێـک لـەتـەمـەنداقـسە هـەڵنـەگـرێ هیچکـەس نـابێ بـــەرلـــەوکاتـــەبـــەنـــەخۆشـــی و لـــووی دە بێـــدەرمـــان بمـــرێ چوونکەمحاڵەکەزانستی پزیشکی توانای چارە کردنی گشت نەحۆشـی وزام ولووەکانی لەشی نەبێ ،بەلام ئێوە،بەهۆی تەمەڵـی وتـەوەزەلـی وکەیفهاتن بەکەڵک وەرگرتن لەخۆشیەکانی ژیان،وەخۆناکەون کەهەتا پەی بەهەموو یاساو رێساکانی زانستی پزیشکی ببەن.

ئەودەیگوت من کەنوژدارێکم دەبێ تۆڵەی نەزانیەکانی ئێوەبدەم چوونکەهەڵبرینی ئەندامێک ودەرهاوردنی لوویەک کەئێوە ئەزی پێرادەسپێرن چارەسەرنیە بەڵکو ئەتک کردنی نەخۆشە.

زایربرۆخ نسحەتکارێکی بێ کردەوەنەبوو،هەربەوەندە لێنەدەگەرا پزیشکانی ئاڵمانی بخاتەبەرسەرکۆنەکردن کە لەبۆچی، بۆچارە سەرکردنی ئەونەخۆشیانەی ناودێرن بە:نەخۆشیگەلی لەدەرمان نەهاتگ،وەخۆناکەون تاپەی بەیاساورێساکانی پزیشکی ببەن و بۆ خۆی رچەشکێنی دۆزینەوەی رێگاکانی تازە بۆچارە، سەری نەخۆشیەکان، لەرشتەی خۆی، یانی نەشتەرگەری، دابوو، دا هێنانەکانی ئەومان بۆچارەسەری نەخۆشیان لەپێشداباس کرد. بەڵام هەرئەم نوژدارەمەزنەکەدوکتۆرەکانی ئاڵمانی بە نەزان و تەمەڵ دەژمارد ودەیگوت ئەوان بەدەرکردنی فەرمانی نوژداری خەڵکی ئەتک دەکەن نەک دەرمان،رۆژی دواترلەنەخۆشخانەی بەرلینی رۆژهەلات عەمەلێکی وای لەدەس قەوما کەگشت ئەو کەسانەی لەژووری نەشتەرگەری دابوون هەتاکەوشەنی شێت بوون ماتی و سەرسامی دایگرتن.

لەوێ رۆژێدا،بەرلەوەی زائربرۆخ دەس بکابەعەمەلی نوژداری، چی وای لێ نەهاتە بەرچاو کەبریتی بێ لەپەرتی وپەشێوی هەستگەل.

ئەو،لەدوای هاتنەنەخۆشخانەبەسەرنجێکی ورد دەستەکانی خۆی بەئاوی شیرەوتێن وسابوون ولفکەشووشت،هەرچەندێ کەوەک نوژدارەکانی بەرێ پازدە خولەک بەدەست شووشتنێ وەنەدەبووبەلام دەست شووشتنی ئەوپیاوەقەت لەپێنج خولەک کەمتری

نەدەکێشاولەسابوون لێدانێ زێدەرەوی دەکرد چوونکە دەیزانی سابوون دژمنی میکرۆبانە وئەگەردەمانتوانی مەعیدەو ریخۆڵەکان وجەرگ وسییەکان وئەندامەکانی گرینگی لەش بە ئاو وسابوون بشۆینەوە نەتەنیا قەت نەخۆش نەدەبووین بەڵکو تەمەنی نێوەنجی مرۆڤ لەسەت وپەنجاساڵیش تێدەپەری.

زائیبرۆخ کەروپۆشی نەشتەرگەری کردبوەبەرەخۆ لەپاش، دەس شووشتن دەستەوانەی نوژداری،کەژنێک بەپەنس پێشکەشی کرد،دەدەستان کردوهەنگی ژنەپەرستارەکەدەمبێنی تایبەتی نوژداری،کەبەرگری لەوەی دەکاپشووی نەشتەرگەردەگەڵ زامی نەخۆش تێک بلکێ، لەسەرزاری نوژداربەست وزائیبرۆخ هاتە نێو ژووری عەمەل.

لەژوورێ هەرکەسەی لەجێگای خۆی بوو،پاش ئەوەی زائیبرۆخ هاتەژوورچەندخولەکێک لەبێهۆش کردنی،کابرای کەدەبوو سۆی شێرپەنجەیی لەمەعیدەی دەربێنن، رادەبرد.ساتێک دوای هاتنە ژووری زائیبرۆخ، شوێنی عەمەلەکەیان وەدەرخست ودەرمانی دژەمیکرۆبیان پێداکرد،زائیبرۆخ راپۆرتی بەرپرسی بێهوشی و رادەی لێدانی دڵ ونەبزوباری پشووی نەخۆشی پێدرا وکێردی نەشتەرگەری بەدەستەوەگرت.یاریدەرانی زائیبرۆخ دەیانزانی کەئەولەدەستوبردابالآدەستەچوونکەئەونوژدارەچازان وبلیمەتە دەسپەروەردەی ئەوماموستایانەبووکەبەرلەدەورانی دەرمانی بێهۆشکەر،کێردی نوژداریان بەدەستەوەگرتبوو.لەوچاخ وزەمانی

دادەبوونەشتەرگەرتائەوجێگەیەی وزەوتوانای مرۆڤ بۆی دەلوا، تەردەست بێ.

چوونکەئەونەخۆشەی عەمەلیان دەکردبێهۆش نەدەکرائەگەر تەنیاچرکەیەک لەدرێژەکێشانی ماوەی عەمەل قرتێنرابا،هەربەو رادەیەماوەی دانبەخۆداگرتنی ئازاری نەخۆش کورتتردەکرایەوە.

زائربرۆخ دەستوبرد سکی هەڵدری وئەوەندلەکاری خۆیداشارەزا ومامۆستابوولەیەکەم ساتدالەپاش هەڵەشکاوتنی"پێری توان" و هەنگی مەعیدە،شوێنی لووەکەوەدەرکەوت. (پێریتوان=صفاق ؛ پەرەی دڵ:پەردەیەکی دووتوێ یەوخاوەنی نمدانەوەی تایبەنە لە نێوان هەردووک توێ کەبەئەندامەکانی دەروونی وەنووساوە،ئەو تۆربەیە دوو"مێسودەرمی"هەنەوتوێی هاوسێی ریخۆڵەکانی پێی دەگوترێ "پەرەی ریخۆڵەیێ"وتوێی هاوسێی ماسولکەکانی زگ پێی دەگوترێ"پەرەی دیوارەیی"،صفاق:خێوی چین وگنجی دە زۆرە کەلەدیوارەی ورگ ولەگەنەوە دەس پێدەکا وبەرەوریخۆڵاں شۆر دەبێتەوەوپێیان دەڵێن"گرێ"وبەناوی ئەندامەکان ناودەبرێن؛ وەک گرێی دوانزەگرێ وگرێی مەعیدەوگرێی ...هتد.ف ـ معین .و،ک.

{"صفاق"تۆربەیەکەگشت ناوئاخنی سک،ئەوەی سرووشتیەوجیایە لەناوئاخنی سینگ، لەوێداجێکراوەتەوە،نێوئەم تۆربەیە،لەلەشی مرۆ دا،تەنیاشوێنێکە کەمیکرۆبی تێدانیە،دوکتۆر"ئالێکسی کارێل"ی فەرانسەیی دەیگوت؛نێوەوەی "پێری توان"وەک بەتالایی نێوان ستێران،کەلەوێداسەرمای رەها[۲۷۳پلەی ژێرخاڵ لەگەرماپێوی سەت پلەیی دا]فەرمانرەوایە،پاک وخاوێنە}. و،ف) .

هەردوویاریدەرەکەی زائربرۆخ کەسۆیەکەی شێرپەنجەییان دیت، دەیانزانی؛کەدۆزینەوەی لووی شێرپەنجەلەمەعیدەی نەخۆشداله لایەن نەشتەرگەرەوەبەزەبری یەکەم داوەشاندنی کێرد،کاری هەر تازەکارێک نیەونوژدارانیترلەپاش هەڵەشکاوتنی مەعیدە،ماوەیەک دەگەرێن هەتالووەکەی دەبیننەوە.

بەلام زائربرۆخ لەپاش هەڵدرینی"پێری توان"مەعیدەی لەشوێنێک قەلاشتەوەکەلووەکەلەوێدابوو،بەلام سەرەنجێکی نەدا سۆیەکە و کێردەکەی هەربەودەستوبردە بەرەو ژووروو وبەشی سینگ رۆیی، یاریدەرانی مامۆستا،لەوردبوونەوەی زائربرۆخ لەسینەی نەخۆش سەریان سورما کەچی ورتەیان لەدەم دەرنەهات.کێردی زائربرۆخ بۆشوێنێک خۆی هاویشت کەیاریدەرەکانی نەیاندەدی چوونکە لە ژێرپەراسووەکانی لای سەرووی سندوقی سینەهەڵکەوتبوو،بەلام ورمابوون چوونکەنەیاندەزانی کەمامۆستا چکاری بەوێداوە،دەرێنانی لووی شێرپەنجەیی مەعیدەچ پێوەندی بەسندوقی سینگەوەنەبوو.

چەندساتێک، هەمووی ئەوانەی دەیانتوانی شوێنی عەمەلەکە ببینن،لەبێدەنگی تێکەلاوبەسەرسورمان دا رایانبوارد،لەپرێدیتیان دەستەکەی تری زائربرۆخ رۆیەڵ کرانێو قەفەسەی سینگی نەخۆش ودڵەکەی لەوێ دەرێنا،لەحاڵێکدادڵەکە هێشتا لێیدەداخستیەنێو زبڵدان.

دڵی مرۆڤ بەحەقدەرایەڵی سەرەکی لکێندراوەبەئەندامگەلی تر کەبەشێک لەوپێوەندانە دەمارگەلی سوورو رەش پێکی دێنن.

زێدەلەورایەڵەسەرەکیانە، دڵی مرۆڤ، بەهۆی بەشێک لەرەگەکان پێوەندی دەگەڵ مۆخەوە هەیەوئەم پێوەندانەش لەباری ئەرکگەلی دڵەوەبەشیکن لەرایەڵەسەرەکیەکان،بەلام لەباری بارستاوئەستوور یەوە ناگەنە حەقدە رایەڵەباسکراوەکە، ئەورەگانەی پێوەندی دڵ بە مۆخەوەدەرەخسێنن،زراڤن.

لەبۆئەوەی دڵێکی لەسینگ دەرێنن دەبێ حەقدەپێوەندی سەرەکی ورایەڵەلکێنەرەکانی ناسەرەکی هەڵبڕن،زائربرۆخ لە چەندساتێکی بەربەست وبەوپەڕی دەستوبردەوە تەواوی ئەم پێوەندورایەلانەی هەڵبڕیبوولەحاڵێکداکەبەشێکی ئەم رایەلانەلە سەرەوەی دڵ ولەژێرپەراسووەکان؛ لەوشوێنەی داهەڵکەوتبوون کەئەونەیدەتوانی ئەوێ ببینێ، بەلام بەچەشنێکی وائەندام گەلی لەشی مرۆڤی دەناسی کە کێردەنەشتەرگەریەکەی لەو جێگایانەی کەنەدیاریش بوون وەک ئەوشوێنانەی کەڵکی لەچاو وەردەگرت،دەیبڕی.ئەوکاتەی حازریەکان دڵی نەخۆشیان دەنێو دەستی زائربرۆخ دادیت،لەزۆری واق ورمانی تێکەڵ بەترسەوە، حاڵەتێکی وەک شێتیان بەسەرداهات.دڵی پیاوەکە،دوای وەی بەدەستی زائربرۆخ لەلەشی نەخۆش هاتەدەرێ وهاویژرا نێو زبڵدان،لێیدەداوگیانی تێدامابوو.

## وەبیرهێنانەوەی یەکەم دەرسی توێکاری

دوکتۆر ویلفرێدئەوکاتەی لێدانی ئەودڵەی لەدەرەوەی لەشی نەخۆش دادیت کەوتەوەیادی یەکەم وانەی توێکەری لەخولی خوێندنی

داله‌پۆلی فیزیۆلۆژی (زانستی ئه‌رکه‌کانی کۆئه‌ندامی له‌ش)زانکۆی پزیشکی.
له‌وێ رۆژێداماموستافه‌رمانی پێدابچی له‌"ئه‌کواریۆم"بۆقێک بگرێ وبیهێنێ.
زانکۆی پزیشکی خاوه‌نی چه‌ندین ئه‌کواریۆم وقه‌فه‌زه‌ی جوراو جوربوو بۆبوونه‌وه‌ری بچکۆڵه‌ی وه‌ک مشک وبه‌رازۆکه‌ی هیندی، به‌لام تائه‌وێ رۆژێ ویلفرێدکه‌تازه‌پێی ده‌زانکۆی پزیشکی نابوو، نه‌یده‌زانی که‌خوێندکارده‌بووخۆی بچی مشک یان بۆق بێنێ.
هه‌تا ئه‌وێ رۆژێ ویلفرێد ده‌ستی وه‌بۆقێک نه‌که‌وتبوو چ بگابه وه‌ی بچی بیگرێ وبیهێنیته‌نێوپۆلی ده‌رسێ.
هه‌رده‌تگوت له‌توێڵی نووسراوه که‌ئه‌م خوێندکاره نفره‌تی نه‌بۆق هه‌یه‌هه‌ربه‌وهۆیه‌ش ماموستاله‌نێوگشت خوێندکارانی پۆله‌که‌دا ئه‌وی له‌بۆ هێنانی بۆق هه‌ڵبژارد.
ویلفرێت هه‌وڵی دابه‌سه‌رترس وبێزاری خۆیدا زاڵ بێ ود،ستی ده‌نێوئاوه‌که رۆکردوبۆقێکی گرت،به‌ ورماوی هه‌ستی کردکه‌زۆر نه‌رمه .ئه‌وپێی وانه‌بووکه‌ئه‌وبوونه‌وه‌ره‌دزێوه‌هێنده‌نه‌رم بێ،بۆقه که ئه‌وه‌نده‌نه‌رم ولیچق بووکه‌له‌ده‌ستی خزی،له‌پاش دووجار خزین بۆقه‌که‌ی گرت وله‌ئاوده‌ریهێناوهاوردیه نێوپۆل.
ماموستابۆقه‌که‌ی له‌ویلفرێد وه‌رگرت وبه‌خوێندکارانی گوت ؛ ئێستائێمه‌ده‌مانه‌وێ شێوه‌ی کارکردنی دڵی ئه‌م بۆقه،که‌له‌زۆر بوونه‌وه‌راندا،وه‌چه‌شنی کارکردنی دڵی مرۆڤ ده‌چی،ببینین.
ئه‌مجاربۆقه‌که‌ی بێجووڵه‌له‌سه‌رمێزه‌که‌ته‌خت کردوله‌پاشان له

پشتەوەڕادەرزیەکی دەنووکی کلێنجەی مۆخی بۆقەکەڕۆکردلە بۆئەوەی دەزگای زنجیرە رەگەکانی دەعباکەبێ هەست بکا،لەو کاتیدابۆقەکە وەک ساوایەکی شیرەخۆر زیکەیەکی لێهات،هەتا ئەوی رۆژێ ویلفرێد گوێی لەزیکەی بۆق نەببوو.

ئەولەشەوەکانی هاوین داقیرەی بۆقانی دەبیست ولەروی بۆ چوونەکانی هەرەمەی خەڵکی دەیزانی هەردەنگێک چمانایەک دەبەخشێ.

بەڵام زیکەی بۆقێی نەبیستبوو،ئەوی رۆژێ لەپاش بیستنی زیکەی ئەوگیاندارەگەلێک خەم دایگرت کە لە بۆچی بوونەوەرێکی بێ ئازارئەشکەنجەدەدەن ودەیکوژن.

مامۆستادوای ئەوەی دەرزی دەمۆخی بۆقەکە ڕاکرد گوتی: ئەم دەعبایەئیترهەست بەژان ناکاچوونکینێ ناوەندی هەستەوەری لەکارکەوتوەوئێمەدەتوانین جەستەی ئەم گیاندارەهەڵەشکێوین بێ ئەوەی تووشی ژان و ئازاری بکەین.

هەنگی مامۆستا،بەکێردی نوژداری،جەستەی بچووکی بۆقەی لێک هەڵەشکاوت ودڵەکەی پیشانی خوێندکاران دا هەتا ببینن کەچلۆن لێدەدا.

پاش ئەوەی خوێندکاران لێدانی دڵی ئەوگیانلەبەرەیان لەنێو نەشی دادیت مامۆستابەیەک جووڵەی تیغ ئەودڵەبچکۆڵەی لەلەشی دەعباکەجیاکردەوە وخستیەنێو بادیەک و ویلفرێد بەچاو دیتی دڵەجکۆڵەکەدوای وەی کەلەلەشی بوونەوەرجیا کرایەوە، لە نێوبادیەکەدا،درێژەبەلێدانی خۆی دەدا.

لێدانی دڵی بۆقەکەلەوبادیەدا،لەبۆویلفرێدی قەت شتیوا نەبوو.
لاوی خوێنـدکاربۆچوونی وانـەبووکـەدڵـی گیانلـەبـەرێـک پاشـەوەی کەلـەلـەشـی جیاکرایـەوەوئیترلـەخوێنـەکـەی ڕا خـۆراکی نـەگـەیشتێ ولەرەگەکانی پێرەوی نەکردهەرواذرێژەبەلێدانی خۆی بدا.
دوایەتەماشای کردنەوبادیەی مامۆستادڵەکەی تێهاویشتووە شلەیەکی مـەیلـەوزەردی تێدایـەومامۆسـتاگوتی ئـەم شـلـەیـە بـۆ خـۆراکی ئـەم دڵەدانراوەوهەتانەوکاتەی کەدڵی بۆق بتوانێ لـەم شـلـەیـەبۆخـۆراک و وزەی خۆی کەڵک وەرگرێ درێژەبەلێدانی خۆ دەدا.
پاشـان مامۆسـتادرکاندی:دڵـی مـرۆڤ لـەدوای ئـەوەی کـەلـەلـەش دەرهێنراهەتامـاوەیـەکـی لـەلێـدان ناکـەوێ،لـەحاڵێکداکـەنـەپێـرەنـدی بەدەزگای گەڕانی خوێنەوەهـەیـەونـەبـەرێکخـراوی رەگـەکـانی ـرۆڤ، ئـەگـەردڵـی ئینـسانی لـەپاشـەوەی کـەلـە لـەش جیاکرایـەوە،بخـەنـە نێوشلـەیـەکـی کـەبۆخـۆراکی دڵ بـەکـەڵـک بـێ مـاوەی لێـدانی وی لەدەرەوەی لەش دازیاتردەبێ،هۆیەکەشی ئەمەیـەکـەدڵ،زێـدەلـە وەی کـەدەگـەڵ نـاوەنـدەکـانی رەگـان پێـوەنـدی هـەیـەوفـەرمـان لـەوان وەردەگرێ،خـاوەنـی سیـستەمێکـی سـەربـەخـۆی رەگانیـشە،لـە دوای وەیکەپێوەندی دڵ دەگەڵ ناوەندەکانی رەگەیی لەش پچرا رەگەکـانی سـەربـەخـۆی دڵ درێـژەبـەلێـدانی ئـەم ئـەندامـە بـەهێـزە دەدەن هـەتانـەوسـاتەی کـەبـەهـۆی نـەگـەیـشتنی خـۆراک (خـوێن)بـە ماسوولکەگەلی دڵ، ئەم ئەندامەلەلێدان دەکەوێ و دەمرێ.
ئەوی رۆژێ کەدوکتۆرویلفرێدلێدانی دڵی ئەوپیاوەچارەرەشەی لە نێـو زبڵدانەکەدادی کەوتەوە یادی یەکەم وانەی ئەرکگـەلـی کـۆ ئـەندامی

خۆی لەزانکۆی پزیشکی وهەڵەشکاوتنی جەستەی بۆقەکە لەلایەن مامۆستاکەیەوە .

پاش کارەساتی دەرێنانی دڵ لەسینگی ئەوپیاوە ودەزیڵدان هاویشتنی،کارەساتێکی پڕ مەترسی تریش چاوەنۆڕی ئەو کەسانەی دەکردکەلەژووری عەمەل دابوون وئەویش ئەمەبووکە زائربرۆخ لەسەرجەستەی نەخۆشەکە،کەمردبوو،هەروادرێژەی بەنەشتە،گەری دەدا .

دوای ئەوەی کەزائربرۆخ دڵی ئەوپیاوەی لەسینگی دەرێناو فرێی دا دوور،ماشینی ژیان دەلەشی نەخۆش داراوەستاوگشت ئەندامی لەشی نەخۆش وبەرلەهەموویان مێشک وردە وردە لەبە جێ هێنانی ئەرکەکانیان دەوەستان،چوونکەخانەکانی مێشک ناتوانن پترلەچوارو ئەوپەرەکەی پێنج خولەک نەگەیشتنی خوێن بەخانەکان تەحەمول بکەن،لەدوای ئەوکاتە دەمرن.

وەختێ ژیانی کەسێک کۆتایی دێ لەپێشدامێشکی دەمرێ وهەنگی وردە وردە ئەندامەسەرەکیەکانی تری لەش لەئەرکی ژیانبەخشی خۆرادەوەستن و دەمرن .

بەهۆی مردنی نەخۆش بەرپرسی راگرتنی ژمارەی لێدانی دڵ ونەبزوتەوژمی خوێن وژماردنی پشووان چکاری نەمابوو،لەگەڵ ئەوەشدا ورومات لەجێی خۆی چەقی بوو،ئەگەرزائربرۆخ لێی بپرسیباکەژمارەی لێدانی دڵی نەخۆش چەندەیە بەناچاری دەبو بڵێ؛نەخۆش دڵی نیەهەتادڵەکەی لێبدا.

ئەوانەی کەلەرەوتی عەمەلداچاویان لەنەشتەرگەریەکە دەکرد دیتیان کەدیوارەی مەعیدەوریخۆڵەکانی نەخۆشیش لەجووڵە کەوتن،هەرخوێدکارێکی پزیشکی وکەسانی دیکەی کەلەکاتی نوژداری لەسەرگەدە و ریخۆڵەکان لەژووری عەمەل داحازربوونە دەزانن کەدیوارەی مەعیدەو ریخۆڵەدەجووڵێن وهەتائەورۆژەی کەمرۆڤ زیندووە ئەوجووڵەیەدرێژەی هەیەولەپاش مەرگ،وەکی بزووتن وجووڵەی ئەندامەکانی تری لەش رادەوەستێ.

یاریدەرانی زایربرۆخ وئەوکەسانەی دی کەلەژووری نوژداری دا حازربوونوچاویان بریبوەشوێنی نەشتەرگەری دیتیان کەدیوارەی گەدەوریخۆڵەکانی نەخۆش لەجووڵەکەوتن،کەچی نوژداری چازان ئاگاداری ئەوبارەنەبوو وسەیرئەوەیەکەبۆیەکەمجار،زایربرۆخ کەتەڕدەست وبەتاڵووکە کاری دەکرد،هێوروڵەسەرەخۆ درێژەی دەدا بەکارەکەی.

ویلفرێد کەبەباشی تێگەیشتبوو هەڵبرینی دڵی نەخۆش و کوشتنی لەخەرفاوی مامۆستاوەسەری هەڵداوە،دەیزانی کەلە سەرەخۆ کارکردنی زایربرۆخیش هەرلەپەرتی هەستگەلەوەیە.

زائربرۆخ ئەوەندەلەسەرەخۆدەستی دەبزاوت کەتەنراوەکانی گەرمی لەشی نەخۆش،یان باشترئەوەیە بێژین لەشی مردوو، ساردبوونەوە.کاردانەوەی تەنراوەگەرم وساردەکانی لەش لەژێر دەستی نەشتەرگەردا لێک جیان.

لەلەشی مرۆڤدا تەنراوەی ساردبەدی نایەمەگەرلەدوای مەرگ وتائەوساتەی ئینسان زیندووەگشت ماسوولکەکانی گەرمن.

نەشتەرگەرێک تەنیالەتالاری توێگەری زانکۆی پزیشکی یان لە رێکخراوەی پزیشکی یاسایی دادەگەڵ ماسولکەی ساردی، مرۆ سەروکاری دەبێ چوونکەلەودووتەلارەدالەجەستەی مردوو توێ گەری دەکا،لەجێگاکانی دیکەدا کەدەبێ نەخۆشێک بەعەمەلی نەشتەرگەری چارەسەربکا سەروکاری دەگەڵ ماسولکەگەلی گەرمی مرۆڤە.

نەشتەرگەرێک دەزانێ کەلەکاتی هەڵەشکاوتنی تەرمی مردوویەک تیخی نوژداریەکەی بەشێوەیەکی وا هەڵسورێنێ کە جووڵەکەی دەگەڵ ئەوکاتەی کەلەژووری عەمەل دالەسەر نەخۆشێک کاردەکا،جیاوازی هەبێ.مامۆستاکان بەخوێندکارانی پزیشکی،کەلەپێشدالەتالارەکانی توێگەریدالەسەرتەرمی مردووان کاردەکەن،دەڵێن؛ وریابن ئەوکاتەی کەدەتانەوێ لەشی زیندرویەک بخەنەبەرنەشتەرگەری کێردپێداهێنانەکەتان دەبێ بەشێودیەکی دیکەبێ،وردە وردەنەشتەرگەر،لەجیاکردنەوەی ماسولکەی مردوو لەماسولکەی زیندوو،واکارامە دەبێ کەهەر کاتێ چاوەکانی ببەستن وپێی بڵێن عەمەلێ بکە،هەرکەکێردە کەی داناسەرماسولکەیەک بۆ ئەوەی دەستی وێکەوتبێ تالە گەرمی وساردی ماسولکەوە،مردن یا زیندووبوونەکەی هەست پێبکا،دەزانێ کە هی مردوویە یان هی زیندووی.

## مامۆستا زانی کە نەخۆشەکەی کوشتووە

چوونکە عەمەلی نەشتەرگەری زایربرۆخ درێژەی کێشابوو ئەو نوژدارە مەزنەلەکاردانەوەی ماسولکەکانی مردوو را،لەبن تیخی دا،لەوەعی نائاسایی عەمەل وەئاگاهات وئەو وەئاگاهاتنە،وەک تروسکەیەک لەمێشکی دا درەوشا وپەرتی هەستگەلی رەواندەوە وئاوەزی ئاسایی گەرایەوەسەرجێی خۆی،ئەوکەسانەی لەژووری عەمەلێ بوون دیتیان لەپڕ رەنگی نەشتەرگەری بلیمەت سپی هەڵگەراو کێردەکەی لەدەستی بەربۆوە،ئاخرهەستی کرد نەخۆش لەژێردەستی دامردووە.
هەتائەوی رۆژێ روی نەدابوو نەخۆشێک لەژێردەستی زایربرۆخ دا،لەوکاتانەی وشیاری دا،بمرێ.
لەورۆژەیەوەکەزائربرۆخ گیرۆدەی تێکچوونی ئاوەزوهەستگەل بوو،هەندێ کەس بەهۆی هەڵەکانی وی لە کاتی عەمەلی نەشتەرگەری دامردبوون کەچی خوودی خۆی نەیدەزانی کەبۆتەهۆی مەرگی ئەوان و هەر لەورۆژەیرا کەزائربرۆخ ناوبانگی دەرکردهەتائەوێ رۆژێ روی نەدابووکەنەخۆشێک لەژێرنەشتەرگەری ئەودا،یان لەپاش تەواوبوونی عەمەلێ،گیانی دەرچووبێ وهەرنەخۆشێک کەدەئەوتە بەرعەمەلی نوژداریکردنی چارەسەردەکراوچاک دەبۆوە.
ئەوانەی زایربرۆخیان دەناسی ئەوەندەیان متمانە پێی بووکەسەبارەت بەوی زێدەرەویان دەکردو دەیانگوت "زایربرۆخ"مردووش زیندوو دەکاتەوەوتیخی نەشتەرگەری ئەوپیاوە وەکو"سووری ئیسرائیل"ە.

هەروەکی فیرەی ئەوشەپەوورەمردووان زیندوو دەکاتەوە گێردی نەشتەرگەری زائربرۆخیش مردووەکان دەژێنیتەوە.

زایربرۆخ لەپاش ئەوەی کەزانی کابرای کوشتووە بەچەشنێ خۆی دۆراندکەدوکتۆر ویلفرێد پەرۆشی بوو،لێی نزیک بۆوە،دەستی مامۆستای گرت وگوتی:تکا دەکەم بچۆ بحەسێوە؛پشوویەک بدە.بە ژنە پەرستارێکی گوت بچێتە ژێر باڵی مامۆستا وخۆشی پیلەکەی تری زائربرۆخی گرت ولەژووری نەشتەرگەری بردیە دەرێ و لەهۆدەکەی دیکە لەسەر مۆبڵ داینیشاند وگوتی ئاوی خواردنەوەی بۆ بێنن و بۆخۆی ئاوەکەی بە زاری وەکرد،چوونکینێ زایربرۆخ دەستەوانەی خوێناوی نوژداری دەدەستان دابوو.لە پاشان بەیارمەتی ژنە پەرستارەکە دەستەوانە ورووپۆشی نەشتەرگەری لە بەر دارنی.

بە چەشنێکی وا حاڵ و وەزعی زائربرۆخ شڵەژابوو کەنەیدەتوانی بە شێوەی ئاسایی،لەپاش کۆتایی هاتنی عەمەل بچێتە دەستشۆری ودەست و دەموچاوی بشوا،دوکتۆر ویلفرێد گوتی با تەشت وئاو وسابوونی بۆ بێنن و هەرلەو هۆدەیەدا دەست و دەموچاوی مامۆستا وەشۆن.

شۆفیری زائربرۆخ لەو دەمی دا لەوێ نەبوو هەتا بیباتەوە ماڵێ،بە ترومبیلیکی دیکەدا بەرێیان کردەوە، لەنەخۆشخانەدا وایان بڵاو کردەوە کەحاڵی زائربرۆخ لەپڕ،لەکاتی نەشتەرگەری دا،تێکچوو،تەرمی مردووەکەشیان لە ژووری عەمەلەوە گوێستەوە بۆ ئەو جێگایەی مردووانی تێدا رادەگرن.

ئەرکی ویلفرێدی یاریدەری یەکەمی زائربرۆخ ئەمەبوو کە راپۆرتی روداوەکە بەشیوەیەکی فەرمی بداتە سەرۆکی نەخۆشخانە .بەلآم چوونکە خۆی پێ بەرمنەتی زائربرۆخ بوو، چاوسووری ئەو نوژدارە مەزنە بووە هۆی ئەوەی کە وەبەر تەتەڵەی پاکردنەوە نەکەوێ،لەدانی راپۆرتەکە خۆی پاراست.کەچی بەرپرسی بێهۆشکردن (ئەویش دوکتۆر بوو)روداوەکەی ئەوی رۆژێی بەئاگاداری گەورەگەورەکانی نەخۆشخانە راگەیاندو گوتی شک لەشێتی و خەرفانی زائربرۆخ دا نیە و گەرەکە بە سزای جینایەت (قەتڵ)ی ئەمرۆی بگا و بۆهەمیشە لەدەسەی نەشتەرگەری دەر بکرێ.

لە ئاڵمان کارێک لە زانکۆکانی پزیشکی دا هەبوو کەوێنەی،هەربەو ناوە لەولآتەکانی دیکەی ئوروپا دا نەبووە ونیە،ئەویش کاری راوێژکاری زانکۆی پزیشکیە و شیمان کردەوەکە راوێژکاری پزیشکی ئەرکەکانی چ بوون،ناوی راوێژکاری پزیشکی لە بەرلینی رۆژهەلآتدا دوکتۆر"هاڵ" بوو.

بەرپرسی بێهۆشی لەهۆدەی کاری دوکتۆر هاڵ وەژوورکەوت وبە شڵەژاوی دانیشت.دوکتۆر هاڵ کەوا بەپەشۆکاوی دیتی لەدڵی خۆی دا گوتی دەبێ بۆ کارێکی گرینگ و پەرۆشی هێن هاتبێتە لای،چوونکە بەرپرسی بێهۆشی دوکتۆری پزیشکی بوو و پزیشکان لەکارەکانی خۆیان دا شڵەژاویان بەسەردا نایە مەگەر روداوێکی ناخۆش بقەومێ.بەرپرسی بێهۆشی گوتی هاتووم راپۆرتێکی گرینگت سەبارەت بە"گهێم رات"پێ رابگەیەنم و شکم نیەکە راپۆرتەکەم نارەحەتت دەکا.

"گهێم رات" لەقەمێکی ئاڵمانیە کە مانای وشەبەوشەی دەبێتە "راوێژکاری یەکدڵ"یان"راوێژکاری مەحرەم"،بەلام بۆ رێزلێگرتن بەوکەسانە دەگوترێ کەلەباری زانستەوە لەچاخی خۆدا بێ هاوتان، رەنگە بکرێ"مامۆستای بلیمەت= چازان"لەبەرانبەر "گهێم رات"دا دابندرێ.

دوکتۆر هاڵ پرسی داخوا روداوێک قەوماوە ؟

بەرپرسی بێهۆشی گوتی بۆخۆتان دەزانن کەلەم دواییانەدا زائربرۆخ جارجارە تووشی تێکچوونی هەستگەل دەبێ.

دوکتۆر هاڵ ولامی دایەوە: بەڵێ لەم بابەتە ئاگادارم.

بەرپرسی بێهۆشی هەڵیدایە: بەلام ئەو ئەمرۆ بەمانای پربەپێستی وشە شێت بوو،لەحاڵێکدا کەدەبوو مەعیدەی نەخۆش عەمەل بکا دڵەکەی لەسینگی ئەو کابرا چارە رەشە دەرێنا و توری هەڵدا.

هەنگی بە درێژی چلۆنایەتی دەرێنانی دڵی لەبۆ راوێژکاری زانکۆی پزیشکی گێرایەوە و گوتی زائربرۆخ شێت بووە و ئیتر نابێ رێگای بدرێ بێتە ژووری نەشتەرگەری.

دەگەڵ ئەوەی دوکتۆر هاڵ دەیزانی زائربرۆخ تووشی تێکچوونی هەستگەل بووە لە گوێ بیس بوونی گوتەکانی بەرپرسی بێهۆشی واقی ورما،چوونکە پێش بینی نەدەکرد کە هەواسپەرتی ئەو ذوژدارە مەزنە بگۆرێ بە کردەوەیەکی بەم چەشنە کە شێتی ڕ حاڵ گۆرانێکی راستەقینەیە.

## بۆ دەرمانکردنی زائربرۆخ

دوکتۆر هاڵ سەبارەت بە شێوەکاری زائربرۆخ چەند پرسیاری لەبەرپرسی بێهۆسی کرد وگوتی من لەمەر وەزعی پرۆ‌ێسور زائربرۆخەوە لەگەڵ وەزیری تەندروستی دواوم،بەڵام ئەو گوتی حەیفە بەربەست بخرێتە بەرکارکردنی زائربرۆخ وبەڵکو بکرێ بە دەرمانی"ئێڵ – ئێس- دی"چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە.

دەرمانی"ئێڵ- ئێس- دی"کەئەمرۆ بۆتە یەکێ لە بەڵا هەرە زلەکانی کۆمەڵایەتی،چوونکە دەرمانێکی سڕکەری پڕ مەترسییە،لەبۆوەی دروست نەکرابوو کەوەک هیرۆیین وکۆکایین ومۆرفین ببێتە هۆی کەڵک وەرگرتنی خەراپی گیرۆدەکانی مادە سڕکەرەکان.

کیمیاناسانی ئاڵمانی ئەم دەرمانەیان داهێنا ودروستیان کرد،ناوی"لیزێرک- سائوورە- دیەتی لامید"ە کەناوێکی ئاڵمانیە وپیتەکانی"ئێڵ- ئێس- دی" پیتی هەوەڵی ئەم سێ وشەی ئاڵمانیەن، سەت خۆزگە کیمیازانەکان ئەم دەرمانەیان نەدۆزیبایەوە هەتا ئەمرۆ ببێتە یەکێ لە بەڵاکانی کۆمەڵایەتی بەرەی مرۆڤ.

کیمیا ناسەکان بۆ تەسکین ونۆقرەی ژان ودەردی رەگەکان ئەم دەرمانەیان بەدی هێنابوو."ئێڵ- ئێس دی"دەرمانێکە وەک زاراوەپزیشکی ودەرمانسازیەکان دەڵێن "هالوسی ژێن"ە کەکاردەکاتە سەر مێشک، کەچی زۆر دەعەمەل هێنانی لەمێشک دا بیروخەیاڵی ترسناک بەدی دێنێ.

لەم جورەدەرمانە، کەبە فەرمانی پزیشک رادەی کەمی شیفابەخشە وبەلآم زۆرەکەی زیان دەرە و تەنانەت مەرگ هێن دەبێ،لەپزیشکی دا زۆرن.وەک نموونە دەڵێین؛یەکێ لەم جورە دەرمانانە کە کەم دەکارکردنەکەی شیفا بەخشە و زۆرەکەی مەرگ هێن، "ئیسترکێنین"ە.

پزیشکانی ئاڵمانی لەپاش ئەوەی کە دەرمانی "ئێل- ئێس- دی" بەدیهات،هیوادار بوون کە دەکارکردنی رادەیەکی کەم لەو دەرمانە لەبۆ سوکنایی هاتنی ئازارەکانی رەگەیی و سەرەنجام بۆ گێرانەوەی هۆشمەندی ئەو کەسانەی یادەوەریان لەدەس داوە بەکەڵک بێ،بەلآم مەخابن ئەم دەرمانە لە دوایە بوو بە بەلآی گیانی بنیادەم.

وادیارە پێویست نەبی بە درێژی باس لەوە بکەین کەلەبەرچی لەبەین چوونی یادەوەری دەبێتە هۆی لەنێو چوونی ئاقڵ وهەموو کەس دەزانێ کەگشت کردەوەکانی ئێمە کەلەکاتی وشیاری دا، لەبارەی هاو جسناتی خۆمان وتەنانەت لەبارەی شتە بێ گیانەکانی دەوروبەرمان، جێبەجێی دەکەین بەیارمەتی یادەوەریە. ئاقڵی ئێمە کەدەڵێ نابێ دەس بۆ ئاگر بەرن چوونکی دەسووتێنێ،لەیادەوەری کەڵک وەردەگرێ ،ئەگەر هۆشەکی ئێمە لەبیری نەبێ کە ئاگر سووتێنەرە ئاقڵ سەری لەوەدەرناچێ کەدەبێ رێگە بگرێ لەدەس بۆئاگر بردنی ئێمە. هەربۆیەیە کە منداڵێک دەست لە ئاگر دەدا چوونکینێ لەپێشدا نەیجەرباندووە،یادەوەریەکەی لەبیری نیە کەئاگر سووتێنەرە،بەلآم ئەگەر جارێک دەستی بە ئاگر بسووتێ ئەو

روداوەی دە مێشکی دا دەمێنێتەوە ولەوە پاش ئیتر دەس بە ئاگر نابا.

لەنێو چوونی یادەوەری لەهەرکەسەی دا بارێکی تایبەتی هەیە،هەندێ کەسی واهەن کە یادەوەری خۆیان لەبارەی ئیش وکارەکەیان لەدەس دەدەن کەچی لە بارەکانی ترا وەک هاموشۆ،هەڵس وکەوتی کۆمەلایەتی،سات وسەودا و ...هتد یادەوەریان لەسەر جێی خۆیەتی،هەربۆیە لەم بارانەوە ئاقڵیان بێ نەقوستانی دێتە بەرچاو. زائربرۆخ کەسێ بوو کە یادەوەری کارەکەی لەدەس دابوو ئەویش نەک بەشێوەیەکی هەمیشەیی،لەبارەکانی دیکەدا هۆشەکی بەتەواوی لەسەر جێی خۆی بوو،هەربۆیە بوو کەلەدەرەوەی ژووری نەشتەرگەری شتێکی لێنەدەدیترا کە بەڵگە لەسەر کەمایەسی ئاقڵی بێ.

بەرپرسی بێهۆشی لەدوکتۆر"هاڵ"ی پرسی ئاخۆ"ئێل- ئیس-دی"یان بۆ زائربرۆخ داناوە ؟.

دوکتۆر هاڵ لەولام دا گوتی نا،چوونکە بەرلەدەرمان پێدان دەبێ پێی بلێن کەلەبەر سستی یادەوەری تووشی پەرتی ئاوەزو هەستەگەل بووە وبۆ چارەسەری دەبێ کەڵک لەدەرمانی تازە وەربگرێ و کەسیش ناوێرێ ئەو حەقیقەتە راستەی پێ بلێ.

بەرپرسی بێهۆشی گوتی بەلام دەتوانن بەرگری لەهاتنی بۆ نەخۆشخانە بکەن.

دوکتۆر هاڵ گوتی ئەم کارەش بە من ناکرێ وتەنیا وەزیری تەندرووستی دەتوانی بەرگر بێ لەدرێژەی دانی کاری زائربرۆخ.

لەم کاتە دا دەوڵەتی ئاڵمانی رۆژهەڵات،کەبەرلینی خۆرهەڵات بە پایتەختی وێ دەژمێردرا،تازە پێک هات بوو،وەزیرەکانی ئەو دەوڵەتە،یەکێ لەوان وەزیری تەندرووستی،دەست بەکار ببوون و رێگای ئیداری بەرگرتن لە زائربرۆخ ئەمە بوو کە وەزارەتی تەندرووستی ئاڵمانی رۆژهەڵات تەگەرە بخاتە بەر درێژەدانی کاری نەشتەرگەری وی.

دوکتۆر هاڵ گوتی هەر ئەمرۆ من لەگەڵ وەزیری تەندرووستی پێوەندی دەگرم بۆئەوەی بەرهەڵست بێ لەکاری زائربرۆخ و ئەویش بەوەرگرتنی مووچەی خانەنشینی لەباری گوزەرانەوە خاترجەم دەبێ.

دوکتۆر هاڵ بەپێی ئەو بەڵێنەی بە بەرپرسی بێهۆشی دابوو لەبارەی زائربرۆخەوە دەگەڵ وەزیری تەندرووستی دوا،بەلاّم وەزیری تەندرووستی گوتی من ناتوانم لە بارەی زائربرۆخ دا بەتەنیایی تەما بگرم و گەرەکە ئەنجومەنی وەزیران پێش بەکاری نوژداری وی بگرێ.

بۆ سبەینێ وەزیری تەندرووستی بابەتی زائربرۆخی بە ئاگاداری ئەنجومەنی وەزیران گەیاند،کەچی تەنانەت ئەنجومەنی وەزیرانیش بۆ بەرگرتن لە درێژەی کاری زائربرۆخ پەسند کراوێکی رانەگەیاند جوونکی دەیانزانی دووکەس لە ئەندامانی بەرچاوی "پولیت بورو"یانی دەفتەری سیاسی حیزبی کومونیستی سوڤیەت،نەخۆشی زائربرۆخ بوون وئەو بە سەرکەوتنەوە ئەو دووانەی خستە بەر عەمەلی نەشتەرگەری و سەلامەتی ئەوانی گێرایەوە، یەکێ

لەوان"ئیستالین"ی فەرمانرەوای سۆڤیەت بوو کەپیویستی بە ناساندن نیەو کەسەکەی تریش مارشاڵ"ڤرۆشیلۆف"بوو. مارشاڵ ڤرۆشیلۆف ئەندامی پولیت بۆرو و ئەفسەری پلە بەرزی سپای سووری سۆڤیەت بوو.(پاش مردنی ئیستالین کرایە سەرۆکی شورای بەرزی یەکیەتی کۆمارەکانی سۆڤیەت یانی کرا بەسەرکۆماری ئەو وڵاتە).

ئەو دووکەسە پشتیوان وچاوسووری زائربرۆخ بوون ولەوکاتی دا کەتازە حوکومەتی ئاڵمانی رۆژهەڵات دامەزرابوو نەیدەویست دەست بۆ هیچ کارێک بەرێ پێچەوانەی داخوازەکانی دەوڵەتی سۆڤیەت بێ. کورت وکرمانجی،ئەنجومەنی وەزیرانی ئاڵمانی رۆژهەڵات بریارنامەیەکی وای دەرنەکرد بۆ بەرگرتن لەدرێژەی کاری زائربرۆخ و ئەویان خانەنشین نەکرد.

## دوو روداو لە گێرانەوەی پزشکێکی ئێرانی یا

ئەم بابەتەلەروانگەی نەوەی ئەمرۆ کەئاگاداری بەسەر کەسایەتی زائربرۆخ دانیە سەیر دێتە بەرچاو.ئێمە بۆ ئەوەی پێشان بدەین کەزائربرۆخ لەنیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا چەندە جێگای رێز وخاوەنی تەئسیر بووە،دوو روداوی کەدوکتۆر"حیجازی"پزیشکی ئێرانی،کەماوەی چەندساڵان یاریدەری زائربرۆخ بوو وگێراونیەوە،لێرەدا دەیاننووسینەوە.

روداوی یەکەم پێوەندی هەیە بە عەمەلی نەشتەرگەری سیپەلاکی "جورجی پێنجەم"پادشای ئینگلستان،کەزائربرۆخ بەرلە دەسپێکردنی

شەری دووهەمی جیهانیەوە لەسەر بانگێشتی وی و بۆ عەمەلی چووە بریتانیا.

عەمەلی نەشتەرگەری سیی جورجی پێنجەم بەسەرکەوتنەوە بەدەستی زائربرۆخ ئەنجام درا وپادشای ئینگلیس چارەسەر کرا ولەپاش چاک بوونەوە، زائربرۆخی بۆ خواردنی شێو (شام) لە کۆشکی شاهانەدا، بانگێشتن کرد، هەندێ لەپیاو ماقولانی ئینگلیستانیش بەشداری ئەو دەعوەتە کرابوون.

میوانەکان چەندساتێک پێش جورجی پێنجەم وزائربرۆخ چووبوونە نێو تالاری میوانداری،بەپێی داب ونەریتەکانی تەشریفاتی بەپێوە راوەستابوون هەتا پادشای ئینگلیس دێتە ژووریَ،پادشای ئینگیستان دەگەڵ زائربرۆخ کە میوانیەکەلەسەرخاتری شاناری وی سازدرابوو،هاتنە تالاری میوانداری و هەنگی هەموو دانیشتن، زائربرۆخ بەلای چەپ وراستی دا روانی بەڵام دوکتۆر حیجازی یاریدەرەئێرانیەکەی،کەدەگەڵ خۆی هێنابووە ئینگلستان،نەدیت وبەوخەیاڵەی کەچەند خولەکی دی دێتە ژوور،چاوەرێ مایەوە.کەچی دوکتۆر حیجازی هەرنەهاتە نێو تالار. زائربرۆخ لەجێی خۆی هەستاسەرپێ وگوتی چوونکە دوکتۆر حیجازی بانگ نەکراوە من دەرۆم،دەگەڵ کاسی و ورماوی حازریان بە تایبەت پادشای ئینگلستانێ،لە تالار وەدەرکەوت.

جێی خۆیەتی وەبیر بێنینەوە کەئینگلستانی ئەوی رۆژێ لەگەڵ ئینگلیسی ئەمرۆ گەلێک جیاوازبوو، جورجی پێنجەم پادشای ئینگلستان وئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەکی فرە بەربلاو و خاوەنی شەش

سەت وبيست وپێنج ناوچەو مەملەكەتی ژێردەست لەرۆژهەلاَت وخۆراوای دنيايە بوو بەچەشنێكی وا كە دەيانگوت هەرگيز خۆر لە ئيمپراتۆريەتی بريتانيا ئاوا نابێ، مەجليسی ميوانداری فەرمی پادشای ئينگليس و ئيمپراتوری بريتانيا تەشريفاتێكی هەبوو كە موويەموو جێبەجێ دەكرا، لەگەڵوەشرا زائربرۆخ بەحاڵەتێكی نارازيانە شێو خواردنی بەجێ هێشت ولەتالار وەدەركەوت.

بەفەرمانی پادشای ئينگليستان تكايان لەزائربرۆخ كرد بگەرێتەوە و دەستەوبەجێ بەدوای دوكتۆر حيجازيان دانارد،زائربرۆخ لەدەرەوەی تالاردا ئەوەندە راوەستا هەتا دوكتۆر حيجازی گەيشتێ و لەگەڵ وی چۆوە نێو تەلاری ميوانداری پاشايەتی.

روداوی دووهەم كەلە روی زەمەنيەوە دەكەوێتە دوای روداوی باس كراو،هەر بە گێرانەوەی دوكتۆر حيجازی ياريدەری ئێرانی زائربرۆخ،بەم چەشنەی خوارەوەيە:

دوكتۆر حيجازی دەگێرێتەوە؛ رۆژێك لە"مەتەب"ی زائربرۆخ دانيشتبووم لەپڕ دەرگا كرايەوە و هيتلەر سەروكی خاوەن دەسەلاَتی دەوڵەتی ئاڵمانی نازی هاورێ دەگەڵ جێنشينەكەی،"رۆدولف هێس" و "گوبلێز" وەزيری راگەياندنی ئاڵمان،بەبێ ئاگاداری پێشتر ، لەهۆدەكە وەژوور كەوتن.

من لە وەژوور كەوتنی نەكاوی ئەو سێ كەسە بەتايبەت هيتلەر،واقێكم بردەوە،بەلاَم سيمای زائربرۆخ،بە ديتنی هيتلەر ودوو كەسەكەی تر بچووكترين گۆرانی بەسەر دا نەهات وهەروەك ئەوان سێ نەخۆشی ئاسايی بن و هاتبنە مەتەبەكەی.

پاشەوەی دانیشتن هیتلەر گوتی ئەز لەبەر خاتری هەندێ هاتوومە لای تۆ کە پێم وایە دەبێ بمخەیتە بەر عەمەلی نەشتەرگەری.

زائربرۆخ پرسیاری کرد لەبەرچی وا بیر دەکەیتەوە ؟،هیتلەر گوتی چوونکە ئەمن تووشی شێرپەنجەی قورقورۆچکە بوومە.

زائربرۆخ وەک تەماشای نەخۆشێکی ئاسایی بکا هێور و ئارام گەرووی، هیتلەری لە نێوەوە بە وردی پشکنی وئەودەمی گوتی ئەتۆ شێرپەنجەت نیە و هەنگی ناوی پزیشکێکی نووسی وگوتی ئەم دوکتۆرە پسپۆری ناسیاوی شێرپەنجەی گەروو کرکراکەو ئەوکە وبۆ متمانەی پتر سەرێکیش لەم پزیشکە بدە، بەلآم قرقرۆچکەی تۆم پێ سەلامەتە وپێم وایە نارەحەتی گەرووت خەتای وەیە کە زۆر قسە دەکەی وگەلێک خەریکی وتاردانی.!!

### *زراوچوونی نوژداری چاڵان لە نەخۆشی کوزاز*

شاگردانی زائربرۆخ و یاریدەرەکانی بیرەوەری زۆریان لەماسۆستا هەیە،کەچی تەواوی ئەو کەسانەی لەگەڵ زائربرۆخ لە قۆناخەکانی جوراوجوردا کاریان کردوە یان شاگردی بوونە، لەسەر خاڵێک هاودەنگ و کۆکن، ئەویش ئەمەیە ئەو نوژدارەمەزنە لە ئیش و کاری خۆی دا کەلە هیچ نەدەترسا لەنەخۆشی" کوزاز" هەر تۆقی بوو !.

هۆی زراوچوونی زائربرۆخ لەو نەخۆشیە ئەوە بوو کە بەچاوی خۆی دیبووی باوکی بە دەردی کوزاز مالآوایی لە ژیان کرد.

لەزەمانی منداڵی ئەو نەشتەرگەرە مەزنەدا،کەباوکی بەو نەخۆشیە چوو،هێشتا لەروانگەی گەلێک لە خەڵکی ئوروپا دا نەخۆشی کوزاز بە کەفارەی گوناحان دەژمێردرا وخەڵک بروایان وابوو ئەوکەسەی

تووشی ئەم نەخۆشیە دەبێ بەسەر سووچی زۆر گەورەدا کەوتووە هەر لەبۆیە دەستی سروشت تووشی ئەو سزا سەختەی کردووە هەتاسزای سووچ وتاوانەکانی خۆی بەوپەری دژواریەوە بداتەوە.

ئەو شتەی کەدەبوەهۆی ئەوەی خەڵک لەبارەی نەخۆشێکی کوزاز گرتوو دا بەو شێوەیە بیر بکەنەوە دیتنی دیمەنی ئازارچێشتنی نەخۆشەکە بوو،لەهیچ کام لە نەخۆشیەکانی مرۆڤ دا دیمەنی دەگەڵ ئازار تلانەوەی نەخۆش وەک نەخۆشی کوزاز پەرۆشاوی و ترس بزوێن نیە و تەنانەت دوکتۆرەکان کە بە پێی پێداویستەکانی نەریتی خۆیان عادەتیان بە دیتنی ژان وئازاری نەخۆشان هەیە، ئەوکاتەی نەخۆشێکی کوزازی لەحاڵی تلانەوە بەدەم ئازاردا دەبینن پەرۆشی دایان دەگرێ.

لەنیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەدا کە پزیشکانی ئوروپا دەردو ژانەکانی پەیدابوو بەهۆی نەخۆشیەکانی جوراوجوریان لەباری تەوژمی ئازارچێشتنی نەخۆشەوە چین چین دادەنا گوتیان کە هیچ دەردوژانێک بەسۆتر لە ئازاری نەخۆشی کوزاز نیە. چوونکە لەنەخۆشی کوزاز دا خاڵێک یان بەشێک لە لەشی مرۆڤ نابەشێ بەڵکو حەوسەت ماسولکەی کەلەلەشی مرۆڤ داهەنە هەموو پێکەوە ژان دەکەن ودەچریکێنن.

ژمارەی ماسولکەگەلی لەش پترلە حەوسەتن وهەندێ لەماسولکەکان دابەش دەبن،کەچی لەنەخۆشی کوزازدا تەنانەت ماسولکەی هەرە بچکۆڵەی لەشیش تووشی ئێش دەبێ وبە توندی رێکدێ و رێکهاتنی ماسولکەکان ئەوەندە بەگورە کەلەو ماسولکانەدا کە ژێی دە دیارو

لێک جیایان هەنە،هەر ژێیەی لەباری سەختیەوە وەک تێلێکی پۆڵایی لێ بەسەردێ،ئەم وێکچوواندنە ئەگەرچی دەگەڵ زێدەڕۆیی تێکەڵە بەڵام بەراستی ژێی ماسولکەکان بە توندی دەکێشرێن، چوونکە لەلەشی ئینسان دا، چ لەئەندامەکانی ناوەکی و چ لەئەندامەکانی دەرەکی دا،ئەندامێک نیە کە ماسولکەی نەبێ، نەخۆشی کوزازگرتوو لەگشت ئەندامەکانی دەرەوە و ژوورەوەی لەشی دا تەنانەت لە پێڵووی چاو و چیلکەی گوێچکەشی دا هەست بەژانێکی زۆر بەسۆ دەکا.

زائربرۆخیش قەت دیمەنی نەخۆشی باوکی لەیاد نەچۆوە و هەمیشە وەبیری دێناوە کە ئەو، لەوڕۆژەی ڕا نەخۆش کەوت هەتا ئەو ڕۆژەی کە لێبۆوە ،تەنانەت یەک خولەکیش ئۆقرەی نەگرت و ڕۆژوشەو،هەرلە پێوە تا تۆقی سەر،خۆی دەکردە گلۆڵە،دەست وپێ وگەردن وپشت وکەمەر وبەرپشتێنی بێ نێوەبڕ هەڵدەلەرزین و هەندێ جار نوزەی لێ دەبڕا،زائربرۆخ لەپاش ئەوەی گەورە بوو تێگەیی کە ڕەق بوون و ڕێکهاتنی ماسولکەکانی قرقرۆچکە دەبوونە بەربەست لەوەی کە باوکی هاوار بکا یان بناڵێنێ.

دووساڵ پاش مەرگی باوکی زائربرۆخ پزیشکێکی ئاڵمانی بە ناوی"نیکولێر"لەدوای دەساڵ بە دواداچوون لە تاقیگە بچکۆڵەکەی خۆی لەیەکێ لە گوندەکانی ئاڵمان دا میکرۆبی نەخۆشی کوزازی،کە بەشکڵێکی درێژووکەی وەک دەنکە شەمچەیەک باریک بوو،دۆزیەوە.

لەوڕۆژەی ڕا کە"پاستور"ی فەرانسەیی میکرۆبی دۆزیەوە و دەریخست کەهۆکاری زوربەی نەخۆشیەکان میکرۆبە،توێژەکانی

جوراوجـوری میکرۆبان،بـەپێـی شـکڵەکانیان،نـاوی تایبـەتـی جـوری خۆیـان پێـدرا ونـەوناوانـە بوونـە نێونـەتـەوەیـی، ئـەمـرۆ لـەهـەمـوو جێگایەک ناوی جورەکانی میکرۆبان یەک نـاوە. گشت میکرۆبـە خـڕ وهێلکـەییـەکـان بـەنـاوی"کـوک"دەناسـن ونـاوی جـوری میکرۆبـە درێژەکان"باسیل"ە کـەلـەوشـەی لاتینـی باسـیل بـەمانـای داردەسـتی درێژوباریک وەرگیراوە وناوی گشت میکرۆبەکانی کە وەهێشووی تـریێ دەچن"ئیستافیلۆکوک"ە، وەرگیراولە وشـەی یونـانی"ئیستافیلێ"یـانی هێشووی تریێ،تەواوی ئەو میکرۆبانەی کەوەک ئاڵقەی زنجیر بـەدووی یەکدا قەتارەیان بەستوە"ئیسترێپ توکوک"یان پێداگوتریێ کـەلـەدوو وشەی یونانی "ئیسترێپ توس" و"کوکـوس"وەرگیـراوە وهـەردووکیـان بە مانـای لیزگـەیـەک لـەشـتی دە خرۆکـە دێـن ولـەزمـانی ئاخـاوتنی یونانی دا واتای زنجیرە دەبەخشێ.

ئەومیکرۆبـەی کـە نیکـولێر ی پزیـشکی ئاڵمـانیش دۆزیـەوە"بٰاسـیل" یانی میکرۆبی درێژوکە بوو.

ئەگەر"نیکولێر" پزنشکێکی شـارەیـی بایـە ولـەشـاراندا دوکتۆرایـەتـی کردبـا رەنـگ بـوو نـەیتوانیبـا میکرۆبـی نـەخۆشـی کـوزاز بدۆزێتـەوە کەئەمرۆ بـەنـاوی خـۆی، نـاودێرە بـەمیکرۆبـی نیکـولێر.بـەڵام ئـەولـە لادێکان دوکتۆرایەتی دەکرد ودەیدی لەدێهاتیەکان پترلە شارەیـەکـان تووشی نەخۆشی کوزاز دەبن.

دوکتۆر نیکولێر لەدوای دەساڵ توێژینەوە میکرۆبی نەخۆشی کـوزازی لـە پـەینـی ئـاژەڵـی دا کـەگوندنـشینەکـان کـەڵکیـان لێـوەردەگـرتن،

دۆزیەوە و زانی کەمیکرۆبی کوزاز لەپەینی وڵاخی بەرزەو گاو پەز دا دەژی ولەرێگای ئەو پەین وپاڵەدا دەچێتە نیو قوڵایی زەوی.
ئەمە یەکەم قۆناخی دوزینەوەی دوکتۆر نیکولێر بوو لەپاشان درێژەی بە لێکۆڵینەوەدا هەتا هەڵبیبێنێ کە میکرۆبی نەخۆشی کوزاز چلۆن کاردەکا. داخوا وەک میکرۆبی نەخۆشی ئەسپەک لەرێگای دەم وزارەوە دێتە نێو لەشی مرۆڤ یان وەک میکرۆبی نەخۆشی ئازارەباریکە بەهۆی هەوا ولەرێگای هەناسەکێشانڕا دچێتە نێو لەش.
گەلێک ساڵان دواتر دوکتۆر نیکولێر سەبارەت بە شێوەی کاڕکردنی میکرۆبی کوزاز خەریکی لێکۆڵینەوە بوو،سەرەنجام تێگەیشت کەرێگای چوونەژوورەوەی میکرۆبی کوزاز بۆ لەشی مرۆڤ لەدەرگای برینەوەیە، ئەگەر دەست یان لاق یان هەرجێگایەکی لەشی مرۆڤ زامداربێ و میکرۆبی کوزاز لەوشوێنەی کە ئینسانی لێ بریندداربووە هەبێ لەرێگای ئەو زامەوە دەچێتە نێو لەشی مرۆڤەوە.
جائەوجار دوکتۆر نیکولێر توێژینەوەی لەسەر ئەوەی کرد تا بزانێ میکرۆبی کوزاز پاشەوەی چووە نێو لەشی مرۆڤ چلۆن کاردەکا،ئاکامی لێکۆڵینەوەکە بوو بەئەوە میکرۆبی کوزاز کە هاتەنێولەش بەرەو رەگەکان دەبزوێ و لەوێ جێی خۆی خۆش دەکا،چوونکە گەرمای لەشی مرۆڤ سی وحەوت پلەیە و بۆ گەشەکردنی ئەومیکرۆبە لەبارە دەس دەکابە زاوزێ و زیاددەکا.
شێوەی زیاد کردنی میکرۆبی کوزاز بەم چەشنەیە کە دووکاتژمێر پاش هاتنەنێو لەشەوە لەت دەبێ و هەرلەتەی دەبێ بەمیکرۆبێکی تەواو،ئەو دوومیکرۆبە تەواوەش لەت دەبن وئەو لەتکانەش دەبنە

میکرۆبی کامڵ. گۆڕانی میکرۆبێکی کوزاز بە دوو میکرۆب لە جیلی یەکەمدا دووکاتژمێری پێدەچێ بەڵام جیلی دووهەم لەماوەیەکی کەمتردا وەسەر جیلی سێهەم دەگەڕێ و جیلی چوارەم لەماوەیەکی کورتتر دا لەجیلی سێهەم دەگووڕێ،بەهەر نیسبەتێکی کە جیلە نوێیەکان دەرسکێن ماوەی رسکانیان کورتتر دەبێتەوە لە جیلەکەی پێش خۆیان بە چەشنێکی ئەوتۆ کەلەپاش چەندرۆژان گووڕانی جیلی میکرۆبی دە کوزازێ لەجیاتی دوو کاتژمێر هەتا چارێکەسەعاتێک کەم دەبێتەوە.

ئەگەر رێکخراوەی بەرگری لەش بتوانن لەکاتژمیری یەکەمی هاتنەژوورەوەی میکرۆبی کوزازێ قڕیان بکەن ئەوەمەترسیەک لەسەر ئینسان نامێنێ.بەڵام ئەگەر توانای جووقەوار بڕینی میکرۆبەکانیان نەبێ، چوونکە ئەوان بە تاڵووکە زیاد دەکەن و لەرەگەکانی لەشدا،بێجگەلە ناوەندی گشتی رەگەکان یانی مێشک، خۆیان مەڵاس داوە دەس بە تێکدەری دەکەن،چوونکە لە هەموو لەشی مرۆڤدا رەگێک نیە کە میکرۆبەکانی کوزازی تێنەچووبێ ماسولکەیەک گیر ناکەوێ کەبەهۆی کاری تێکدەرانەی میکرۆبەکانی کوزاز تووشی، رێک هاتن نەیێ. هەرلەبەر هەندێیە کەنەخۆش لەگشت ماسولکەکانی لەشیدا، چ ماسولکەی ئەندامەکانی دەرەکی و چ ئەندامگەلی ناوەکی ،هەست بەژان وئازاری لە حەجمین نەهاتوو دەکا.

تەنانەت ئەمرۆش پزیشکان بۆ دەرمانی نەخۆشی کوزاز دەوایەکیان نیە بەڵام دەتوانن بەهۆی "ڤاکسێن" پێش بە سەرهەڵدانی نەخۆشی کوزاز بگرن.

هەروەکی دەزانین ئەوکاتەی کەسێک بەهۆی روداوێکەوە،بۆوێنە پێکدادانێک،بریندار دەبێ پزیشکان زێدەلە دەواودەرمانی ئاسایی، لەبەر ئیحتیاتێ،"ئینژکسیۆن"ێکی کوزازیشی لەبۆ دادەنێن هەتا لە دەمارەکانی بدرێ،ئەم ئینژکسیۆنە ڤاکسێنی پێشگیری لەنەخۆشی کوزازێ نیە بەڵکو "سرۆم"ە ولەگەڵ ڤاکسێن جیاوازی هەیە.

ڤاکسەنی پێشگیری لەنەخۆشی کوزازی ئەوکاتەی کە مرۆڤ سەلامەتە،لەماوەیەکی دیاریکراودا،لێی دەدەن.بۆ بەرگرتن لە کوزاز سێ ڤاکسەن لێدەدرێ کە مەوداو نێوانی هەرکامیان مانگێک دیاری کراوە و لەپاشان لەش لەبەرانبەر هێرشی میکرۆبی کوزازدا تا پێنج ساڵان پارێزراو دەبێ و ئەگەر لەدوا ساڵێک (لەسەرەتای ساڵی شەشەم) ئینژکسیۆنێک لەجوری ڤاکسێنەکە لەخۆ بدەن و هەنگی لەپاش هەر پێنج ساڵان جارێک،لەخۆدانی ئەو ئینژکسیۆنە هەرلەجوری خۆی لێبدەنەوە،لەش هەتا کۆتایی تەمەن لە بەرانبەر مەترسی نەخۆشی کوزاز پارێزراوە.بەڵام لەپاش زامدار بوون "سرۆم" لێدەدرێ ونەوەش بەم هۆیەیەکە لە خولەکی یەکەمی هاتنەژوورەوەی میکرۆبی کوزاز بۆنێولەش رێ لە زیادبوون وبڵاو بوونەوەیان بگرێ و نەیەڵێ بەسەر رەگەکان وەربن و لەوێدا بمێننەوە.

زائربرۆخ لەپاشەوەی کە ئاگاداری بەسەر تایبەتمەندیەکانی نەخۆشی کوزازدا پەیدا کرد وزانی کە ئەو میکرۆبە لە رێگای رەگەکانەوە کاری خۆی دەکا وئەوژان وئازارەی کەدوای هێرشی کوزاز لەماسولکەی لەش دا بەدی دێن لەرەگانەوەیە کەوتە ئەوبیرەی کە بە عەمەلی نەشتەرگەری نەخۆشی کوزاز چارەسەر بکا.ئەو ئەندیشەیە لە

نـــوژداری چازانـــدا بـــەدی هـــات کـــە کـــوزازیش وەک شـــێرپەنجـــە نەخۆشیەکی بێ دەرمانە و تیخی نەشتەرگەری هەمیشە لەسەرشتێک وەخۆ دەکەوێ کە نەکرێ بەدەرمان نەخۆشـیەکـە چـارەسـەربکـرێ و لەئاکامدا رەنگە بکرێ کوزازیش بە نەشتەرگەری دەرمان بێ .

ژمارەی ئەو رەگانەی لەلـەشـی مـرۆڤ دا هـەنـە زیـاتر لـە یـەکسەت هەزار رەگی گەورەو گچکە دەبن،نزیکە بەرانبەری بکـەن دەگـەڵ ئـەو سـیمانەی بـۆ ماڵـەکـانی شـارێک بـۆ گواسـتنەوەی ئـەلـەکتریـک راکێـشراون.بـەڵام هـەر وەکـو لـەشـارێکی گـەورەدا بـە پاڵـدانی کلیلێک،لەناوەندی بەرقی شاردا، دەکـرێ لـەچـوونی کـارەبـا بۆ نێـو ماڵـەکـان بـەرگـری بکـرێ لـەلـەشـی مـرۆڤیش دا،بـەدەسـتێوەردان دەناوەندی رەگەکان کەمێشکە دەکرێ رەگەکـان لـەلانـی بـەدیهێنـانی ژانـەوە لـەکـار بخـرێن.لـەلـەشـی هـەمـوو کـەس دا دوو جـورە رەگ هەنە،یەکیان رەگی هەستیار کـە ژان و ئـازارێ هـەسـت پێدەکـەن و ئەوی دیکە رەگەبزوێنەکانن کە ئەندامەکانی لەش دەخەنەجووڵە.ئـەم ئەندیشەوبیرە لە زائربرۆخ دا بەدی هاتبوو کـەهـەرگـا بکـرێ بـەهـۆی عەمەلی نەشتەرگەری لەمێشکدا رەگـە هـەسـتیارەکـان لـەکـار بخـرێن ژانـی پـەیـدابوو لـەنـەخۆشـی کـوزاز کـە پزیـشکان ئـەوی بـە توندودژوارترین ژان دەزانن و هەروەها دەردو سۆیەکانی تـر لـەبـەیـن دەچن،هەڵبەتە راست بەراستی ئـەوەش لـەپـاش عـەمـەل،کـابرا ئیتـر هەست کردنی گەرمی وساردی ونەرمی وزبریشی لەدەس دەچێ.

بەڵام ئاخۆ لەپاش ئەوەی بە عەمەلێکی رولـەسـەرکـەوتـن لـەمێشک دا،رەگـەهـەسـتیارەکانیـان لـەکـار خـستن تـەنینـەوەی نـەخۆشـیەکـە

رادەوەستێ وئاخۆ ئـەو میکرۆبانـەی کـە لـەرەگـەکانـدا جێـی خۆیـان خۆش کردووە لەبەین دەچن و کاری تێکدەرانەی ئەوان درێژەی نـابێ ؟. وڵامـی ئـەم دوو پرسـیارە نـەرێیـە،چوونکـە لـەدوای ئـەوەی کەرەگەهـەستیارەکـان لـەکارکـەوتـن میکرۆبـەکانی کـوزازێ هـەرلـەو جێگایـەی دا مـەنزڵیـان گرتـووە دەمێننـەوەو درێـژە بـەکـرداری تێکدەرانەی خۆیان دەدەن .

بەڵام زائربرۆخ پێی وابوو کەلەپاش ئەوەی رەگەهەستیارەکان لـەکار کەوتن وئیتر نەخۆشی کوزاز گرتوو هەستی بە ژانەکانی سەخـت ولـە ئارام نەهاتوونەکرد، رێکخستەی بەرگری لـەشـی دەکـەوێتـەوە کـار و میکرۆبەکان قڕ دەکا.

بەشێک لەو ئەندیشەی زائربرۆخ راسـت بـوو وئـەمـرۆش راسـتبەکـەی جێگای جەخـت کردنـەوەی پزیشکانە چوونکـە ژان وئێـشی بـەسفت وسۆ نایەڵێ پێکهاتەی بەرگری لەش بەباشی کار بکا.گـەلێـک کـەس بـەهـۆی درێـژەکێشانی ژان ئێـشتیای خـۆ لـەدەس دەدەن و ناشـێن خۆراک بخۆن، لەبۆ بریـنان ئـەو کاتـەی ژان زۆروسـەختـە زام سـارێژ نـابێ. زائربـرۆخیش پێـی وابـوو دوای ئـەوەی کـە ئێـشە بـەسـۆکانی نەخۆشی کوزاز گرتوو لەنێوچوون لەشی بەپەلە"ئـانتی کـور"دروست دەکا وئـانتی کـور میکرۆبـەکـانی کـوزازێ قـڕ دەکـا."ئـانتی کـور"کـە بـەزمـانی ئینگلیـسی پێـی دەڵـێن"ئـانتی بـادی" زاراوەیـەکـی نێـو نەتەوەیی پزیشکی و فیزیۆلوژی "ئەرکگەلی کۆئەندام"ە، ئـانتی کـور لەلەشی مرۆڤ دا ئامرازی هەرە بەهێزی دەرکردنی میکرۆبە.

لە دواى ئەوەى كە دەرمانگەلى"ئانتى بيوتيك"،كەسەرقافلەيان"پنى سيلين"بوو،كەوتنە گەڕ،خەڵك پێيان وابوو،هەندێ باوەڕيان وابوو، كەئەو دەرمانانە قاتڵى ميكرۆبانن. بێخەبەر لەوەى كە هيچكام لەدەرمانەكانى ئانتى بيوتيك بۆخۆيان كوشندەى ميكرۆبان نين بەڵكو دەبوون و دەبنە هۆ كەلەلەشى مرۆڤدا ئانتى كور بە هێزوگوڕ بكرێ وميكرۆب لەبەين بەرێ.هەروەكو گۆڤارى ساينس (زانست) ئورگانى فەرمى يەكيەتى زانايانى لايەنگرى گەشەسەندنى زانست لە ئەمريكا دانووسيويە؛ لەسەدەى بيستەم دا چوار ئامرازى پزيشكى ژيانبەحش يان چوار"نوشداروو" لەدنيادا بەدى هاتن كە يارمەتيەكى شوێن دانەرو جێگەپەسنيان بە لەشساخى رەگەزى مرۆڤ كرد، يەكێ ئەوان چواران دەرمانگەلى ئانتى بيوتيكە و نكوڵى لەوە ناكرێ لەورۆژەى ڕا كە دەرمانەكانى ئانتى بيوتيك كەوتوونەتە ژێر كەڵك وەرگرتنى پزيشكان سەتان ميليون كەس لە سونگەى ئەو دەرمانانە درێژە بەژيان دەدەن.

بەڵام زائربرۆخ دەيزانى لەدواى ئەوەى كە رەگەهەستيارەكانى لەش لەكاركەوتن ئيتر ناكرێ ئەو رەگانە بخرێنەوە گەڕ،چوونكە پاشەوەى رەگ هەڵبرا ناشێ دوو جەمسەرى هەڵبراو تێك خرێتەوە،لەناوەندى گشتى رەگەكانيش كە مێشكە لەدواى وەى كە رەگەهەستيارەكان لەكار خران چوونكينێ ناچار بەشێك هەڵدەبردرێ، ناكرێ تازە ئەو بەشە بژێندرێتەوە.

هەرلەبۆيە،دەگەڵ وەى كەهەرگيز بيرى دەرمانكردنى كوزاز بەهۆى عەمەلى نەشتەرگەرى زائربرۆخى بەر نەدا،ئەو ئەنديشەكەى خۆى

لەتەواوی ئەو ماوەیەی دا کە بێوەی و ئاقڵی لەسەرەخۆبوو نەگەیاندە قۆناخی جێبەجێ کردن.

### زائربرۆخ پێی خۆش نەبوو چاوەڕوان سەبارەت بە وی بکرێ

ئەوانەی کەدەگەڵ زائربرۆخ کاریان کردووە دەڵێن کەئەو پیاوە بێجگەلەو ئەندیشە نەگۆرانە ،لەژیانی کۆمەڵایەتیدا،سەلیقەیەکی هەمیشەیی هەبوو،ئەویش خۆبواردن لەپروپاگەندەو چاوڕاو لەبارەی خۆی دابوو.

لەوڵاتی ئاڵمانێ دا هیچ دوکتۆرێک ڕێگەی نەدرابوو و بۆی نیەکەسەبارەت بەخۆی پروپاگەندە بکا،یان بە قەڵەمی ئەونەخۆشانەی کەچارەسەری کردوون خۆ بخاتە سەرزاروزمانان،لەو وڵاتەدا بۆناسیاوی پزیشک یان نەشتەرگەرێک تەنیا شتێک ڕێگای پێدراوە ئەویش ئەوەیە کە ناو وجوری پسپۆری وژمارەتەلەفۆنی خۆی لەسەر تابلۆیەک بنووسێ ولەسەردەرگای مەتەبەکەی هەڵاوەسێ.

"گوبلێز"ی وەزیری راگەیاندنی ئاڵمان لەچاخی دەسەڵاتداری "هیتلەر"دا،بەرنامەیەکی بۆ رادیۆئاڵمان هەبوو لەژێرناوی"ناساندنی گەورە پیاوانی هاوچەرخی ئاڵمان"،هەندێ لەپزیشکانی ئاڵمانی کە پێوەندیەکی راستەوخۆیان لەگەڵ گوبلێزدا نەبوو خۆیان دەماڵەزۆرکەس داویشت تاکو بەشکەم گوبلێز ناوو سەرگورشتەو،وەک دەڵێن بیوگرافی،ئەوانیش لەوبەرنامەیەدا جێ

بکاتەوە هەتا ناوبانگ پەیدابکەن. کەچی زائربرۆخ لەگەڵوەی کەچەند جاریش چوونە لای هەرگیز رازی نەبوو ناوی لەرادیۆ بڵاوبکێتەوە وژیان نامەکەی باس بکریٚ،هەتا ئەورۆژەی کە زیندوو بوو ئیزنی نەدا کەگۆڤارو رۆژنامەکانی ئالْمان پێی هەڵبڵێن ولەهیچ کۆنگرەیەکی زانستی،لەشێوەی ئەوکۆنگرانەی کە هەموو ساڵێ لە ئوروپادا سەبارەت بەبابەتەکانی پزیشکی و نوژداری دەبەسرێن،بەشداری نەدەکرد مەگەر ئەوەی کەلەو کۆنگرەیەدا سەبارەت بە مەبەستێکی گرینگی نەشتەرگەری،کە پێی وابایە قازانجی بۆگشت لایەک دەبێ،راپۆرتی دابا.

رۆژێک گوبلێز وەزیری راگەیاندنی ئالْمانی نازی چووە دیدەنی زائربرۆخ و پێی گوت ئێوە لەشانازیەکانی نەتەوەی ئالْمانن و ئەوەی کە ناتەوێ لەگەورەپیاوانی هاوچەرخی ئالْمان بناسێندرێی بە بۆچوونی من سووچێکی نەتەوایەتیە . ئیزن بدە کەئێمە بە بەرنامەیەکی درێژ کەبۆماوەی چەند حەوتوو بەهۆی رادیۆ بڵاو دەبێتەوە بۆ رێزگرتن لەنەتەوەی ئالْمانی کە مەزنەپیاوێکی ئاوای پێشکەش بە دنیاکردووە (نەک بۆ رێزگرتن لەجەنابت کە دەزانین حەوجێی ئەوە نی) ئێوە بناسێنین.

بەڵام زائربرۆخ کەپیاوێکی رەپ وراست بوو،گوتی: جەنابی وەزیری راگەیاندن،من گۆرانی بێژ یان هونەرپیشەی رادیۆ و سینەما نیم کەدەتەوێ"لانسێ"م بکەی،پێداگری گوبلێز کاری لەو نەشتەرگەرە مەزنە نەکرد ورازی نەبوو کە لەرادیۆی ئالْماندا ئەوی وەک یەکێ لە گەورەپیاوانی ئالْمان بناسێنن.

هەرچونێ بێ،پێشتر گوتمان کەچلۆن زائربرۆخ لەحاڵێکدا کەخەریکی نەشتەرگەری بوو دڵی نەخۆشێکی لەسینگی هێنادەرو دەزبڵدانی هاویشت وئەو دوکتۆرەی کە بەرپرسی بێهۆشی بوو روداوەکەی، وەک راپۆرتێک راگەیاند،کەچی بەرپرسانی سەروو گوێیان نەدایە. وەزیری تەندروستی ئاڵمانی رۆژهەڵاتیش، کەبەگوتەی دوکتۆر"هاڵ"گوتبووی؛دەکرێ بەدەرمانی"ئێڵ - ئێس دی" چارەسەری زائربرۆخ بکەین،چکارێکی بۆ عیلاجی نەکرد. گوتیشمان کەئەو دەرمانە لەپێشدا بۆ دەکارکردنی کەم وەک هەندێ لە ژارەکان کە بۆ چارەسەری دۆزرابۆوە چلۆن وەک بەلایەکی ماڵوێران کەر کەوتە ویزەی لاوان وشکست ولەنێوچوونی فرەی بەسەردا سەپاندن. بەرپرسانی پلەبەرزی ئاڵمانی رۆژهەڵاتیش لەولانەیەوەکە پشتوانیان لێ دەکرد ونەدەشیان کەسێکی کەجێگەپشتیوانی وچاوسووری خۆیان بوو پشتی تێبکەن،بەتایبەت کەزائربرۆخیان دەناسی وبەوبیرەی کە رەنگە رۆژێک بۆ چارەسەری حەوجێی دەستی بن،ئەوراپۆرتانەشیان بە ئێرەیی رەقیبەکانی دەزانی.

## عەمەلی نەشتەرگەری بۆ: دەرێنانی رایەڵەی شێرپەنجە

ماوەیەک رابرد و خاتوونێکی ئاڵمانی بەناوی"فراتین" لەبەرئەوەی کە لوویەکی لەپشتی دابوو بەپێی بەباش زانینی پزیشکان دەبوو بخرێتە بەر عەمەلی نەشتەرگەری و لووەکەی لە پشتێ دەربێنن.

هەرگا ناوی شێرپەنجە دێ خەڵکی ئاسایی کە ئاگاداریەکی ئەوتۆیان لەنەخۆشیەکەنیە،وایان بە زەین دادێ کەلەهەموو شوێنێ لەکاتی سەرهەڵدانی شێرپەنجە لوویەکیش بەدی دێ کە خڕە .لەحاڵێکدا کە تەنراوەی شێرپەنجەیی رەنگە نە خڕ بێ و نە هێلکەیی ولاچ،بەلاّم چوونکە لە برێک لەئەندامی لەشدا تەنراوەی شێرپەنجەیی لەسەر شکڵی خڕ و هێلکەیی دەبێ (پتر لە جەرگ و سیی دا بەم شکڵە دەبێ) لە قەدیمەوە پزیشکانی ئوروپایی تەنراوەی شێرپەنبەیان بەناوی لووی شێرپەنجەیی ناو بردووە، لەحاڵێکدا کە هەندێ جار تەنراوەی شێرپەنجەیی بەشکڵی لووی خر یان هێلکەیی دەرناکەوێ بەڵکو وەک قرژاڵێک،بە چەنگاڵی دە زۆرەوە،خۆبلاّو دەکاتەوە و هەرلەبەرهەندێشە کەئەم نەخۆشیەیان بەناوی "سەرەتان" یانی قرژاڵ،ناودێر کردووە.

تەنراوە شێرپەنجەیەکەی فراتین خانم لەپشتی دا وەک قرژاڵێک خۆی بلاّو کردبووە،لەسەرەوەڕا تا خوارێ و لەراستەوە تاچەپ بەشێکی پشتی داگرتبوو،پزیشکان ئەوکاتەی تەنراوەی شێرپەنجەیی بەر بلاّوی ئەو ژنەیان دی پێیان سەیر نەبوو کەبۆچی خاتوو فراتین زووتر هەڵنەستاوە بە چارەسەر کردنی وبۆ عیلاجی نەخۆشیەکەی ئەوەندە وەدرەنگ خستووە هەتا ئەو جێگایەی کە تان وپۆی شێرپەنجەکەی هێندە بەربلاّو بێتەوە.

چوونکە تەنراوەی شێرپەنجەیی لەدوای ئەوەی کە دروست بوو هەتا ماوەیەکی ژانی نیە،هەرئەوەش دەبێتە هۆ کەئەوانەی گرفتاری ئەم نەخۆشیە بوونە ئاگادار نەبنەوە کە تووشی نەخۆشیەکی تووش

ودژوار هاتوون. ئەگەر کەسێکی کە گرفتاری سەرەتان دەبێ لەرۆژەکانی هەوەڵی تووشبوونی ئاگادار بێتەوە کە تووشی ئەو نەخۆشیە بووە دەکەوێتە بیری چارەسەر کردنی، ئەغڵەب نەخۆشی شێرپەنجە لەسەرەتاوە دەشێ دەرمان بکرێ. بەڵام دوو شت دەبنەهۆ کە تووشبووی ئەم نەخۆشیە نەکەوێتە خۆ بۆ چارەکردن؛ یەکەم ئەوەیە کە هەست بە هیچ ئێش و ئازارێک ناکا، دووهەم ئەوەیە کە جاری وایە نەخۆشی شێرپەنجە لەهەندێ شوێنی لەش دێ کە نەخۆش ناشێ شکڵەکەی ببینێ.

ئەگەر تەنراوەی نەخۆشی شێرپەنجەیی یان بە زمانی ساکارتر لووی شێرپەنجە لەسەر روی لەش وەک سینگ،سک،ران،بەلەک یان دەست بێ ،تووشبووی نەخۆشیەکە لووەکە دەبینێ و وەخۆ دەکەوێ بۆ دەرمان وچارەسەر کردنی ، بەڵام ئەوکاتەی لووی شێرپەنجە لەجەرگ یان سیی یان پانکراس یان لەنێو کازەلاکی سار یان لەنێوەراستی ماسولکەیەک دا بەدی دێ و دەگوورێ ئەوکەسەی کە نەخۆش بووە نایبینێ و چوونکە ژانیشی نیە هەر تێناگا کە نەخۆش بووە.

ئەوکاتەی خاتوو فراتین زانی کە دەبێ بخرێتە بەر نەشتەرگەری وبۆ پێشەکی عەمەل وفەرمان وەرگرتن چووە نەخۆشخانەی شاریتی لە بەرلینی رۆژهەڵات گوتی پێی خۆشە پروفیسور زائربرۆخ نەشتەرگەری بۆبکا،ئەم داوایەی رەزامەندی لەسەر دەرکرا.

دوکتۆر ویلفرێد یاریدەری زائربرۆخ لەگەڵوەی کەدەیزانی حاڵی مامۆستای لە باری دەروونی و روحیەوە باش بووە و هیچ شوێنێک

لەپەرتی هەستگەلی تێدا نابینرێ نەیویست کەلەکاتی عەمەلی خاتوو فراتین حازر بێ و پەشێوی مەزاجی کردە بیانوو. بەڵام دوکتۆر "مادلینێر"ی یاریدەری زائربرۆخ لەو رۆژەی کە خاتوو فراتین دەبوو عەمەل بکرێ لەژووری نەشتەرگەری دا حازربوو.

هیچ بەرپرسێکی پایە بەرزی فەرمی بەرگری لەدرێژەدانی کاری زائربرۆخ لەنەخۆشخانە نەکرد و سەرۆکی نەخۆشخانەش بەرهەڵستی نەکرد، بەڵام دواتر گوترا بەرهەڵستی نەکردنی سەرۆکی نەخۆشخانە لەبەر نێرەیی کردن بووە و ئەو سەبارەت بە زائربرۆخ ئێرەیی دەنواند و چوونکە دەیزانی کە لە هیچ رێگایەکەوە ناتوانێ ئاگری ئێرەیی بردنی خۆی لەبارەی ویدا دامرکێنێ هیوای وابوو زائربرۆخ هەڵەی لەدەست بقەومێ هەتا بۆ هەمیشە رێگە لەدرێژە دانی کاری بگیرێ.

پروفیسور زائربرۆخ ئەو وەختەی چاوێکی بەبەرنامەی عەمەلی نەشتەرگەری خاتوو فراتین دا خشاند نە لەحازر نەبوونی یاریدەری خۆی دوکتۆر ویلفرێد هەڵبەزیەوە و نەلەخۆ بواردنی بەرپرسی بێهۆشی، کە ئەویش بیانوویەکی هێنابۆوە هەتا لەکاتی نەشتەرگەری دا حازر نەبێ،چوونکە زۆرجار رویدەدا کەدوکتۆرەکان بەهۆی چوونەسەفەر و بەشداری کردن لەکۆنگرە گەلی زانستی ویان لەبەر نەخۆشی کاری خۆیان بەشێوەی کاتی بەکەسانی تر دەسپارد

دوکتۆر ویلفرێد هەرکە گوێ بیس بوو زائربرۆخ رازی بوونی خۆی دەگەڵ بەرنامەی نەشتەرگەری خاتوو فراتین راگەیاندووە تێگەبی کە دیسان تووشی تێکچوونی ئاوەزگەل بۆتەوە.

لەپاش روداوە ترسێنەرەکەی ئەو رۆژەی کە زائربرۆخ دڵی نەخۆشەکەی لەسینە دەرێنا خستیە نێو ستڵی زبڵی و هەنگی کێردی نەشتەرگەری لەدەستی بەربۆوە و رەنگی بزرکا و دوکتۆر ویلفرێد گەیاندیەوە ماڵێ و چەند رۆژان نەچۆوە نەخۆشخانە،خوودی ئەو پیاوە دەبوو بیزانیبا کە بێ ئیرادە خەراپە کاریەکی هەژێنەری لە دەستی قەوماوە، ئیتر نەدەبوو تیغی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێتەوە،ئێستا کە دەیەوێ عەمەل بکاتەوە دیاری دەدا کە سەرلەنوێ حاڵی تێکچووەتەوە کەئەو قەوماوەی نایەتەوە یاد.

ئەورۆژەی کەدەبوو خاتوو فراتین بخرێتە بەر عەمەلی نەشتەرگەری زائربرۆخ لە کاتژمێری دیاری کراودا هاتە نەخۆشخانە، بەرواڵەت بەهەستگەل و هۆشی کامڵەوە،لەبۆ عەمەلێ حازر بوو.

ئەو بە وردی دەستەکانی شوشت و بە یارمەتی یەکێ لەژنە پەرستارەکان روپۆشی نەشتەرگەری دەبەر و دەستەوانەی دە دەستان کرد. نەخۆشیان بەرلە هاتنە ژووری زائربرۆخ بۆ ژووری عەمەلێ لەسەر تەختی حازر کردبوو.

ئەوێ رۆژێ حەوت کەس لەو ژوورەدا حازربوون کە سێ کەسیان پیاو و ئەوانی دیکە ژن بوون.پیاوەکان بێجگەلە زائربرۆخ دوکتۆر مادلینێری یاریدەری دووهەمی مامۆستا ودوکتۆر "سرایدʺی بەرپرسی بێهۆشی بوون.

هەروەک باسمان کرد تەنراوەشێرپەنجەییەکەی خاتوو فراتین لەپشتی دا هاتبوو، بۆئەوەی کە بتوانن تان وپۆ سەرەتانیەکەی لەپشتی دەربێنن دەبوو لەسەر چاو درێژی بکەن،ئەوکاتەی

نەخۆشێک لەسەر زگ دەخەوێنن چاوەدێری لەسەر پشوو خواردنەوە و هەناسە دانی دژوار دەبێ. بەلام پروفیسور زائربرۆخ لەبۆ چاوەدێری بەسەر پشوو خواردنەوەی ئەو جورە نەخۆشانەدا شێوەیەکی تایبەتی داهێنا کەنەخۆش دەشیا بە هاسانی هەناسە بکێشێ و هەروەها دەشیتوانی بەسەر پشووخواردنەوە و ایدانی دلێدا چاوەدێری بکا و لە مەودای دیاریکراودا رادەی تەوژمی خوێنی رابگرێ.

زائربرۆخ ژمارەی پشوودان و ژمارەی لێدانی دل ورادەی تەوژمی خوێنی نەخۆشی لەبەرپرسی بێهۆشی پرسی،دوای ئەوەی ولامی دلخۆشکەری پێدرایەوە دەستی راداشت ویەکێ لەژنە پەرستارەکان کێردی نەشتەرگەری دادەستی و عەمەلی مامۆستای چازانی بلیمەت لەبۆ دەرێنانی تەنراوەی شێرپەنجەیی ژنەنەخۆشەکە دەستی پێکرد.

تانوپۆی شێرپەنجەیی وەک دەست وپێی قرژالێک تەواوی پشتی نەخۆشەکەی داگرتبوو،چاوێکی ئاسایی نەدەشیا ببینێ کەمەودای نێوان تەنراوەی شێرپەنجەیی و تەنراوەی ناسەرەتانی لەپشتی ژنەکەدا لەکوێ دایە. بەلام چاوودەستی زائربرۆخ ئەو مەودایەیان دەدیتەوە و بەوردی چنگورکی تەنراوی شێرپەنجەی لەتەنراوی بێوەی جیا دەکردەوە بەبێ ئەوەی کە کێردەکەی تەنانەت بە قەدەر میلی مەترێک لەسنووری نێوان تەنراوی شێرپەنجەیی و تەنراوی بێوەی دا بچێتە نێو تەنراوەی بێ عەیب.

دەستی راستی پروفیسور زائربرۆخ تیخەکەی پێ بوو و دەستی چەپی کە دەچووە یارمەتی دەستی راستی ئەوەندە بەتوندی

دەجوڵان کە دوکتۆر مادلنێر نەدەپرژا بەدووی کێردەکەدا بڕوا،جووڵە وبزووتنی دوو دەست بەتایبەت دەستی ڕاستی نەشتەرگەری بلیمەت ڕاوەستانی بۆ نەبوو بێجگەلە دوو کات دانەبێ، یەکێ ئەوکاتەی کەوەزعی هەناسە و لێدانی دڵ وتەوژمی خوێنی لەبەرپرسی بێهۆشی دەپرسی و ئەوی دیش ئەوکاتەی کە زائربرۆخ دەیەویست کێردی نەشتەرگەری بگۆرێ و بۆ بڕینی هەندێ شوێن کێردی تر بەدەستەوە بگرێ، مامۆستا کێردی پیسی دە زبڵدان داویشت و یەکێ لەژنەپەرستارەکان تیخێکی دیکەی دەدا دەستی پروفیسور.

شێوەی نەشتەرگەری زائربرۆخ وەک شێوەی نوژدارانی دەورانی کلاسیکی بەرلە دۆزینەوەو دەکارکردنی دەرمانەکانی بێهۆشی بوو،دەتگوت ئەو نەخۆشەی لەسەر تەختی عەمەلێ کەوتووە بێهۆش نەکراوە هۆش و هەستی لەجێی خۆیەتی هەست بە ژان وئازار دەکا،ئەویش دەبێ تا ئەو جێگایەی بۆی دەرەخسێ عەمەلی نەشتەرگەری بەوپەری دەستوبردەوە تەواو بکا هەتا ماوەی ژان و دەردی نەخۆش کورتتر بێتەوە.

دوکتۆر مادلنێر ئەوکاتەی دەستوبردی مامۆستای دەدی،لەناخی خۆی دا ئێرەیی پێدەبرد و ڕەنگە نەیدەزانی پێی لێدەنێ کە ئەو لە خۆی مەزنتر و لەسەرترە، چوونکە ئەو وەختەی ئێمە لەناخی خۆماندا سەبارەت بەکەسێک ئێرەیی دەبەین،چ ئەو ڕاستیە بزانین و چ نەیزانین،پێی لێدەنێین کەئەو لەئێمە لەسەرترو بەرزترە.

ئەوکاتەی هەودایەکی تەنراوەی شێرپەنجەیی لەتەنراوەی سەلامەت جیادەبۆوە مامۆستای مەزن بە کێرد داوەشاندنێک هەڵیدەبڕی و

دەزبڵدانی داویشت،یانی یەکێ لەدەست یان قاچەکانی قرژاڵ دەپەڕی. بەچەشنێکی وا دەستوبردی زائربرۆخ زۆر بوو کە ژنێکی پەرستار بە تەنیا نەدەپرژایە سەر ئەوەی بە تانپۆن خوێنی مەیدانی عەمەلەکە وشک کاتەوە،دوو ژن بەرپرسی سڕینەوەی خوێن بە تانپۆن بوون (تانپۆن= ناوێکی نێو نەتەوەییە، پرێسکە یان باندێکە کە خوێنی شوێنی نەشتەرگەری هەڵدەمژێ و ئەوێ وشک دەکاتەوە،ئەم وشەیە فەرانسەییە ودەنوسرێ"تامپۆن" کەچی دەخوێنرێتەوە"تانپۆن"). ئەو ژنانەی کەبەهۆی تانپۆن جێگەبرینەکەی نەشتەرگەریان وشک دەکردەوە لەکاری خۆدا کارامە وشارەزا بوون،بەچەشنێک تانپۆنەکەیان دێناودەبرد کەپێش بە کێردی مامۆستا نەگرن.

لەدوای ماوەی شێست خولەک تەواوی پەل وپۆی شێرپەنجەیی لەپشتی ژنەکە هێنرانە دەرێ و ئیتر تەنانەت هەودایەکی شێرپەنجەییش لەپشتی ئەو ژنەدا نەمایەوە، دوکتۆر مادلنێر پێی وابوو ئەگەر ئەو عەمەلەیان بەوی ئەسپاردبا لەبۆ دەرکێشانی رەگوریشەکانی سەرەتانی و پاک کردنەوەی تەواوی پشتی نەخۆش، ئەو، پێویستی بە کاتێکی حەوت و رەنگە هەشت کاتژمێری هەبوو.

پروفیسور زائربرۆخ جارێکی دیش وەزعی پشوخواردنەوە ودڵ وپاڵەپەستۆی خوێنی نەخۆشی لەو دوکتۆرەی کە بەرپرسی ببهۆشی بوو پرسی و لەپاشان لەو ژنەی کە کاری وێدانی ئامرازی نەشتەرگەری بوو مشاری داوا کرد. ئەویش بێ ماتڵ بوون مشاری دادەستی مامۆستا.

دوکتۆر مادلنیر ئەوکاتەی گوێی لێبوو زائربرۆخ مشاری دەوێ پێی سەیربوو چوونکی شتێک لەپشتی نەخۆش دا نەبوو کە بڕینەکەی پێویستی بە مشار بێ،عەمەلی نەشتەرگەریش کۆتایی هات بوو،تەنیا دەبوو برینی پشتی نەخۆش بپێچنەوەو بەرێی بکەنە ژووری حەسانەوە.

پروفیسور زائربرۆخ هەرکە مشارەکەی درایە دەستی کرد بە برینەوەی دوو پەراسووی نەخۆش لە پشتەوەڕا.

دوکتۆر مادلینێر دەیزانی تەنراوەی شێرپەنجەیی کە لەپشتی مرۆڤ دا دەگوورێ ریشەکانی لەسنووری پشت تێناپەرێ و بەرەو رو یانی بەرەو سینگ، رەگاژۆیە ناکا. لەگەڵ ئەوەش دا پێی وابوو تان وپۆی شێرپەنجەیی ئەو ژنەی ،بەشێوەیەکی دەگمەن، بەرەو سینەی ریشاژۆی کردووە و ئێستا زائربرۆخ دوو پەراسووی ژنە دەبڕێتەوە هەتا هەودا سەرەتانیەکانی لە سینگی دەرکێشێ.

مامۆستا هەر بەو دەستوبردەی کە تەنراوە سەرەتانیەکانی لەپشتی ژنەکە دەردێنا دوو پەراسووی لە پشتەوەڕا برینەوە بەبێ ئەوەی پەراسووەکان بەتەواوی لە لەش جیا بکاتەوە،بەڵکو لێگەرا سەرێکی پەراسووەکان هەربە جەستەکەوە بمێننەوە، پەراسووەکانی هەڵگێرانەوە وبەسەر لەشەکەدا نووشتاندیەوە.

دوکتۆر مادلینێر گوتی"گێهیم رات" ئاخۆ نابێ کەلوپەلی هەڵەشکاوتنی سینگ حازر کەین ؟

پێشتر گوتمان کە"گیهیم رات" ناو ونیشانی هەرە بەرز بوو کە لە ئاڵمان دا دەدرا بە نەشتەرگەرێک، دوکتۆر مادلینێر لەبەر ئەوەی

گوتی ئاخۆ پێویستە کەلوپەلی هەڵەشکاوتنی سینە بێنن کە هەرکاتێ بە هەرهۆیەک بیانەوێ لە نێو سینگ دا عەمەلێک جێبەجێ بکەن دەبێ ئامرازی وا بکەونە گەڕ هەتا ئەرکی هەناسەدان لەکار نەکەوێ. دەبێ ئەمەش بێژین کە ئەوئامرازو کەلوپەلەش، هەر زائربرۆخ داهێنەریان بوو،چوونکە ئەو بوو کە بۆ یەکەم جار قەوەزەی سینگی هەڵەشکاوت نەشتەرگەری نێو سینەی فێری نوژداران کرد بەبێ ئەوەی نەخۆش بمرێ.

قەفەزەی سینە ناوچەیەکی بەربەست و بە تەواوی داپۆشراوە کە بەشێکی ئەندامی زۆر بە وەجی لەش لەوێ دا هەڵکەوتوون،جووڵەی دیواری قەفەزی سینە یلوەتی پشوو هەڵکێشانێ دەکات. ئەو کاتەی سینە دەکرێتەوەو هەڵدەمسێ هەرتک سی پڕ لەهەوا دەبن وئەووەختەی کە وێک دێتەوەو دەپوچێتەوە هەوا لە سیەکان دێتە دەرێ. زێدەلە هۆکارەکانی دەروونی، تەوژمی هەوای دەوروبەر لە جووڵە و بزووتنی قەفەزەی سینە دا فرە کارایە،بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بەبێ گرێ پشوو هەڵکێشێ گەرەکە زەختی هەوا بەسەر لەش دا هەر ئەوەبێ کە ئێستا لەسەر عەرددا هەیە.

ئەگەر رادەی ئەم پاڵەپەستۆیە زۆر ئاڵوگۆری بەسەر دا بێ مرۆڤ دەخنکێ،یانی هەوای پێویست ناگاتە سییەکانی،هەرلەبەر ئەم مەبەستەیە کەلە فرۆکەکانی نەفەر هەڵگری ئەمرۆیی کەلە بەرزایی سەرێ دا دەفڕن رادەی تەوژمی هەوای نێو ژووری مسافران و فرۆکەوانەکان بەقەدەر هەوای سەر عەرد رادەگرن. چوونکە

لەبەرزاییەکاندا تەوژمی هەوا کەمە و مسافیرو فرۆکەوانەکان لەپێشدا پشوویان سواردەبێ وسەریان دەسوڕێ ولەپاشان دەخنکێن.
لەسەر عەردیش ئەگەر لەکاتی عەمەلی نەشتەرگەری دا سندووقی سینە هەڵەشکێون ئەگەرچی لەرادەی تەوژمی هەوادا سەبارەت بەلەشی مرۆڤ ئاڵوگۆرێک نایەتەدی کەچی بەهۆی لێککرانەوەی سینگ هەوا ناگاتە سیەکان.بەڵام ئەگەر کاژەڵاکی مرۆڤ لەکاتی عەمەلی نەشتەرگەری بقەڵێشنەوە بە چەشنێکی وا کە مۆخ راستەوخۆ بکەوێتە بەر هەوا،هیچ مەترسیەک هەرەشە لە نەخۆش ناکا و خانەکانی مێشک بەهۆی دەمارەکان هەروەک پێشتر خۆراکی خۆی کە ئوکسیژێنە وەردەگرێ. هەر لەبۆیە بووکە نوژدارەکانی کەنی میسرێ دەیانتوانی لە عەمەلەکانی نەشتەرگەری دا کەللەی سەری لێک ئاوەڵا بکەنەوە کەچی بۆیان نەدەکرا لە قەفەزەی سینەدا دەست بۆ عەمەلێکی نەشتەرگەری ببەن، چوونکە نەخۆش ماڵاوایی لە ژیان دەکرد.
ئەو کانەی دوکتۆر مادلینێر بەزائربرۆخی گوت کە ئاخۆ پێویستە کەلوپەی هەڵەشکاوتنی سینگ ئامادە بکەن ئەو پیاوە لە حاڵێک دا کە کێردی نوژداری بە دەستی راستەوە بوو بە ئەنگوستی دەستی چەپ ئامازەی بە سینگی نەخۆش کردو گوتی تەماشاکەن تا لەم راستەوە ئەندامەکانی نێو سینە ببینن.
ئەو دەمی دوکتۆر مادلینێر تێگەیی کە زائربرۆخ جارێکی دیکە تووشی تێکچوونی هەستگەل بۆتەوە.

ئەوەی زائربرۆخ گوتی وتەیەک بوو کە نوژداران بە خوێندکارانیان دەگوت ئەو کاتەی کە لەبۆ فێربوونێ لە تالاری نەشتەرگەری دا حازر دەبوون،هیچ نوژدارێک لە ژووری عەمەلێ و لەکاتی نەشتەرگەری دا ئەو قسەی بە هاوکارانی خۆی نەدەگوت و ناشڵێ.
چوونکە ئەو کەسانەی کە لە ژووری عەمەل دا ئامادە دەبن هەموویان ئاگاداریاله توێگەری هەیە و تەنانەت ژنەکانیش کەلە هۆدەی عەمەل بوون دەیانزانی چ شتێک لەنێو سینگی مرۆڤ دا هەیە و ئەگەر لە پشتەوەڕا لێیان بروانن بە چ شکڵێ خۆ دەنوێنن .
دوکتۆر مادلینێر گوتی "گیهیم رات، ئیزن بفەرموو با ئێمە ئەو پەراسووانە ببەستینەوە." زائربرۆخ کە تەماشای نەخۆشەکەی دەکرد لەدوای بیستنی ئەو قسانە روی دە دوکتۆر مادلینێر کرد وچاوەکانی گرشەیان لێ هەستا و گوراندی ؛کێ ئیزنی بە تۆ داوە خۆ دەکاری من هەڵقورتێنی ؟!
نەشتەرگەری مەزن لە حاڵێک دا ئەم وشانەی دەگوتن بەو کێردە نەشتەرگەریەی بە دەستی بوو هێرشی کردە دوکتۆر مادلینێ
مادلینێر بە لەز خۆی کێشاوە و وەک بۆکسۆرەکان دەڵێن خۆی لادا،زائربرۆخ خۆی پێرانەوەستا و بەسەر ئەو مێزە دا کە نەخۆشەکەیان لەسەر درێژ کردبوو لاترەی برد و تخێل بوو،چاویلکەکەی شکا،هەستاوە دیسان هەڵکوتێتەوە سەر مادلینێر بەڵام ئەو بە یارمەتی بەرپرسی بێهۆشی ،کە نەخۆشەکەی جارێ بە جێ هەشتبوو،و دوو کەس لە ژنە پەرستارەکان زائربرۆخیان لە ژووری عەمەل بردە دەرێ،لەهۆدەکەی تردا زائربرۆخ خۆی

رادەپسەکاند هەتا لەبەردەستیان دەربازبێ،گورەو دادوهاواری وی بووەهۆی ئەوەی کە هێندێک لەکارگێرانی نەخۆشخانە بەرو ئەو هۆدەیە راکەن.

دوکتۆر مادلینێر بە کارمەندەکانی نەخۆشخانەی گوت کە هاتبوونە یارمەتی،ئێوە مەیەڵن بێتەوە بۆ ژووری عەمەلێ هەتا ئێمە بە هاواری ژنە نەخۆشەکە رابگەین و لەمردن نەجاتی بدەین.

دوکتۆر مادلینێر و بەرپرسی بێهۆشی و ژنەپەرستارەکان گەرانەوە ژووری عەمەل و دوو پەراسووەکەی نەخۆشە شێرپەنجەگرتووەکەیان لەسەر جێی خۆ دانایەوە و زامەکەیان پێچایەوە و ناردیانە هۆدەی سانەوە کەچی لەگەڵوەی نەشتەرگەری پاکردنەوەی تان وپۆ شێرپەنجەیەکەی پشتی ژنەکە بە سەرکەوتنەوە جێبەجێ کرابوو بەهۆی ئەو بەڵایەی کە برینەوەی پەراسوو بەسەر نەخۆشەکەی هێنابوو ماڵاوایی لە ژیان کرد.

رووداوەکەی ئەوێ رۆژێ رویدا لەپیاوێکی وەک زائربرۆخ ،کە لە سەرخۆی و هێمنیەکەی لە نەشتەرگەریەکان دا سەرمەشقی نوژدارانی لاو و تەنانەت هەندێ لە نوژدارانی بە ساڵداچووش بوو، فرە سەیر دەهاتە بەرچاو، ئەوێ رۆژێ دوکتۆر مادلینێر و دوکتۆر سراید ، بەرپرسی بێهۆشی ،پێیان وابوو کە زائربرۆخی دەبێ بنێرنە شێتخانەی چوونکە شێتێکی بە راستیە.

لە رابردوودا زۆرجاران رویدا کە ئەو پیاو وژنانەی لەژووری عەمەل دا هاریکاری زائربرۆخ بوون لە دیتنی حاڵی نەخۆش سڵەمیونەوە شک براو بوونە کە نەخۆشەکە دەمرێ، لەوکاتانە دا تەنیا کەسێک هێورو

لە سەرەخۆ بووە،ئەویش زائیربرۆخ بووە کە بەبێ سەرنج ١٠ان بە ترس و لەرزی هاریکارەکانی درێژەی بە نەشتەرگەری دەدا و هیچ رووداوێکی چاوەروان نەکراو لەسەرەخۆیی ئەو پیاوەی نەدەشلەقاند و هەست و هۆشی رانەدەچڵەکاند و پەرتی نەدەکرد. زۆرجاران، ئەو کاتانەی کە زائیربرۆخ خەریکی عەمەلێکی دەبوو بەهۆی باوبۆران لەدەرەوە برووسکی داویشت و هەور دەیگرماند و باران وەک گۆزەی سەرەوژێر لە عاسمان هەڵدەرژا بێ ئەوەی زائیربرۆخ تەنانەت یەک جاریش سەر هەڵبڕێ و چاوێک لەپەنجەرە بکا و سەیرێکی وەزعی دەرەوە بکا.

بەو پێودانە دەشێین هەڵیسەنگێنین ئەوانەی لەوێ رۆژێ دا، لەژووری عەمەلێ، هێرش کردنی زائیربرۆخیان بۆ سەر دوکتۆر مادلینێر دیت و گوراندنەکەیان گوێ لێبوو دووچاری چ رادەیەک سەرسوڕمان بوون .

## داهێنانێکی نوێ بۆ داماڵینی دڵی راوەستاو

لەمێژووی ژیانی کاری زائیربرۆخ دا هەندێ دیاردەی وا کە سەلمێنەری لەسەرەخۆیی لەرادەبەدەری وی لە وەتاغی عەمەل دا بن ،زۆرن.لێرەدا تەنیا یەکێکیان بگێرینەوە بەسە،چوونکە ئەو دیاردەیە لە مێژووی عەمەلەکانی نەشتەرگەری دا تۆمار کرا وبووە سەرچاوەوشێوازێکی نوێ لەعەمەلیاتەکانی نوژداری دڵ و لەدوای

زائربرۆخیش نوژدارانی تر لەکاتی پێویست دا لەو شێوازە کەڵکیان وەرگرت و ئەمرۆش لێی بەهرەمەند دەبن.

لەپاش ئەوەی زائربرۆخ بۆ یەکەم جار نەشتەرگەری لە سەر دڵ داهێنا،کۆمەڵێک لە نوژدارانی ئوروپا و ئەمریکا،نەتەنیا حەزیان کرد بەڵکو تاسەبار بوون کە لەکاتی نەشتەرگەری زائربرۆخ لەسەر دڵ حازر بن و ببینن کە ئەو مامۆستایە چ دەکا.

لەو زەمانی دا هێشتا تەلەڤیزیۆن دانەکەوتبوو هەتاکو نوژداران، نەشتەرگەری زائربرۆخ لەسەر پەنجەرەی تەلەڤیزیۆنێکی شەبەکە بەسراو یان ئاوالاوە ببینن و بۆ دیتنی عەمەلی نەشتەرگەری ناچار بوون کە لە تالاری عەمەل دا حازر بن و لە نزیکەوە تەماشای ئەو عەمەلە بکەن،چوونکە ژمارەی ئەو نوژدارانەی کەبۆ تەماشای عەمەلی زائربرۆخ ئامادە دەبوون زۆر بوو (دوکتۆر حیجازی یاریدەری ئێرانی زائربرۆخ گوتویە کە ژمارەیان دەگەیشتە پێنج سەت کەس )تالارێکی "ئامفی تیاتر"یان بۆ جێگای نەشتەرگەری دیاری کرد. دەزانین کە ئامفی تیاتر تالارێکی خڕە کە جێگە دانیشتنەکەی پلەپلەیەو بە دوای یەکتردا هەڵخراون هەر بۆیەیە کە گشت ئەو کەسانەی لەو تالارەدا حازر دەبن دەتوانن نێوەراستی تالارەکە ببینن.

لەنێو ئەو نوژدارانەی کە لە رۆژی عەمەلێ لەو ئامفی تیاترە دا حازر بوون نەشتەرگەرانی ئەمریکاییش هەبوون کە بۆ دیتنی عەمەلێ لە ئەمریکاوە هاتبوون ،چوونکە ئامفی تیاتر گەورەو بەربلاو بوو

زوربەیان بە دووربینەوە دەهاتن هەتا بتوانن باشتر شانۆی نەشتەرگەری تەماشا بکەن .

لەوێ رۆژێ دا بلیندگۆیان لەو ئامفی تیاترەی دا دانا کەلەو دەمی دا شتێکی تازە بوو، راپۆرتی کارگێرانی پزیشکی کە هاریکاری زائیربرۆخ بوون و شتیان پێرادەگەیاند بەهۆی بڵێندگۆ بە ئاگاداری ئامادە بووان رادەگەیەندرا.

ئەو دەمەی عەمەلی نەشتەرگەری دەسپێکرا بەچەشنێ بێدەنگی بەسەر ئەو ئامفی تیاترە دا زاڵ بوو کە دەتگوت ئەو هۆڵە کەسی تێدا نیە، تەنیا ئەو راپۆرتانە دەبیسران کە دەدرانە زائیربرۆخ ،دەزانین کە ئەو راپۆرتانە پێوەندیان هەبوو بە وەزعی دڵ و هەناسە هەڵکێشانی نەخۆش کە بێهۆشیان کردبوو.

زائیربرۆخ بە پێی عادەت و وەرەی خۆی هەر سەرنجی لەبەسەر دەوروبەری نەبوو و تەنیا شوێنی عەمەلی نەشتەرگەری دەدی و لەو دەمەی را کە عەمەل دەستی پێکرد تەنانەت جارێکیش ئاوڕێکی نەدایەوە کە حەشیمەتی حازر لە تالار دا ببینێ ،لە نێو بێدەنگی ئامفی تیاتر کە لە دەنگی بڵێندگۆ بەولاوە ئەگەر باڵندەیەک تێیدا فڕیبا هاشەی باڵانی دەبیسرا،لەناکاو ئەو پزیشکەی کە بەرپرسی وەزعی نەخۆش بوو گوتی لێدانی دڵ راوەستاوە، دەنگی وی بەهۆی بڵێندگۆ گەیشتە بەر گوێی گشت ئەو کەسانەی کە لە ئامفی تیاترەکە دابوون .

هۆی لەکاروەستانی دڵ، کە ترومپای سەرەکی و ناوەندیە بۆ گەیاندنی خوێن بە بەشەکانی جوراوجوری لەش ،ئەمەیە کە لە پاش

ماوەیەکی کورت،بەشێک لەخانەکانی لەش کەلە بەرانبەر نەخواردنی خۆراک هەستیارترلە خانەکانی ترن، خۆراک (یانی خوێن) یان ناگاتێ و دەمرن.

بێجگەلە تورومپای سەرەکی لەشی مرۆڤ ،هەندێ پومپی تریش بۆ گەیاندنی خوێن بە گشت ئەندامەکان هەنە،دیواری هەر شادەمارێک ،لەسەرانسەری لەش دا، بە شێوەیەکی هەمیشەیی رێک دێ و لێک دەبێتەوە و مەبەست لەو جوولە تورومپاییە ئەوەیە کە خوێن لەشادەماردا ببزوێ و بگاتە دەمارە موویەکان، کە بەشێکی بچکۆلەن لە شادەماروبەهۆی ئەو دەمارە زراوانە خانەکان خۆراک وەرگرن، خڕۆکەی خوێن کە گەیشتنە خانەکان،هەروەکی دایک مەمکۆڵە دەزاری منال دەنێ مەمیلە دەخاتە دەمی خانەکان هەتا خۆراک بخۆن. دەگەڵ ئەوەی کە لەلەشی مرۆڤ دا بۆ گەیشتنی خوێن بە بەشەکانی جوراوجوری لەش پۆمپگەلێ هەن هەرکە تورومپای سەرەکی لەکار کەوت پۆمپەکانی تریش رادەوەستن و خوێن بە شادەمارەکان دا ناروا هەتا بگاتە دەمارە وردەکان و لەوانرا بەهۆی وردیلەکانی خوێن مەمکۆڵە دەزاری خانەکان بندرێ، زۆر ناخایەنێ کە بەر لە هەمووان، هەستیارترین خانەکانی لەشی مرۆڤ ،کەخانەی مێشکن، لەبرسان دەمرن.

ئەوکاتەی نوژدارانی حازر لە ئامفی تیاترەکە ئاگادار بوون کە دلی نەخۆش، لە لێدان کەوتووە، پێشبینیان کرد کە هەتا چەند خولەکی تر یەکەمین نیشانەی مەرگ کە مردنی خانەکانی مێشکە لە نەخۆش دا وەدەر دەکەوێ.

کابرای کە ئەو سەربردە راستەی گێرایەوە دەیگوت کە: لەنێو ئەوان دا هەندێ کەسی وا هەبوون بە بێستنی هەواڵی راوەستانی دڵی نەخۆش رازی و کەیف خۆش بوون، چوونکە لەکار کەوتنی دڵی نەخۆش دەلیل لەسەر ئەمە بوو کە زائربرۆخ لە عەمەلی خۆی دا، کە ئەوەندەی لە دنیای پزیشکی دا دەنگ دابۆوە، شکستی بەسەر دا هاتووە .

ئەوی رۆژێ لە نێو ئەو کەسانەی کە خوازیاری شکست هێنانی زائربرۆخ بوون تەنیا یەک دانەشیان نەبوو کە سەرکەوتنی خۆی،یانی تێک شکانی زائربرۆخ، بە مسۆگەر نەزانێ چوونکە دەیزانی راوەستانی دڵ دەگەڵ مەرگی نەخۆش یەکسانە. بڕێک لەوانە دووربینەکانیان،کەهەتا ئەو دەمی زەق دەشوێنی عەمەلەکەیان بڕی بوو، شۆر کردەوە و ئامادەبوون تا دوای راگەیاندنی مەرگی نەخۆشەکە هەستنە سەرپێ و لە تالاری ئامفی تیاتر وەدەرکەون ،بەو متمانەوە کە دڵ شوێنێکی لەدەست تێوەردان نەهاتووی نەشتەرگەریە و هەرگیز نەخراوەتە بەر نەشتەرگەری و ناشخرێتە بەر،بگەرێنەوە دەرمانگاکانی خۆیان.

هەرکەسێکی دیکە لە جێگای زائربرۆخ بایەو لەو مەجلیسە کەورەی ئەزموون دا دیبای و گوێی لێبا کە دڵی نەخۆش لە لێدان کەوت دەخەجلا و دەیزانی کە لەو حاڵەدا بە هیچ دەرمانێکی بە هێز ناکرێ دڵی راوەستاو بخرێتەوە لێدان.چوونکە دەرمان ،وەختێکی لە لەش دا تەئسیر دەکا کە خوێن لە گەڕ دابێ، گەڕانی خوێن دەرمان

بگەیێنێتە ئەو بەشانەی کە دەبێ بیانگاتێ و ئەگەر دڵ راوەستا و خوێن لە گەڕ کەوت دەکار کردنی دەرمان بێ کەڵکە.

بەڵام زائربرۆخ هیچ سەری لێنەشێوا و هەروەکی سێوێک یان هەرمێیەک بەدەستەوە دەگرن، دڵی نەخۆشەکەی بەدەستەوە گرت،بەچەشنێ کە بە لەپی دەست و قامکەکانی دەمستی گرت و دەستی بە هەڵپشاوتن ،یا باشتر وایە بێژین داماڵین و ماساژ، کرد. بەڵام نەک بە بێ شێوازێکی تایبەت، بەڵکو بە جورێک دڵەکەی، رێک دەگوشی کە گوشاری دەستی لەسەر دڵەکە راست وەک ئەو گوشارە بێ کە جووڵەی ئاسایی دڵ پێکی دێنێ، هەروەکو دڵ لە هەر خولەکێک دا حەفتا و دوو جار لێدەدا،زائربرۆخیش حەفتاو دوو جاری هەڵدەپشاوت و لەدوای هەر هەڵگوشینێک بەری دەدا هەتا گوشارەکەی وەک رێک هاتن و لێک ئاوالابوونەوەی ئاسایی دڵ بێ.

لەهیچ کام لە بەڵگەنامەکانی پزیشکی و نوژداری کەون دا باس نەکراوە کە بەر لە زائربرۆخ هیچ کەسێک دڵی بە داماڵین و هەڵپشاوتن خستبێتەوە جووڵە،لەبەر ئەوە زائربرۆخ یەکەم کەس بوو لە مێژووی نەشتەرگەری دنیا دا کە ئەم داهێنانەی بە دەستەوە هات.

ماوەی سێ خولەک لەنێو بێدەنگی رەهای تالاری ئامفی تیاتردا زائربرۆخ خەریکی هەڵپشاوتنی دڵی نەخۆشەکە بوو، لەپاش ئەو سێ خولەکەی کە دڵەکەی هەڵدەپشاوت هەستی بە زیندوو بوونەوەی دڵەکە کرد، دەستی لێک کردەوە و دڵەکەی ئازاد کرد،دەنگی ئەو

دوکتۆرەی کە بەرپرسی حاڵ و وەزعی نەخۆشەکە بوو لە بلێنگۆ بەرزبۆوە و گوتی: دڵی نەخۆش کەوتۆتەوە لێدان.
ئەگەر هاتبا و دڵی کابرای نەخۆش خولەکێک یان ئەو پەرەکەی دوو خولەکی تر نەکەوتباوە لێدان خانەکانی مێشکی بەهۆی پێرانەکەیشتنی خۆراک دەمردن و ئیتر زائربرۆخ بۆی نەدەکرا ئەو نەخۆشە زیندوو بکاتەوە. چوونکە ئەوی زەمانی خانەگەلی مێشک پێنج خولەک دوای لەگەڕ کەوتنی خوێن دەمردن، ئەم ماوەیەئەمرۆ بە تیکنیکی نوێی نوژداری نەختێک پتر درێژ کراوەتەوە و خانەکانی مێشک هەتا هەشت خولەک و بە دیمانە و رای هەندێ لە نەشتەرگەران تا دە خولەک دوای لە گەڕ کەوتنی خوێن زیندوو رادەگیرێن ،بەڵام پاش ئەو ماوەیە مەرگی ئەوان حەتمی یەو هیچ هێزێکی زانستی و تیکنیکی بۆی ناکرێ رێگە لەمەرگی ئێگجارەکی نەخۆش بگرێ.
داهێنانی ئەو رۆژەی زائربرۆخ کە بووە هۆی ئەوەی دڵی نەخۆش بکەوێتەوە لێدان، بە سەرکەوتنی عەمەلی نەشتەرگەری زائربرۆخ دوایی هات، ئەو داهێنانەش، لە حزووری هەڵکەوتەکانی نوژداری دنیادا، لەنەشتەرگەری دا، بوو بە سەرچاوە و دەسپێکی شێوازێکی نوێی دەرمان و چارەسەری کردن،هەتا ئەمرۆش لەکاتی پێویست دا لەلایەن نوژدارانەوە کەڵکی لێوەردەگیرێ و رەچاو دەکرێ، سا لەوێ رۆژێ دا زائربرۆخ لەسەرەخۆیی و نەشەمزانی خۆی ، بەچەشنێکی واکە دەنگ دانەوەی جیهانی لێ پەیدا بوو، سەلماند.

لەنەشتەرگەری دا ئەمرۆ داماڵینی دڵ، لەبۆ وەجووڵە خستنەوەی، بۆتە رێوشوێنێکی کلاسیک و ئیتر بۆ کەس هەژێنەر نیە،بەڵام ئەو رۆژەی کە زائربرۆخ بۆ یەکەمین جار دڵێکی بۆ داماڵین و هەڵپشاوتن بەدەستەوە گرت ئەم کارەی بەرادەیەک نائاسایی و تازەبابەت هاتەبەر چاو کەلەو نوژدارانەی لە ئامفی تیاترەکەدا حازر بوون تەنانەت یەک کەسیش نەبووکە کردەوەی زائربرۆخی پێ کردەوەیەکی شێتانە نەبێ و تەنانەت یەکێ لەو کۆمەڵە کە هەموو پسپۆر بوون پێشبینیان نەدەکرد کە دڵی راوەستاوی بێ جووڵەی نەخۆش رەنگە بکەوێتەوە لێدان.

ئەوێ رۆژێ زائربرۆخ بە داهێنانێکی کەلەدنیادا بێ پێشینە بوو،مردوویەکی زیندوو کردەوە، رەنگە پێمان وابێ لەدوای ئەو سەرکەوتنە بەخۆی نازی و فیزی بەسەر خەڵکی دیکە دا لێدا، بەڵام فەرقێک لە کردارو حاڵی زائربرۆخ دا نەبینرا و دیاری دا کە تەنانەت زیندوو کردنەوەی مردووش ناتوانێ لەسەرەخۆیی و ئارامی ئەو پیاوە تێک بدا. چوونکە سەبارەت بە لەسەرخۆیی و کەمدوێی زائربرۆخ دوایین،رەنگبێ وا بێتە بەر زەین کە ئەو لە دەرەوەی ژووری عرمەلیش پیاوێکی نەدوێ و خۆگر و خوێن سارد بوو. بەڵام بیرەوەریەکانی هاوکارانی زائربرۆخ وا نیشان دەدەن کە ئەو نوژدارە مەزنە لە ژیانی ئاسایی دا پیاوێکی خۆش مەشرەب و بەگفت و لفت و خوێن گەرم بوو، هیچ کام لە پەرستارەکانی زائربرۆخ ،لەکانەکانی ئاسایی کە لە هۆدەی نەشتەرگەری نەبا،ساردی و کەم ئیلتیفاتیان لێنەدیوە چ بگابە نێوچاوان تێک نان و تورەیی.

لەشەری دووهەمی جیهانی دا زائربرۆخ لە بەرلینێ وەدەرنەکەوت و ئەوکاتەی کە سپای سووری سۆڤیەت گەیشتە بەرلین ،ئەو هەر لەو نەخۆشخانەی ،کەلەپاش دابەش کردنی بەرلینێ بوو بەشێک لە دامەزراوەکانی ئاڵمانی رۆژهەڵات، درێژەی بە کاری خۆی دا.

سپای سووری دەوڵەتی سۆڤیەت کە گەیشتە ناوچەی بەرلین بە چل هەزار تۆپ بەرەی بەرلینی دەکوتا کەلەو ژمارەیە دەهەزار تۆپ هەمیشە بەرەو شاری بەرلین داوێژران،بەڵام لەو دەورەیەش دا زائربرۆخ هەرلەو نەخۆشخانەی کە شوێنی کارەکەی بوو لەشەڕ ورۆژ دا تەنیا دوو کاتژمێر دەخەوت ئەویش نەک لەسەر یەک،چوونکە بێ پسانەوە بریندارەیان دێنانە نەخۆشخانە، لەژووری عەمەلی زائربرۆخ دا سێ قەرەوێڵەیان دانابوو و ئەو نەشتەرگەرە بلیمەتەی لەسەریەت بەدەرە، لەسەر هەر سێک تەخت عەمەلیاتی دەکرد.

دوامین رۆژی مانگی ئاپریلی ١٩٤٥ی زایینی هیتلەری سەرۆکی دەوڵەتی ئاڵمان لە بەرلین دا خۆی کوشت،بەڵام شەری بەرلینێ بە خۆکوژی هیتلەر دوایی نەهات و لەوێ رۆژێرا هەتا رۆژی هەشتی مانگی مای بەرۆژ و شەو،بێ برانەوە، لەبەرلینێ دا شەر لەنێوان سەربازانی ئاڵمانی و سپای سۆڤیەت درێژەی کێشا و هەروا بێ پسانەوە سەربازی بریندارەیان دێنا نەخۆشخانە و زائربرۆخ عەمەلی دەکردن.

زائربرۆخ لە کۆتایی مانگی ئاپریل راتا نۆیەمین رۆژی مانگی مای رەنگبێ بۆی نەکرابێ تەنانەت نیو کاتژمێر لەسەر یەک نووستبێ، ئەگەرچی شەری بەرلین لە هەشتی مانگی مای ١٩٤٥، بە راگەیاندنی

دەریاسالار"فین دونیتز" کە ببووە سەرۆکی دەوڵەتی ئاڵمان و بەبێ هیچ مەرجێک خۆی بەدەستەوە دا، کۆتایی هات، کەچی زائربرۆخ بۆی نەکرا هەتا رۆژی نۆیەم بخەوێ چوونکە هەروا برینداریان دێنانە نەخۆشخانە.

لەیەکی لە رۆژەکانی سەرەتای مانگی مای دا کە شەر لە بەرلین دا بەردەوام بوو، سەربازانی سەرکەوتووی سۆڤیەت چوونە نێو تالارێک کە زائربرۆخ بە روپۆشێکی سەراسەر خوێناویەوە خەریکی عەمەل کردنی سەربازانی زامدار بوو. زائربرۆخ نەیدەزانی سەربازانی سۆڤیەت هاتوونەتە نێو نەخۆشخانە و تەنانەت لەو رۆژانەی کە شەر لە نێو خۆی بەرلین دا درێژەی هەبوو گوێی نەدەدا گرمەی تۆپان و لەبیری خۆرزگار کردن و گیانی خۆی دا نەبوو.

ئەوکاتەی سەربازانی سۆڤیەت چوونە ژوورێ وەزعی زائربرۆخ وە وەزعی "ئەرەشمیدوس"ی حەکیم و بیرکاری زانی بە ناوودەنگی یونانی دەچوو کەلەسالی ۲۱۲ی بەر لەزایین،ئەووەختەی کە لە شاری"سیراکووز"ی هەڵکەوتوو لە دورگەی "سیسیل" سەربازانی هێرش بەر چوونە ماڵەکەی دیتیان کە لەسەر عەرد دانیشتووە و شکلێکی ئەندازەیی لە پێش خۆی راگرتووە و لەسەری خەریکی پێوانە کردنە، سەربازانی رۆمی کە لەداخی خۆسڵ نەکردنی ئەو زانایە هەڵچوون دایگرتبوون، کوشتیان و خوێنی ئەرەشمیدوس بەسەر شکلە ئەندازەییەکەدا رژا.

بەڵام سەربازانی سۆڤیەت کە لەهۆدەی زائربرۆخ وەژوور کەوتن و ئەویان دی سەرتاپای خوێناویە،نەیانکوشت و زائربرۆخ درێژەی بە

کاری خۆ دا. باس کردنی ئەو راستیە بێ مناسەبە نیە کە ئەوکاتەی سەربازانی سۆڤیەت گەیشتنە بەرلین و مسۆگەر بوو کە پایتەختی ئالمان توانای بەربەرەکانی لێبڕاوە کۆمەڵێکی فرە لە پزیشکان و نوژدارانی بەرلین بەرەو خۆراوا بۆی دەرچوون بەڵام زائربرۆخ هەڵنەهات و ئەرکی دوکتۆری خۆی فەرامۆش نەکرد. گشت ئەو کەسانەی لەرۆژی پەلامارەکە دا زائربرۆخیان کێرد بەدەست دەگەڵ دوکتۆر مادلینێر دیت و لە نەشەمزان و لەسەرەخۆیی ئەو پیاوە ئاگادار بوون ،لەو روداوە بەراستی سەریان سوڕ ما.

### زائربرۆخ: کەوتە ژێر چەتری چاوەدێری سەرکەوتووی بەرلین

لەپاش ئەوەی کەسپای سۆڤیەت هاتە نێو شاری بەرلین و خەڕاگری ئالمانیەکان لەو شارەدا تێک شکا، مارشاڵ "ژوکۆف" کە ناووناوبانگی زائربرۆخی بیست بوو،ئەو نەشتەرگەرە مەزنەی خستە ژێر باڵ و ئاگاداری خۆی.

ئەو خرێنەرەی کە ئەم بابەتە دەخوێنێتەوە رەنگە پشتیوانی سارشاڵ ژوکۆفی لە زائربرۆخ بە شتێکی ئاسایی بێتە بەرچاو، هەرلەبۆیە و بۆ وردبوونەوەی زیاتر لە چەند وشەیەک دا ئێژین کە لەو کاتی دا مارشاڵ ژوکۆف کێ بوو.

"گیورکی کۆنستانتینویچ ژوکۆف"لەو زەمانی دا ئەفسەرێک بوو چل ونۆ ساڵە،لەگەڵ ئەوەی دا کە بەرپرسانی راگەیاندنی سۆڤیەت لەبەر خاتری ئیستالین بەوردی سەرنجیان دەدا کە ژوکۆفی زۆر زل

نەکەنەوە ـ چوونکە دیکتاتۆرەکان نایانەوێ لە وڵاتەکەیان دا خەڵک کەسێک یان کەسانێکیان بە گرینگ بێتە بەر چاو، پێیان خۆشە هەر سەرکەوتن و زاڵ بوونێک بە ناوی خۆیان لەقەڵەم بدرێ .ـ ئەو ئەفسەرێک بوو لەلای هەرەمەی خەڵکی یەکیەتی کۆمارەکانی سۆڤیەت و سەربازەکانی سپا پلەیەکی وەک پلەی خواکانی بەدەست هێنابوو،چوونکە ژوکۆف لە سێ شەری گەورەی دژی ئاڵمانیەکان،کەهەر سێک شەر چارەنووس ساز بوون، دەستەملانی سەرکەرتن ببوو.

یەکەم شەری کە ژوکۆف لەوێ دا زاڵ بوو،شەری"موسکۆ" بوو لەساڵی ١٩٤١ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٢ ی زایینی دا. لەوکاتی دا سپای ئاڵمانی هیتلەری وێرای بەرەو پێشەوە چوون لە خاکی سۆڤیەت دا گەیشتە جێگایەکی کە ئەفسەرانی ئاڵمانی بە دووربین گومبەزی کلیساکانی موسکۆی پایتەختی سۆڤیەتیان دەدی و داگیر کردنی موسکۆیان پێ کارێکی دوو یان سێ رۆژە بوو،بەلام ژوکۆف پاشەکشەی بە سپای ئاڵمانێ لەدەوروبەری موسکۆیە کرد و پایتەختی سۆڤیەتی لەگیران رزگارکرد.

شەری دیکەی کە ژوکۆف تێیدا سەرکەوتوو بوو شەری ئیستالینگراد بوولەساڵی ١٩٤٣ دا، لەوشەرەدا ژوکۆف سپایەکی ئاڵمانی لە خوودی ئیستالینگراد دا گەمارۆ دا و تەواوی ئەفسەرو سەربازی ئەو سپایە کوژران یان بە یەخسیری کەوتنە دەستی سۆڤیەت،ئەوکەسانەی کە ئاگاداری مێژووی شەری دووهەمی جیهانین دەزانن کە شکست هێنانی ئاڵمان لە شەری ئیستالینگراد

چارەنووسی شەری بە زەرەری ئاڵمان و بە قازانجی سۆفیەت و هاوپەیمانان دیاری کرد.

سەرکەوتنی سێهەمی ژوکۆف لەشەری بەرلین دابوو،لەدوای ئەوەی کە سەرکەوتنی سپای سۆڤیەت لە بەرلین دا مسۆگەر بوو بە شانازی ناوی ژوکۆف، کەسەرداری زاڵ بووی ئەو شەرە بوو، هەزار گوللە تۆپیان هاویشت، ژوکۆف تەنیا ئەفسەری پلە بەرزی سۆڤیەت بوو لەنێو ئەفسەرانی تردا کە هەزار تۆپی بەناوی هاویژرا و بۆ ئەفسەرانی تری سەرکەوتووی سۆڤیەت لە٣٢٤ تۆپ پتر ناویژرا.

پیاوێکی وەکو ژوکۆف، ئەویش لەسەرەتای بەدەست هێنانی سەرکەوتن لە بەرلین، کەهەر سەرکردەیەکی سەرکەوتوو گەلێک کاری بەدەستەوەن، زائربرۆخی لە بیر بوو و ئەوی خستە ژێر دالدەی خۆی و لەپاشەوەی ماڵەکەی زانرا تابلۆیەکیان لەسەر دەرگاکەی هەڵواسی و بەزمانی روسی لێیان نووسی"ئێرە ماڵی زائربرۆخی مەزنە".

لەپاش ئەوەی بەرلین گیرا وەزعی خواردەمەنی لەوێ دا زۆر خراپ بوو، لەپازدە رۆژی دوای گیرانی بەرلین تەنانەت گرەمێک خواردەمەنی نەدرا بە خەڵک.

لە تەواوی ماوەی ئەو پازدە رۆژەدا ئەو کەسانەی کە پاشەکەوتی زەوەریان نەکردبوو تەنانەت یەک ژەمە نانیشیان نەخوارد،هەندێ لەو برسیانەی کە هێزوگوردێکی پتەویان نەبوو مردن و هێندێکیش لەتاوی برسیەتی وا بێ هێز ببوون کە توانای جووڵەیان لێبڕا بوو،لەشاری بەرلین دا، کەلە سەتا نەوەدی خانوبەرەکانی بەهۆی

بۆمبارانی بێ پسانەوەی هێزی ئاسمانی ئەمریکا و ئینگلیس نوغرۆ کرابوون، هیچ شتێک بۆ خواردنێ وەگیر نەدەکەوت و لەو ماوەیەدا بڕێکی زۆر لە خەڵکی بەرلین نەتەنیا لە خۆراک بەشبڕاو بوون بەڵکو ئاویشیان نەبوو لەحاڵێکدا کە مانگی مای بوو، هەموو ساڵێ لەو مانگەی دا لەبەرلینێ هەموو جورە سەوزی یەکی خۆراکی وەگیر دەکەوت کەچی لە ساڵی ١٩٤٥ لەو وەرزەی بەهاری دا چڵە گیایەکی خۆراکی بەکەس پەیدا نەدەبوو.

بەڵام ئەفسەرەکانی سۆڤیەت زیاتر لە پێداویستی زائیرۆخ خواردەمەنی و زەوەڕیان بۆ ئەو پیاوە دەبردە ماڵێ و نەخۆشخانە، زائیرۆخیش نان وگۆشت وقەند و قاوە و قۆدیەکانی خۆراکە زیادیەکەی کە ئەفسەرەکانی سۆڤیەت بۆیان دێنا لەگەڵ هاوسێ قات وقڕ لێدراوەکانی دابەش دەکرد.

لەشاری وێران بووی بەرلین دا بێجگەلە ئەفسەرەکانی سۆڤیەتی تەنیا یەک کەس ترۆمبێلی هەبوو، ئەویش زائیرۆخ بوو، سۆڤیەتیەکان ماشێنێکی "ئۆپل" یان، لەو جورانەی کە لە هەموو شوێنەکان زەوتیان کردبوون، دایە و بەشە بەنزینێکیشیان لەبۆ دیاری کرد کە دەدرا بەو زانا مەزنە.

لەدوای ئەوەی کە بەرلین گیرا و سەرکەوتنی دەوڵەتی سۆڤیەت مسۆگەر بوو ئەو دەوڵەتە کۆمەڵێکی زۆری لە زاناو کارامەکانی پیشەسازی ئاڵمانی راگوێست بۆ سۆڤیەت هەتا لەوێ خەریکی ئیش وکار بن.

دەوڵەتی سۆڤیەت هەر بەوەندە رانەوەستا تەنیا ئەوانە راکێشێ کەلە پیشەسازی دا پسپۆر و کارامە بوون بەڵکو لە بەشەکانی تری زانستی و پسپۆرایەتی دیکەشدا کەسایەتیە بەرچاوەکانی راکێشا.

لەنێو ئەو کەسانەی کە لەلایەن دەوڵەتی سۆڤیەتەوە رادەکێشران ئیواش هەبوون کە ئەگەر بە خۆشی خۆیان نیشتمانیان بەجێ نەدەهێشت،لەو بارودۆخە نالەبارەی ئەوکاتی دا بە زۆری ناچاری و بۆ درێژەدانی ژیان رێگای سۆڤیەتیان دەگرتە بەر چوونکە لە ئاڵمانی تێک شکاودا لەدوای شەری دووهەمی جیهانی بێجگەلە خۆراک هیچ حەواجێکی تری ژیان وەگیر نەدەکەوت، تەنانەت جوتەپێڵاوێک لەبۆ فرۆش پەیدا نەدەبوو مەگەر لە بازاری رەش دا ئەویش بە نرخێکی ئێجگار گران، وەزع بە چەشنێکی وابوو کە تەنانەت وانەدەهاتە بەر زەین کەلە داهاتوویەکی درێژیش دا ئەو وڵاتە بتوانێ لە ژێر قورسایی باری گیرو گرفت و وێرانیەکانی شەر پشتی هەڵێنیتەوە.

یەکێ لەو کەسایەتیانەی کە دەوڵەتی سۆڤیەت دەیەویست راگوێزرێتە ئەو وڵاتە ولەوێ دا ژیان رابێرێ زائربرۆخ بوو.

رۆژێک ژەنەراڵی پرۆفیسۆر"ویسنێسکی"سەرۆکی رێکخراوی تەندروستی سپای سۆڤیەت بۆ دیدەنی زائربرۆخ چووە نەخۆشخانە، لەدوای چوونە ژوور گوتی هەمیشە ئارەزووم بوو کە ئێوە ببینم و ئێستا کەبەو بەختەوەریە گەیشتووم شانازی ئەوەم هەیە کە سڵاوی گەرمی مارشاڵ "ژوکۆف" بە بەرێزتان رابگەیەنم وچوونکە تەواوی ئەو پزیشک و نوژدارانەی لە سپای ئێمە دا خزمەت دەکەن بەئاواتن

جەنابتان ببینن داوادەکەم ئەگەر دەکرێ رۆژێکی دیاری بکەن بۆ هاتنیان بۆئێرە. زائربرۆخ دووسبەی دیاری کرد و لە رۆژی دیاری کراودا کۆمەڵێک لەئەفسەرانی سۆڤیەتی کە هەموو پزیشک یان نەشتەرگەر بوون و لە تەندروستی سپای سووردا کاریان دەکرد لەبۆ دیدەنی زائربرۆخ چوونە نەخۆشخانە و بۆ رێز گرتن لە مامۆستا بەریز راوەستان و زائربرۆخ وەک ئەفسەرێکی پلە بەرز کەلە ئەفسەرانی تر" سان "دەبینێ بەبەر دەمیان دا رۆیشت و دەستی دەدەستی یەک یەکیان نا.

ئەمرۆ دەزانین کە بەدی هێنانی ئەو تەشریفاتە لەلایەن ژەنەراڵی پرۆفیسۆر ویسنێسکی لەبۆوەی بوو کەهەستی خۆپەرستی زائربرۆخ رازی بکا، ئەگەرچی ئەو نوژدارە بلیمەتە کەیفی بە خۆبەزل زانی نەدەهات بەڵام ئاخۆ دەکرێ لە دنیادا کەسێک بدۆزرێتەوە کە لانی کەم تۆزێک هەستی خۆ پەرستی تێدا نەبێ ؟ ئەرێ بۆ ئەگەر نازانین تەنانەت کەسانی هەرە بێ فیز ،لە کاتی ئاخاوتن دا ،ئەگەر تەوس و پلارێکی ببیسن کە پێوەندی بە گۆشەیەکی ژیانی تایبەتیانەوە هەبێ دەرەنجێن و ئەگەر تاریفیان بکرێ شاد دەبن ؟ئاخۆ نەمان جەرباندووە کە ئەگەرهاتوو حاشایەکی هەرە بچکۆڵە لە مەڕ زانایی و پسپۆرایەتی خاوەن فەن و هونەرێک بکەین چلۆن دەشەمزێ ودادەمێنێ و خەم دایدەگرێ ؟.

ئەو سیس بوون و رەنجانە لەهەستی خۆپەرستی یەوە سەر هەڵدەدا،بەکورتی لەنێو ئادەمیزادەکان دا هیچ کەس پەیدا نابێ کە

هەرنەبێ نەختێک خۆپەرست نەبێ مەگەر ئەوانەی کە خێوی هەست و ئاوەزی ئاسایی نین.

زائیرـبرۆخیش مرۆڤێـک بوو،سـەرۆکـی تـەندروسـتی سـپای سـوور دەیەویست سـوکنایی بـۆ هـەستی خۆخوازیـەکـەی دابـین بـێ هـەتـا بتوانێ پێشنیاری خۆی پێ قبوولْ بکا.

لەپاشی وەی بارودۆخی بەرلین ،لەدوای رۆژەکانی یەکەمینی هەرەس هێنانی ئەوشارە، هێور بۆوە چەندکەس لە ئەفسەرەکانی سپا لـەبۆ چارەسەری هێندێک لە نەخۆشیەکـان پێویـستیان بـە نـەشـتەرگـەری هەبوو وبەهۆی سەرۆکەکـەی خۆیـان هاتنـەلای زائیربـرۆخ و ئـەویـش خستنیە بەر نەشتەرگەری،هەربۆیە ژەنەرالـی پروفیـسۆر ویسنێسکی لەبۆ هاتنەلای زائیربرۆخ دەرفەتی زۆری بەدەستەوە بوو.

ئەو لەیەکێ لـەو دەرفـەتانـە دا پێشنیاری بە زائیربـرۆخ کـرد تـا بـۆ کـارکردن بچێتـە موسـکۆ و گـوتی کـە دەولْـەتـی سـۆڤیەت لـەوێ خانوویـەکـی شـاری و خانوویـەکـی ڤیلایـی دەداتـێ و ترومبیـل و شۆفیری دەنێتە ئیختیار و رادەی مووچەش بەسراوە بـە وازی خـۆت دەبێ، هەر چەندی دیاری بکا لەلایەن دەولْەتی سۆڤیەتەوە دەدرێ.

زائیربرۆخ دەیزانی دەولْەتی سۆڤیەت کۆمـەلْێکی فـرەی لـە زانایـان و پسپۆرانی پیشەسازی ئالْمـانی بـۆوێ راکێشاوە و وەک بـاس دەکـرا هێندێک لەوانی بە تۆبزی بردووە.

لەبۆیە لـە سـەرۆکـی تـەندروسـتی سپای سووری پرسـی :ئـا خۆ بـۆ راگوێستنی مـن بـۆ موسـکۆیە ئـەمرێـک لـە لایـەن دەولْـەتـی ئێـوەڕا دەرچووە ؟.

ویسنێسکی گوتی: نا.. ئەی" گیهیم رات".

زائربرۆخ گوتی چوونکە راگوێستنم لێرە بۆ موسکۆ بە زۆرەملی نیە پێم باشرە هەرلێرە کار بکەم و لە حاڵێکدا کە راگوێستنەکەم بە تۆبزی بێ وای بە باش دەزانم لەکاری خۆم دەست هەڵگرم .

ئەم وتەیە هەر وەک بە زوویی باسی دەکەین لە پاشان بوو بە بیانوویەک بۆ دەوڵەتی ئاڵمان هەتا زائربرۆخی پێ لەسەر کار لابەرێ .

ویسنێسکی وڵامی زائربرۆخی بۆ ژوکۆف بردەوە و ژوکۆفیش بەرێی کردە موسکۆ و ویستی بزانێ کە چبکا، موسکۆ وڵامی دایەوە کەلە زائربرۆخی گەرێن با هەروا لەبەرلینێ خەریکی کار بێ، ژوکۆف کە فەرمانداری سەربازی بەرلینێ بوو زائربرۆخی بۆ پلەی راوێژکاری تەندروستی بەرلینێ هەڵبژارد.

## *ئەو بوختانەی کە ئەمریکایی یەکان بە"زائربرۆخ"یان کرد*

ئاگادارین کە پاش ئەوەی بەرلین لەلایەن سۆڤیەتیەکانەوە داگیر کرا ماوەیەکی پێچوو تا ئەمریکایەکان هاتنە نێو بەرلینێ.

هاتنی ئەمریکایی گەل بۆ بەرلینێ بەهۆی پێشوەچوونی سەربازیەوە نەبوو چوونکە سپای سۆڤیەتی لەدوای ئەوەی بەرلینی گرت هەتا یەکسەت و شێست کیلۆمەتری رۆژاوای بەرلینێش چووە پێشێ، کەوشەنی کۆتایی چوونە پێشی سپای سۆڤیەت ئەو هێڵە بوو کە ئێستا سنووری رۆژهەڵاتی ئاڵمانی رۆژاوا و تخووبی رۆژاوای ئاڵمانی

رۆژهەلاتە، هاتنی ئەمریكاییان بۆ ئالمانیٚ ئاكامی گوت وبیٚژە سیاسیەكانی نیٚوان سەركردەكانی دەولەتە سەركەوتووەكان،پیٚش لە دارمانی بەرلین، بوو . بەرلەوەی بەرلین لەلایەن سپای سۆڤیەتەوە بگیریٚ سەركردەكانی هاوپەیمانان بریاریان دابوو كە لەدوای ئەوەی بەرلین گیرا (هەرلایەنیٚكی بیگریٚ )هەرچوار دەولەتی سۆڤیەت و ئەمریكا و ئینگلیس و فەرانسە بە هاوبەشی بەسەر كاروباری بەرلین رابگەن و هەر یەكەی لایەكی بەرلینیٚ دابب‌رن، كەئەم دابە تا ئیٚستاش هەر دریٚژەی هەیە.

بەهەرحال،ئەمریكاییەكان دوای ئەوەی هاتنە نیٚو بەرلینیٚ زائربرۆخیان تاوانبار كرد بەوەی كە دەولەت و دەسەلاتی نازی چاوەدیٚریان كردووە.

ئەوان ویٚنەیەكیان كردە بەلگەی بیانووەكەیان كە زائربرۆخی لە بەرگی یەكرەنگی ژەنەرالی سپای ئالمان دا پیشان دەدا و لە شورای چوار قۆلی بەریٚوە بردنی كاروباری بەرلین دا ئەویان لەسەركاری راویٚژكاری تەندروستی پایتەختی ئالمان لادا.

بەلام لەدوای ئەوەی كە بەرلین لەلایەن چوار دەولەتەوە داگیر و دابەش كرا، چوونكە زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی ئالمانی رۆژهەلات دا كاری دەكرد و ئەویٚش ناوچەی دەست بەسری سۆڤیەت بوو،مارشال ژوكۆف هەروا لەسەر كاری راویٚژكاری تەندروستی هیٚشتیەوە.

بەلام سەبارەت بەو ویٚنەی بە بەرگی ژەنەرالی سپای ئالمان لە زائربرۆخ هەبوو، ئەو ویٚنەیە هی خولی خزمەتی سەربازیەتی كە پلەی ئەفسەری ئیحتیاتی سپای ئالمانی هەیە.

لەسپای ئاڵمان دا ئەفسەرەکانی ئیحتیات وەک ئەفسەرکانی حازری خزمەت پلەیان دەچووەسەر، بۆ مەودایەکی دیاری کراو،لەپاش تێپەراندنی هەندێ خولان بەناوی فێربوونی پێئەسپێردراوەکان (خولی فیرکردن و راهێنانی ئەفسەرانی ئیحتیات)، پلەی بەرزتریان پێ دەبەخشرا.

لەدوای وەی کە سپای ئاڵمان لەشەری یەکەمی جیهانی دا،شەری بەجێ هێشت ،نیزامی ئیجباری (نیزامی سەرباز گرتن و بردنیان بۆ خزمەتی سپا)لەبەریەک هەڵوەشا و بەپێی پەیمان نامەی"وێرسای" کەلەلایەن دەڵەتە سەرکەوتووەکانی ئەو کاتی بەسەر ئاڵمان داسەپا وادیاری کرا کەئاڵمان سەربازی ئیجباری نەبێ و بۆپاراستنی ئاسایشی ناوخۆ سپایەکی سەت هەزار کەسی لە سەربازانی داخواز و موچەخۆر پێک بێنێ .

بەلام بەر لەوەی نیزامی ئیجباری لە ئاڵمان دا هەڵوەشێتەوە زائربرۆخ کە ئەفسەرێکی ئیحتیات بوو هەندێ پلەی لەنێو کۆمەڵی خۆی دا بڕی، ئەو دەمەی کە دەوڵەتی نازی لەئاڵمان دا هاتە سەر کار و سیتلەر بوو بە خاوەن دەسەلات و پەیمان نامەی وێرسای خستە ژێر پێ و ئیجباری سەرلەنوێ ژیاندەوە بە پێی بریارێکی تایبەت پلەی ژەنەراڵیان دا بە هێندێک لە ئەفسەرانی ئیحتیات کە زائربرۆخ یەکێ لەوان بوو، هەر ئەمە وای کرد زائربرۆخ تۆمەتی هاوکاری دەگەڵ نازیەکانی بدرێتە پاڵ، لەحالێک دا کە دوای ئەوەی شەری سارد لە نێوان ئامریکا و سۆڤیەت دا دەستی پێکرد ئەمریکاییەکان کۆمەڵێک لە ئەفسەرەکانی ئاڵمانیان ،کەهێندێک

لەوان لەگەڵ نازیەکاندا هاوکاری نزیکیان کردبوو، کردە هاوکاری خۆ وکەڵکیان لەزانیاریەکانیان وەردەگرتن.



ژنێکی کە خێوی لەش و لارێکی سەلامەت و بەهرەمەند لە ئەرککەلی کۆئەندامی ژنانە و بۆ نموونە بێنوێژی مانگانەبوو نەیدەتوانی ببێتە دایک و منالّی ببێ،گوێی دا نسحەتی خزم و دۆست و نزیکان و سەردانێکی نەخۆشخانەی شاریتی کرد.
بەو ژنەیان گوتبوو هۆی نەزۆک بوونەکەی ئەوەیە کە جیهازی مێینەیی خوار هەڵکەوتووە (تاتە) و ئەگەر بە عەمەلی نەشتەرگەری ئەو بەشەی مێینەیی راست کرێتەوە منداڵی دەبێ.
زائربرۆخ گوتبووی:بە نەشتەرگەری دەکرێ چارەسەری ئەوژنەی بکرێ کە بەشێک لە جیهازی مێینەیی خوار هەڵکەوتبێ و نازۆکی کردبێ، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە ببێتە خاوەن منداڵ. دوای ئەوەی کە ئەو ژنە هاتە نەخۆشخانە زائربرۆخ رازی بوو بیخاتە بەر نەشتەرگەری.
رۆژی عەمەلیان دیاری کرد،دوکتۆر مادلینێری یاریدەری زائربرۆخ ئەوی رۆژێ نەیدەویست لە وەتاخی عەمەل دا حازر بێ کەچی لەپاشان وای بیر کردەوە کە رەنگە بوونی لە ژووری عەمەل دا باشتربێ، ئەگەر تێکچوونێک لە زائربرۆخ دا خۆی نیشان دا ئەو بتوانێ پێش لە درێژەدانی عەمەل بە دەستی زائربرۆخ بگرێ.

بەڵام لەپاش هاتنە ژووریێ بۆ هۆدەی عەمەل هەستی کرد کە زائربرۆخ بە تەواوی لەسەر حاڵی ئاساییە و بە باشی نەشتەرگەری دەکا.

بەشێوەی ئاسایی، نوژدارانی گشتی کە لە بەشە جیاجیاکانی لەشی مرۆڤ دا نەشتەرگەری دەکەن نوژداری لەسەر جیهازی تێکەڵی ژنان بە نەشتەرگەرانی پسپۆر دەسپێرن، بەڵام زائربرۆخ لەنەشتەرگەری هەموو بەشەکانی لەشی مرۆڤ دا باڵادەست بوو،مادلینێر دیتی کە ئەو نوژدارە مەزنە، هەربەو دەستوبردەی کەلە بەشەکانی تری لەش دا نەشتەرگەری دەکرد،عەمەلی سەر جیهازی مێیینەیی ئەو ژنە بە ئەنجام گەیاندو ژنەکەیان بۆ ئیسراحەت لە ژووری عەمەل بردە دەرێ و پیاوێکیان هێنا ژوور کە دەبوو لووی پروستاتی بخرێتە بەر عەمەل

زائربرۆخ بە هۆش و گۆشی تەواوەوە لە ژووری عەمەل چووە دەرێ و ژنێکی پەرستاری نەخۆشخانە دەستەوانە پیسەکانی لەدەستی دەرێنا وزائربرۆخ دەستەکانی بە سرنجەوە شووشتەوە و جوتە دەستەوانەیەکی پاک و میکرۆب کوژاوی دەدەستی کرد.

لووی پروستات، کەئەوێ رۆژێ دەبوو نوژداری مەزن نەشتەرگەری لەسەر بکا، لوویەکە لوولەی میزی پێدا تێدەپەرێ.

بۆ نیشان دانی شکڵی لووی پروستات و شێوەی کارکردنی پێویستە شیکردنەوەیەکی زۆر بکرێ و پەراوێکی پزیشکی بنووسرێ، بەڵام چوونکە ئێمە لە نووسینی سەربردەی زائربرۆخ دا بە تەمای

نووسینی نامیلکەیەکی پزیشکی نین بەکورتی و بە دەربرینێکی فرە ساکار لووی پروستات بە خوێنەران دەناسێنین :

لوویەک بێننە بەر زەینی خۆ کە شکڵەکەی نزیکە لە ئاڵقەیەک وئاوەڕۆی میزی پێدا تێدەپەڕێ. ئەم لووە تەنیا پیاو هەیانە وژن لووی پروستاتیان نیە و لەئاکام دالەنەخۆشینەکانی پارێزراون.

وشەی"پروستات"وشەیەکە لەزمانی یونانیەوە هاتۆتە نێو زاراوەکانی پزیشکی وماناکەی لەو زمانەدا یانی"لەپێشەوە". سا لووی پروستات لە پێشەوەی میزڵدان هەڵکەوتووە وئاوەڕۆی پاشاو لەدوای ئەوەی کە لە میزڵدان هاتەدەر بەلووی پروستات دا تێدەپەڕێ و دەچێتە نێو دوامین بەشی ئاوەڕۆیەکە.

لەهەوەڵەوە کەئاوەڕۆی میز لە گورچیلانەوە دەست پێدەکادوو لوولەن؛ یەک لەلای راست ویەک لەلای چەپ را دێنە سەر میزڵدان،بەڵام کەلە میزڵدانەوە جیا بۆوە دەبێتە یەک لوولە و ئەویش بە پروستات دا تێدەپەڕێ.

لووی پروستات لە دەورانی منداڵی وگەنجی پیاوان دا وەزعێکی نائاسایی نیە مەگەر بەدەگمەن،بەڵام لە چاخی بە ساڵداچووییدا،لەبرێک لەپیاوان، دۆخێکی نائاسایی بەسەر دێ.

وەزعی نائاسایی لووی پروستات، لەدەورانی پیری پیاوان دا،بەیەکێک لەو دوو شکڵە خۆی دەنوێنێ؛لووی پروستات یان سست و شل دەبێ یان سفت و رەق.

ئەگەر لووی پروستات ئەستوور بوو ورەق بوو چوونکە ئاوەڕۆی پێدا تێدەپەڕێ، ئەو کەسەی تووشی ماسینی پروستات بوو لە پێشدا بە

زەحمەت میزی بۆ دەکریَ و هێواش هێواش حاڵەتی میزەرۆی دەگۆریَ بە میزگیران بەشێوەیەکی وا کەئیتر ناتوانیَ میزبکا.
بەڵام ئەگەر لووی پروستات لە دەورانی پیری پیاوێکدا سست و خاو بیَ ،لەهەوەڵەوە،واهەست دەکا کە ناتوانیَ میزی راگریَ و لەپاش ماوەیەکی تووشی چرتکەمیزە دیَ و بیَ ئیرادە میز بە ئاوەرۆی دا دێتە خواریَ،هەریەک لەم دوو حاڵەتەش بەسەر پیاوێکی پیر بیَ گەلێک ئازار دەرە.
ئێستا کەبەساکاری وبەبیَ چوونە نێو مەبەستگەلی پڕ وردەکاری زانستی،پروستات مان بە خوێنەران ناساند، ئێژین کەچەند سەدە ــ و رەنگە هەزاران ساڵ ــ ئەو پیاوانەی کە لە زەمانی زورهانی دا تووشی هەرکام لە نەخۆشینەکانی پروستات دەبوون، ژیانەکەی تری تەمەنیان بە کوێرەوەری ورەنج و تاڵی رادەبارد و چارەسەریان نەبوو تا ئەوەی زائربرۆخ بە نەشتەرگەری لەسەر لووی پروستات نەخۆشەکانی ئەم جورە نەخۆشی یەی لە رەنج و ئازار رزگار کرد و قوتابخانەیەکی دەرمانکردنی گەورەی بۆ لەنێو بردنی دەرد و کوێرەوەریەکان بنیات نا.
نابیَ ئەوەش بشێرینەوە کە لە بارەی مێژووی یەکەم عەمەلی نەشتەرگەری پروستات بیرو رای جیاواز هەیەو هێندێک دەڵێن هەرلەوکاتەی کە زائربرۆخ نەشتەرگەری لووی پروستاتی بە یەکیَ لەداهێنانەکانی خۆی دەژمارد، لەجێی دی ویەکیَ لەوان سۆفیەتیەکان ئەو عەمەلەیان دەکرد،بەڵام ئەوە هیچ نکوڵی لێناکریَ کە هەر عەمەلێکی زائربرۆخ لەسەر لووی پروستات دەیکرد

دەگەیشتە ئاکامی باش و پڕ فایدە و نەخۆش لەسەتاسەت رزگاری دەبوو لەئازارو دەرد.

بەهەرحاڵ دوکتۆر مادلینێر کە دەیدی زائربرۆخ بە وریایی و شعووری بێ عەیب و بەدەستوبرد درێژە بە کاری خۆی دەدا، لەداخەوە ئێرەیی بە دەسرەنگینی و باڵادەستی وی دەبرد،پاشەوەی عەمەلی پروستات کۆتایی هات ، ئەو نەخۆشەی کە دەبوو "ئاپاندیست" ی عەمەل بکرێ هێنایانە ژوورێ. زائربرۆخ هەروا بەزیتی و وشیاری تەواوەوە دەستەوانەکانی گۆری و عەمەلی ئاپاندیست (ریخۆڵە کوێرە)ی، کە بۆ نوژدارێکی وەکو وی عەمەلێکی ساکاربوو ،جێ بەجێ کرد.

زائربرۆخ رۆژانە لە نەخۆشخانە دەبیری خواردنی فراوین دا نەبوو، هەتا ئەو کاتژمێرەی کە کاری هەبوو بەبێ خۆراک درێژەی بە هەوڵی خۆی دەدا، کاربەدەستانی خەستەخانە دەیانزانی ئەو لە رۆژدا هەست بە برسیەتی ناکا، ئەگەر برسیش بێ وەسەرەخۆ نایەنێ.

ئەوێ رۆژێ لەدوای دوامین عەمەلی نەشتەرگەری روپۆشەکەی داکەند وکتێبەکەی هەڵگرت کە لە ماشێن دا دەیخوێندەوە، بەرلەوەی لە نەخۆشخانە دەرکەوێ چاوێکی بە بەرنامەی کارەکانی خۆی، بە تەماشاکردنی ئەو وێنانەی کەلەهەموو بارانەوە لە نەخۆشان هەڵگیرابوونەوە، داخشاند هەتا لەبۆ کارەکانی سبەینێ پێشتر زەینی خۆی ئامادە کردبێ. لەهەموو نەخۆشخانان دا نوژداران ئەو کارەی دەکەن، چاوبەو وێنانەدا دەخشێنن کە بە هۆی "تیشکی ئیکس"وەرگیراون و چەند رۆژ پێشتر لە ئەنجام دانی عەمەلێکی

نەشتەرگەری پەروەندەی نەخۆش دەخوێننەوە وتەماشای ئەو وێنانـە دەکەن کە بەهۆی تیشکی ئیکسەوە لە نێوەوەی لەشـی وەرگیـراوە و تەواوی پێناسەکانی نەخۆش لەباری تەمەن و پێشینەی نـەخۆشـی و تەوژمی خوێن و وەزعی ئەندامەکانی سەرەکی لەش بەتایبەت وەزعی دڵ دەخەنە بەرچاو.

*مێشکی نەخۆشی وەك کێکێك دابەش دابەش کرد*

یەکێ لەو پەروەندانەی کەوتـە بـەر موتـاڵای زائربـرۆخ پێـوەنـدی بـە ژنێکی پەنجاوپێنج ساڵانەی خزمی شارەوانی"درسێد"بوو کە سەرۆکی نەخۆشـخانە بەنەخۆشێکی گرینگی دێنا ئەژمار.
ئەم ژنـە لوویـەکـی دەسـەری دابـوو کـە دەبـوو بـەدەسـتی زاأربـرۆخ لەسەرێ دەربێ،لەگەڵ ئەوەی چەند نوژداری باش لەشاری درسێد دا هەبوون ئەو ژنە هاتە بەرلینێ هـەتـا گیهـیم رات (مامۆسـتای چـازان) بیخاتە بەرعەمەلی نەشتەرگەری.
زائربـرۆخ کـەدیمـان چـۆن لـەگـەڵ ئـەو فـیلم هـەڵگـرەوانـەی کـە دەیانـەویـست لـەژووری عـەمـەل داحـازربن و لـەکـارەکـانی فـیلم هـەڵگرنـەوە دژایـەتـی کـرد، سـەبـارەت بـە خوێنـدکارانی پزیـشکی خۆشەریستی دەنواند و رازی دەبوو کەئـەوان لـە هـۆدەی عـەمـەل دا حازر بن و کارەکانی ببینن و لێی فێر بن.

بەرازی بوونی زائربرۆخ بریار درا کە رۆژی دوایی ،ئەو رۆژەی کە دەبوو ژنە پەنجاوپێنج ساڵەکە عەمەل بکرێ، کۆمەڵێک خوێندکاری پزیشکی لە ژووری عەمەل دا حازر بن.

لەبارەی ژمارەی ئەو خوێندکارانەی کەلە سەر عەمەلی لوو هەڵگرتنی سەری ئەو ژنە دا حازر بوون جیاوازی هەیە، هێندێک گوتویانە سی کەس و هێندێک ژمارەی ئەوانیان بیست کەس نووسیوە، ئەوەش پتر وێدەچێ کە بیست کەسەکە راست بێ چوونکە ئەو ژوورەی کە شوێنی کاری زائربرۆخ بوو ئەوەندە بەر فراوان نەبوو کە سی کەس خوێندکاری تێدا حازر بێ ، لەورۆژەی کە زائربرۆخ دەبوو لووی سەری ژنەکە دەرێنێ لە دەمی بەر لە دەسپێکردنی عەمەل، دوکتۆر مادلینێریان بۆ کارێکی فەوری و بێ راوەستان لەلایەن سەرۆکی نەخۆشخانەوە بانگکرد ولەئاکامدا هیچ کەس لە هاوکارانی باڵادەستی زائربرۆخ لەژووری عەمەل دا حازر نەبوون.

پرچە درێژەکانی ژنە نەخۆشەکەیان تاشی بوو،زائربرۆخ لە حاڵێکدا کە خوێندکارەکان بەوردی چاویان بریبووە شانۆی نەشتەرگەرییەکە دەستی کرد بە هەڵەشکاوتنی کەلەسەری ژنە نەخۆشەکە .

زائربرۆخ لەو رویەوە بەشێک لە ئێسکی کەللەسەری پاش بڕینەوە بەرزی دەکردەوە و هەنگی دەینووشتاندەوە ( وەک دەرخۆنەیەکی کە هەڵیدەنەوە و لە حاڵێک دا بە لاولاوە لکێندراوە هەڵیگێرنەوە سەر هەرد) هەتا ئەو هێسکەی لە کاژەڵاک جیاکراوەتەوە بە ئێسکی سەرەکیەوە پێوەندی نەبڕێ و خانەکانی نەمرن.

زائربرۆخ دەیزانی ئەو لووەی ژنەکە ئازار دەدا لەکوێی مێشک دا هەڵکەوتووە و ئەو لاباجەی لەکاژەڵاکی نەخۆش دا بەدی هێنا راست لەسەر شوێنێک کە لووەکەی تێدا بوو کرایەوە.

عەمەلی نەشتەرگەری لەسەر مێشک کاری ئەو نوژدارانەیە کەلەو بەشەدا پسپۆریەتیان هەیە. مێشک یەکێ لە ئەندامەکانی سەرەکی و هالۆزی لەشی مرۆڤە، لەگەڵ ئەوەی دا کە لە سەدەی حەڤدەیەمەوە بەم لایە زانیاریەکانی پزیشکان و کارناسانی ئەرکگەلی کۆ ئەندام سەبارەت بە مێشک فرە بەربلاو بووە،هێشتا لە مێشک دا، هەندێ بەشی وا هەن کە کاری ئەوان لە باری ئەرکگەلی کۆ ئەندامەوە لە پزیشک و کارناسان شاراوەیە.

ئەو نەشتەرگەرەی لەسەر مێشک دەست بۆ عەمەل دەبا گەرەکە مێشک بناسێ ، ناسینی مێشکیش پێویستی بە خولێکی خوێندن و کارفێر بوونی بە چاکی هەیە، کێردی نەشتەرگەری نابێ بگاتە بەشی ناوەندی ناوچەیەکی کە پێی دەگوترێ "کۆرت کێس"، چوونکە ئەگەر هاتوو کێردی نەشتەرگەری چووە بەشی ناوەندی کۆرت کێس دوو ئەرکی گیان بەخشی لەش کە یەکیان دڵەو ئەویتر جروڵەی سییەکانە رادەوەستێ و مرۆڤ دەمرێ.



لەدوای ئەوەی لاباجەی کەللە سەر کرایەوە زائربرۆخ بەو خوێندکارانەی لە ژووری عەمەل دا حازر بوون گوتی نزیک بنەوە و

مێشکی زیندوو ببینن، هەڵیدایە وگوتی بە ئێوەیان گوتوورە کە مێشکی مرۆڤ دە ملیارد خانەی هەیە لە حاڵێک دا بەشێک لە مێشک کە دەبێتە کۆرت کێس چواردە میلیارد خانەی هەیە گشت خانەکان بەخوێن بەرێ دەچن لەنێوان تەواوی ئەوان دا پێوەندیگەلی رەگی هەیە، تەماشا کەن تا جووڵەی بەردەوامی دەمارە سوورە ببینن.

پێیان گوتون کە خانەکانی مێشک نوی نابنەوە وئەگەر خانەیەک لەمێشک جیا کرێتەوە دەمرێ. ئەو کەسانەی ئەوەیان پێ گوتوون نەزانن، دەست تان بێنن،چەند کەس لەخوێندکارەکان کە لە زائربرۆخ نزیکتر بوون دەستیان درێژ کرد؛

ئەو پیاوە وەک ئەوەی نانەکێکێ لەت بکا کێردی نەشتەرگەری خۆی دەمێشکی ژنەنەخۆشەکە رۆ کردو کەرتێکی لە مێشک جیا کردەوەو لەسەر بەری دەستی یەکێ لە خوێندکارەکانی دانا، ژنەپەرستارەکەی لە پەنا زائربرۆخ بوو بە"تانپۆن"خوێنە دەڵاوەکەی پاک کردەوە.

زائربرۆخ دیسان کیردەکەی دە مێشک رۆ کردەوە و کەرتێکی دیکەی لێبڕی و دەری هێناو دەدەستی یەکێ لە خوێندکارەکانی نا و دیسان ژنەکە بە تانپۆن خوێنە چۆڕاوەکەی سڕیەوە.

شەش جار کێردی نەشتەرگەری زائربرۆخ دەمێشکی نەخۆشەکە رۆچوو و هەرجارەی کەرتکێکی مێشکەکەی بڕی و دەدەستی یەکێ لە خوێندکارانی نا.

گشت ئەو خوێندکارانەی کە لەژوورەکە دابوون لە زانکۆی پزیشکی دەیانخوێند و هەمووش دەیانزانی لەت لەت کردنی مێشک دەبێتە

هۆی مەرگ، بەڵام بروای ئەوان بە زانست و لێزانی زائربرۆخ ئەوەندە بوو کە پێیان وابوو ئەو مامۆستا بلیمەتە بە هەڵە ناچێ و عەمەلەکەی بەلایەک بەسەر نەخۆش نایەنێ و شک نیە کە ئەو لەتانەی لە مۆخی نەخۆشی کردوونەوە لە جێگای خۆیان دادەنێتەوە و لەتەکانیش دەگەڵ دەوروبەری خۆ لێکدەدرێنەوە و مێشکی نەخۆشەکە دێتەوە سەر شکڵی هەوەڵێی.

زائربرۆخ جدی روی دە خوێندکاران کرد و گوتی ئەمانەم داپێتان هەتا بیبەن لە تاقیگەدا بیخەنە نێو زەرفێکی کە مایەی خۆراکدەری تێدابێ دەبینن کە لەپاش پازدە رۆژ دەبێتە دوو هێندە و ئەوی هاتەدی دوای پازدە رۆژی تر دوو هێندەی دی زیاد دەکا، هەڵدانی خانەکانی مێشک ئەوەندە درێژەی دەبێ، ئەگەر ئێوە هەروا خۆراک بگەیەننە خانەکان، کەلەم وڵاتە دا جێی نابێتەوە،کەچی مامۆستاکانی ئێوە کە گشتیان نەزانن دەڵێن خانەکانی مێشک سەرلەنوێ نابنەوە.

ژنەپەرستارەکانی کەلە ژوورێ بوون بە ترسەوە چاویان بڕیبوە شانۆی نەشتەرگەریەکە و لەم ساتە دا ئەو دوکتۆرەی بەرپرسی بێهۆشی بوو وەئاگا هات کە نەخۆش مردووە.

دوکتۆران، بەهۆی پەروەردەیی کاری هەمیشە لە بەرانبەر ڕوداوی چاوەنۆڕ نەکراو کەلەکاتی عەمەلێ دا رودەدەن، لەلای کەس وکاری نەخۆش یا کەسانی تر کە لەباری پزیشکی دا بێگانەن لەسەرەخۆ ونەدوێن، لەوهۆدەیەدا بیست و بە گێرانەوەیەکی تر سی کەس خوێندکاری پزیشکی حازربوون و ئەگەرچی لەزانکۆی پزیشکیان

دەخوێند بەڵام دوکتۆری بێهۆشی هێشتا نەیدەتوانی ئەوان بە خۆیی دابنێ و لەلای ئەوان و بەدەنگی بەرز بە زائربرۆخ بڵێ نەخۆش مردووە.

دوکتۆری بێهۆشی ئەگەرچی هەتا ئەو ساتەی نەیدیبوو کە زائربرۆخ لەکاتی عەمەلێ دا نەخۆشێک بکوژێ بەڵام دەمگۆی گشتی نەخۆشخانەی دەبیست، تەنانەت گوێ بیس ببوو کە ئەودەمەی دوکتۆر مادلینێر ویستی بەری زائربرۆخ بگرێ ئەو پیاوە بە کێردی نەشتەرگەری هێرشی بۆ برد.

دوکتۆری بێهۆشی زانی کە هیچ لەدەستی وی یان کەسی تر نایە بۆ زیندوو کردنەوەی نەخۆشەکە و لەترسی وەی کە هێرشی زائربرۆخ بە کێردەرە لە بەردەمی بیست یان سی کەس خوێندکار دوو پات نەبێتەوە لە ژووری عەمەلێ وەدەرکەوت هەتا یارمەتی لە کارگێرانی نەخۆشخانە بخوازێ، بێن و زائربرۆخی بگرن هەتا نەتوانێ چیدی درێژە بە کارە نا ئاقڵانەکەی بدا. ئەودەمەی کارگێرانی نەخۆشخانە دەگەڵ دوکتۆری بێهۆشی و دوکتۆر مادلینێر کەلەدەرەوە رەگەڵیان کەوتبوو وەژوور کەوتن، زائربرۆخ لە دیتنی ئەوان واقی ورما و گورانەی کێ ئیزنی داون بێنە ئێرە مەگەر نازانن ئێرە ژووری نەشتەرگەریە.

بەڵام کارمەندانی نەخۆشخانە گوێیان نەدایە و هەڵیانکوتا سەری دەستەکانیان گرت و رەکێش رەکێش لە ژوورەکە وەدەریان ناو چوونکە راپسان داپسانی دەکرد و ملی نەدەدا وەک شێتێکی بەراستی دەست و قاچیان بەستن.

ئەم ناروزرانە بەئامادەبوونی بیست سی کەس لە خوێندکارانی زانکۆی پزیشکی و کارمەندانی نەخۆشخانە کە دەست و قاچیان بەست، بەچەشنێکی وا بلاو بووە کە کەس نەدەشیا پێشی پێ بگرێ.
بەلام چوونکە لە بەرلین و لە ئالمانی رۆژهەلات دا رۆژنامەکان لە ژێر چاوەدێری دەولەت دابوون هەوالی ئەو روداوە لە رۆژنامەکان دا بلاو نەکرایەوە.
کەچی رۆژنامەکانی بەرلین و ئالمانی رۆژاوا بەبێ ئەوەی ناوی زائربرۆخ بێنن نووسیان لەنەخۆشخانەی"شاریتی"دا نوژدارێک بەبێ هۆ و پێداویستیەکی پزیشکی نەخۆشێکی لە کاتی عەمەل کردن دا کوشتووە .
لەو زەمانی دا، وەکو ئەمرۆ، لەنێوان بەرلینی رۆژهەلات و رۆژاوا دا دیواری سەرانسەری لەگۆرێ دا نەبوو هەتا پێوەندیەک لەنێوان هەردوو بەشی بەرلین دا نەبێ ، لەبەرلینی رۆژاوا خەلک ئاگاداریان پەیدا کرد لە ناوی ئەو نەشتەرگەرەی ژنێکی لە ژووری عەمەل دا کوشت و زانیان کە زائربرۆخی بە ناووناوبانگە.
بەلام ئەو کەسانەی کە باوەریان بە زانست و مامۆستایی زائربرۆخ هەبوو ئەو دەمگۆیەیان بە دروست کراوی رەقیبان و حەسوودان دەزانی.

*ئەو پیاوەی بە تەرمی عەمەل کراوەکان رادەگەیشت*

لەنەخۆشخانەی شاریتی بەرلینی رۆژهەلات دا دوکتۆرێک هەبوو بەناوی دوکتۆر"راسێل"،کەبە پشکێنەری مردووەکانی دوای نەشتەرگەری دەهاتە ئەژمار.

ئەو کاتەی نەخۆشێک لەپاش عەمەلی نەشتەرگەری مالآوایی لە ژیان دەکرد دوکتۆر راسێل تەرمەکەی دەپشکنی هەتا دیاری بکا داخوا عەمەلی نەشتەرگەری بە پێی پێوانەکانی زانستی پزیشکی جێبەجێ کراوە یان نا.

هەلبەتە ئەوەلەحالێکدا دەبوو کە لە پێداچوونەوەی "سورەت مەجلیس"ی عەمەلی نەشتەرگەری پەی بە زانستی بوونی عەمەلەکە نەبردبێ .

ئەگەر نوژدارێک عەمەلێکی ئەنجام دەدا وبەناهەق سورەت مەجلیسێکی ناراستی پێشکەش دەکرد بە دوو سێ پرسیاری دوکتۆر راسێل مەحکووم دەبوو و لەوەپاش نەیدەتوانی لە نەخۆشخانەکانی بەرلینی رۆژهەلات دا نەشتەرگەری بکا.

دوکتۆر راسێل سێ شتی بەهیچ عوزروبیانوویەک قبوول نەدەکرد:

یەکەم ئەوەی کەنەخۆش لەژێر عەمەل دا بمرێ.

دوکتۆر راسێل دەیگوت ئەگەر نەخۆشێک لەژێر عەمەل دا بمرێ ئەو نوژدارەی کە عەمەلی کردووە بەرپرسی مردنیەتی، چوونکە ئەو نوژدارەی دەزانێ وێدەچی نەخۆشەکەی لەژێر عەمەل دا بمرێ نابێ بیخاتە بەر نەشتەرگەری.

دووهەم ئەوەی کە نەخۆش لەبەر چڵک وپیسی برینەکەی لەدنیا بچێتەدەرێ کەنیشانەی کەمتەرخەمیەلە دەبەرچاوگرتنی بنەماکانی تەندروستی لەکاتی عەمەل کردن دا.

سێیەم ئەوەی کە نەخۆشێک لەپاش عەمەلی نەشتەرگەری بەنەخۆشی کوزاز بمرێ.

دوکتۆر راسێل دەیگوت هەتاکونێ وەتاخی عەمەل و کەلوپەلی نەشتەرگەری پیس نەبن زامی نەخۆش لەدوای عەمەلێ چڵکێ ناکا و هەتاکو ژووری عەمەل و کەرەستەکانی نەشتەرگەری پیس وپەڵۆس نەبن نەخۆشێک لەپاشی عەمەل تووشی نەخۆشی کوزاز نابێ، دوکتۆر راسێل لەسەر ئەو شتانە نوژداری بە بەرپرس دەزانی و ببڕای ببڕای دەگەڵ لێخۆش بوونی کابرای رەزامەندی نیشان نەدەدا.

ئەو سەبارەت بە هەر یەک لەو نەخۆشانەی کە لەژێر عەمەلدا دەمردن یان لەدوای عەمەلێ لەبەر چڵکی برین یان میکرۆبی کوزازمالآواییان لەژیان دەکرد راپۆرتێکی ئامادە دەکرد کە نووسخەیەکی دەدا بەسەرۆکی نەخۆشخانەو بەرنووسێکیشی لەبۆ سەرپەرشتی تەندروستی ـ کەلەدوای پێک هێنانی دەوڵەتی ئاڵمانی رۆژهەلات بووبە وەزیری تەندروستی ـ دەنارد.

دوکتۆر راسێل لەرابردوو دا کە زائربرۆخ دەچووە پۆلەکانی زانکۆی پزیشکی و دەرسی دەگوتەوە یەکێ لە شاگردەکانی ئەو نوژدارە بلیمەتە بوو، لەدوای ئەوەی خولی خوێندنەکەی گەیشتە کۆتایی بۆئەمەی بتوانێ دیپلۆمی دوکتۆری وەربگرێ،زانست نامە (تێز)ی نووسی.

دوکتۆر راسێل بۆ نووسینی نامەزانستیەکەی کە سەبارەت بە نەخۆشی خەوێ بوو کەڵکی لە دەقی کتێب و نامەی تر وەگرت و نزیکەی دووساڵ خەریک بوو هەتا نامەکەی گەیاندە کۆتایی و دای بە مامۆستای تاکو بە پێی ڕێوشوێنی زانکۆکانی ئاڵمانی پەسندی بکا، ئەویش دیپلۆمی دوکتۆری وەربگرێ.

لە ئاڵمانێ دا نەریت وابوو کەمامۆستا لەدوای ئەوەی نامەی خوێندکاری وەردەگرت ڕۆژێکی بۆ بەرگری خوێندکار لە نامەی زانستی دیاری دەکرد، لەوێ ڕۆژێ دا خوێندکارلە دانیشتنێکی کەمامۆستای خۆی وچەند مامۆستای تری لێدەبوو حازردەبوو و وڵامی ئەو پرسیارانەی دەداوە کەمامۆستاکان لەبارەی نامەکەی دا لێیان دەکرد، ئەگەر وڵامەکانی باش بان نامەکەی پەسند دەکراو بە واژۆ (ئیمزا)ی سەرۆکی زانکۆ و زانستگا دیپلۆمی دوکتۆریان دەدایە.

ماوەیەک رابرد و زائربرۆخ دوکتۆر راسێلی ئاگادار نەکردەوە کەلە چ ڕۆژێک دەبێ بەرگری لە نامەزانستیەکەی بکا، تاوای لێهات کاسەی سەبری راسێل لێوڕێژ بوو، ڕۆژێکی زائربرۆخ لەهۆدەی کاری خۆی لەزانکۆی پزیشکی دانیشت بوو، لەخۆی بەولاوە کەسی دیکە لەو ژووره نەبوو، راسێل چووەلای و مەبەستی نامەکەی وەبیر هێناوە.

مامۆستا، ئەو ئەشکافەی لەپەنای بوو کردەوەو نامەکەی رانسێلی لێدەرێنا و لێی پرسی ئەتو تائێستا چەند نەخۆشت، کەگیرۆدەی نەخۆشی خەو بوونە،چارەسەرکردووە ؟

( زائربرۆخ زوربەی خەڵکی بە وشەی"ئەتو" بانگ دەکرد)

راسێل وڵامی دایەوە من هێشتا نەخۆشێکی کە گیرۆدەی ئەم نەخۆشیە بێ دەرمانم نەکردووە.

زائربرۆخ پرسی ئەدی چۆن ئەمانەت نووسیوە ؟

راسێل گوتی: من دووساڵ توێژینەوەم کرد و ئەو کتێب و نامەزانستیانەی کە لەبارەی نەخۆشی خەوێ دا نووسرابوون موتالآم کردن و ئەوەی کە لەم نامەیەدا نووسراوە لەو سەرچاوانە وەرگیراوە.

زائربرۆخ پرسی ئاخۆ چوویەتە ئەو ناوچانەی کەلەوێدا نەخۆشی خەوێ هەیە و نەخۆشەکانی گیرۆدەی ئەم نەخۆشیەت دیون ؟

راسێل گوتی: نا، مامۆستا.

زائربرۆخ پرسیاری لێکرد: ئاخۆ لە ئاڵمان دا نەخۆشێکی گیرۆدەی نەخۆشی خەوێت دیتووە ؟

راسێل گوتی: لەئاڵمانێ دا نەخۆشی خەوێ هەر نیە.

زائربرۆخ نامەکەی راسێلی هەڵداشت و گوتی کەوابێ ئەوەی تۆ نووسیوتە پەرتوکێکی وێژەییە نەک نامەیەکی زانستی پزیشکی، نامەی زانستی پزیشکی ئەوەیە کە تۆ بابەتەکەت بەچاوی خۆ دیبێ و لە چارەسەر کردنی نەخۆشیەکە بەشداریت بووبێ.

شتێکی وەک ئەم روداوە بۆ یەکێ لەپزیشکە ناسراوەکانی ئێرانی رویدا؛

ئەو پزیشکە ئێرانیە لەدوای تەواو بوونی خوێندنی پزیشکی لە ئێران گەیشتە پلەکانی بەرزی پزیشکی و رامیاری. لەئاڵمان دەیخوێند و شاگردی زائربرۆخ بوو، لەپاش کۆتایی هاتنی خوێندن بابەتی نامەی زانستی خۆی جورەنەخۆشیەکی شێرپەنجەی زارودەم هەڵبژارد،کە

بەزمانە ئوروپاییەکان پێی دەڵێن"نوما" و بەزمانی عارەبیش پێی ئێژن"سرطان الماء".

پزیشکی ئێرانی ماوەیەک کوێرەوەری و شەونخونی کێشاو نامەی زانستی نووسی و ئەوجار لەچاوەنۆڕی رۆژی بەستنی کۆبوونەوەی بەرگری لەنامەکە، رۆژئەژمێری دەکرد.

بەلام واوێدەچوو زائربرۆخ مەبەستی نامەزانستی یەکەی لەبیر چووتەوە، واهات پزیشکی ئێرانی ناچار بوو بیری بخاتەوە، زائربرۆخ پێی گوت سبەینێ وەرە دەفتەری کارەکەم.

رۆژی دواتر پزیشکی ئێرانی چووە دەفتەری کاری مامۆستا، زائربرۆخ لێی پرسی خوودی خۆت نەخۆشێکی کە تووشی نەخۆشی"نوما"بێ دیوتە ؟

پزیشکی ئێرانی وڵامی" نا"ی دایەوە.

زائربرۆخ پرسی ئاخۆ برێکت لە تەنراوەی شێرپەنجەی نوما شیکردۆتەوە یان بۆ شیکردنەوە داوتەبە هیچ تاقیگەیەک ؟

پزیشکی ئێرانی دیسان وڵامی نای داوە مامۆستا.

زائربرۆخ پرسیاری کرد ئایا ئەم جورە شێرپەنجەیە لە ئاڵمان دا هەیە یان نا ؟

پزیشکی ئێرانی وڵامی دایەوە ئەم جورە شێرپەنجەیە لە ئاڵمان دا نیە.

زائربرۆخ نامەی دوکتۆرای پزیشکی ئێرانی وابۆ فرێ دا کە لاپەرەکانی بە ژوورەکەدا پرژ و بڵاو بوونەوە، گوتی کەواتە ئەوەی تۆ نووسیوتە نامەیەکی پزیشکی نیە !.

پزیشکی ئێرانی لاپەرەی نامەکەی خۆی هەڵگرتنەوە و لەژوورەکە چووە دەرێ و بە رێنوێنی یەکی تر لە مامۆستاکان نامەزانستیەکی دیکەی نووسی.

بەلەبەرچاو گرتنی ئەم پێشینەیە دوکتۆر راسێل لەدوای ئەوەی زائربرۆخ بە کێردی نەشتەرگەری هێرشی بۆ دوکتۆر مادلینێر برد و ئەوکاتەی گرتبوویان و ئەویش خۆی رادەپسەکاند، راپۆرتێکی ئامادەکرد و بۆدوکتۆر" هاڵ " یشی نارد و رەپ وراست زائربرۆخی بە بەرپرسی کوشتنی نەخۆش لەقەڵەم دا و گوتی کە ئەم پیاوە ئیتر نابێ دەس بۆ نەشتەرگەری بەرێ .وەزیری تەندروستی ئاڵمانی رۆژهەلات لەپاش دیتنی راپۆرتەکە دوکتۆر راسێل و دوکتۆر هالی داوا کردە لای خۆی.

دوکتۆر راسێل بەرلەو راپۆرتە دەگەڵ دوکتۆرهاڵ سەبارەت بە دوکتۆر زائربرۆخ دوا بوو،لەدوای ئەوەی کەدەگەڵ دوکتۆر هاڵ چوونە لای وەزیری تەندروستی پوختەی وتووێژەکەی دەگەڵ دوکتۆر هالی بە وەزیری تەندروستی راگەیاند، هەڵیدایە ئێمە هەموو شاگردی زائربرۆخین و ئاگاداری بلیمەتی ئەوین بۆ نەشتەرگەری بەڵام ئەو پیاوە ئەمرۆ شێتێکە و نابێ رێگە بدرێ لەمەو بەدوا کێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێ .

وەزیری تەندروستی گوتی من پێم خۆش نەبوو ئەو بارەنالەبارەی لەراپۆرتەکەت دا نووسیوتە بێتە پێشێ، بەڵام ئەم پیاوە جێگای سەرنج و پشتیوانی کەسە بەدەسەڵاتەکانی حیزب و دەوڵەتە و من نامەوێ لەبارەی وی دا دەس بۆ زۆرودەسەڵات بەرم.

دوکتۆر راسێل هەڵیدایە لەگەڵ خۆی قسە بکە و پێشنیاری پێ بکە با خانەنشین بێ و ئەگەرچی زائربرۆخ هێندە بایەخ بۆ کێشەکانی مایەکی دانانێ بەڵام چوونکە مرۆڤەو هەرمرۆڤێکیش بۆ درێژە دانی ژیانی حەوجێی کەلوپەل وپێداویستیەکانی مایەکیە، ئەگەر بزانێ لەپاش خانەنشین بوون ئەو مووچەو بەراتەی ئێستای دەدرێتێ رازی دەبێ دەس لەکار بکێشیتەوە، دەبێ بۆ رازی کردنی وی گەڵاڵەیەکی یاسایی پەسند بکەیت کە مووچەو پاداشەکانی ئیستای هەتا ئەو رۆژەی زیندووە پێ بدرێ .

وەزیری تەندروستی گوتی من ئەم مەبەستە لەکۆبوونەوەی ئەنجومەنی وەزیران دا دێنمە بەر باس و لەدوای رەزامەندی وەزیرەکان زائربرۆخی ئامادە دەکەم لەبۆ باس و قسەلەسەر کردن بەڵام رەنگە ئەو بۆ گوت وبێژ نەیەتە لای من .

دوکتۆر راسێل گوتی ئەگەر بانگت کرد و نەهات ئێوە خۆتان بچنە لای.

*بابەتی خانەنشین کردنی زائربرۆخ*

ئەنجومەنی وەزیرانی ئاڵمانی رۆژهەڵات رەزامەندی خۆی لەگەڵ دیمانەی وەزیری تەندروستی نیشان دا، بریار درا کە وەزارەتی تەندروستی گەڵاڵەی یاسایی خانەنشینی زائربرۆخ لەگەڵ مافی کەڵک وەرگرتن لە گشت پاداشەکانی خزمەت،ئامادەبکا،هەرلەبۆیە وەزیری تەندروستی زائربرۆخی بانگ کردە لای خۆی.

کەچی، بەپێچەوانەی چاوەنۆڕی وەزیری تەندروستی، نۆژداری بلیمەت چووە دیدەنی .

ئەوی رۆژێ دەگەڵ ئەوەی لە هۆدەی چاوەنۆڕی وەزیر دا چەند کەس چاوەرێی دیداری بوون هەرکە هەواڵیان پێ دا زائربرۆخ هاتووە، وەزیری تەندروستی بۆخۆی هەتا هۆدەی چاوەنۆڕی هاتە پێشوازی و بەو دالآنەی دا رێنوێنی کرد کەلەنێوان ژووری کاری و هۆدەی چاوەنۆڕی دا هەڵکەوت بوو، لەژووری کاری خۆی دا هات لەلای دانیشت و گوتی بروا بفەرموو من ئەمرۆ لە بینینی گیهیم رات (=بلیمەت، چاران، یان مامۆستای لەرادەبەدەر) گەلێک کەیف خۆش بووم.

لەگەڵ ئەوەی وەزیری تەندروستی دەیەویست مزگێنی بدا بە زائربرۆخ کە ئەگەر خانەنشین بکرێ مووچەو پاداشەکانی تا کۆتایی تەمەن وەردەگرێ، نەیدەزانی بابەتی سەرەکی دیدارەکە چلۆن بێنیتە گۆرێ، سەرەنجام گوتی؛ ئەی گیهیم رات بەمنیان گوت ئێوە وازتان لێیە پاڵ دەنەوەو دەست لەکار وەکێشن.

زائربرۆخ پرسی لەکیت ئەم قسەیە زانیوە ؟.

وەزیری تەندروستی لەولآم دا گوتی هەروا دەماودەم بیستوومە.

زائربرۆخ گوتی من ماندوو نیم هەتا دەس لەکار وەکێشم.

وەزیری تەندروستی کە گوێ بیس ببوو کەچەند ساڵ لەمەو بەر،دوای هاتنی روسەکان بۆ بەرلینێ زائربرۆخ بە نێردراوی مارشاڵ ژوکۆفی گوتبوو کە دەست لەکار دەکێشێتەوە، هەڵیدایە مەگەر ئێوە

لەساڵی ١٩٤٥بە نوێنەری مارشاڵ"ژوکۆف"ت نەگوت پێت خۆشەخانەنشین بی.

زائربرۆخ لەپشت چاویلکەکانیەوە چاوەگەشەکانی دەچاوی وەزیری تەندروستی بڕی و گوتی،هەرگیز ئەم قسەیە لە دەمی من نەساتۆتە دەرێ .کە من وازم لێیە خانەنشین بم، چوونکە ئەوێ ڕۆژێش وەک ئەمرۆ درێژەدانی ژیانم بەسراوە بە کارەکەم بوو و ئەز بەبێ کارکردن نەمدەتوانی درێژە بەژیانم بدەم.

وەزیری تەندروستی دەریبڕی کە بەو پێودانە سەرۆکی تەندروستی سپای سوور کەلە لایەن مارشاڵ ژوکۆفەوە لەگەڵ تۆ دوا دەستی دەقسەی ئێوە وەرداوە.

زائربرۆخ گوتی من دەگەڵ وی سەبارەت بە خانەنشین بوون نەدوام و تەنیا گوتم پێم خۆش نیە بچمە موسکۆ و لەوێ کاربکەم وئەگەر ناچارم بکەن بچمە موسکۆ لەکار دەس دەکێشمەوە،ئیستێک بێدەنگی داوەستا، زائربرۆخ کەلەو ڕۆژی دا هۆش و ئاوەزی ئاسایی و لەسەرخۆ بوو، لەوەزیری تەندروستی پرسی ئایا سەبارەت بە خانەنشین کردنی من ئەمرێک بۆ جەنابت دەرچووە ؟

وەزیری تەندروستی پرسیاری کرد لەلایەن کێڕا ئەمر بۆ من دەرچوو بێ؟

زائربرۆخ گوتی :لەلایەن دەوڵەتەوە.

وەزیری تەندروستی لە وڵام دا گوتی هیچ کەس سەبارەت بە ئێوە ئەمرێکی بۆ من دەرنەکردووە، بەڵام هەر وابە گوتە بیستوومە کە پێت خۆشە ئیسراحەت بکەی و ئەگەر وازت لە سانەوە هەبێ ئێمە

یاسایەک بۆ پەسند کردن پێشکەش دەکەین هەتا تەواوی مووچەو پاداشەکانی کە ئەمڕۆ وەریاندەگری هەتا مردنێ پێت بدرێ.

زائربرۆخ گوتی هەروەکو باسم کرد ژیانی من بەسراوە بە کارەکەمە، من بەبێ کارکردن ناتوانم بژیم و پێم خۆشە تا ئەو رۆژەی زیندووم درێژە بە کار بدەم.

وەزیری تەندروستی هەڵیدایە لەم وڵاتەو لەوڵاتانی تر هەرکەس ناوی ئێوەی بەرگوێ کەوتبێ پێی خۆشە هەمیشە درێژە بە کار بدەی و بەو بلیمەتیەی خۆت هەمووساڵێ کۆمەڵێکی لە مەرگ رزگار کەی، بەڵام سروشتی ژیان ئاوایە کە هەرکەس لەدوای ماوەیەک ئەرک کێشان وکار کردن هەست بە ماندوویەتی دەکا، تەنانەت بلیمەتی وەک ئێوەش رەنگە لەم زاکون و یاسا هەمەکیە هەڵنەوێردرێن، ئەو کاتەی کە ئێمە لەدوای تەمەنێک کارکردن هەستمان بە ماندووبوون کرد واباشە دەس لەکار وەکێشین و بسێینەوە و بیرەوەریەکانمان بنووسینەوە... هەر بەراستی ئەی مامۆستای زاناوبلیمەت بەتەما نی بیرەوەریەکانی خۆت بنووسیەوە و ئایاسەرنجت داوەتە ئەوەی کە ئەگەر بیرەوەریەکانی ئێوە بە شێوەی کتێب بڵاو بێتەوە چ کەڵکێکی بۆ نەوەکانی داهاتوو دەبێ ؟ ئەگەرچی ئەمڕۆ ئەرکی خزمەتەکانی مەزنت لەسەرشانە بۆ هاوجسنەکانی خۆت و تائێستا هەزاران کەست لە مردن رزگارکردووە، بەڵام نەوەکانی داهاتوو لە تاقی کردنەوەکانتان کە رەنگە بێ هاوتا بن بەهرەمەند نابن ئەگەر بیرەوەریە زانستیەکانتان بە شێوەی کتێب بڵاو بکرێتەوە.

وەزیری تەندروستی وای هەست پێکرد کە بۆئەوەی زائربرۆخی لە درێژەدانی نەشتەرگەری بگێرێتەوە بیانوویەکی کاریگەری دۆزیوەتەوە، ئەگەر زائربرۆخ دەست لە نوژداری بکێشێتەوەو خەریکی نووسینەوەی بیرەوەریەکانی بێ نارازی نابێ و لایەنگرەکانیشی دەم لەنارازی بوون نادەن.

لەبەر ئەمەبوو کە وەزیری تەندروستی بەگومانی خۆی بەستێنێکی لەباری بۆ خانەنشین کردنی زائربرۆخ بەدەس هاوردبوو،مامۆستای پتر دنە دا وگوتی:

ئێمە راناوەستین هەتا بیرەوەریەکانت تەواو دەبێ وهەنگی چاپی بکەین،بەلکو هەربەشەی ئامادە بوو ئێمە چاپی دەکەین، ئایا تا ئێستا هیچت بۆ نووسینەوەی بیرەوەریەکانی خۆت کردووە، ئایا دەشێی پێش بینی بکەیت کە بیرەوەریەکانت، ئەوکاتەی ببێتە کتێب چەند بەرگ دەبێ، ئاخۆ دەزانی کە بیرەوەری ئێوە لەنێو بیرەوەری زانایانی جیهاندا،لەرابردوو و ئێستا دا،بەرچاوترین کتێبی پزیشکی دەبێ. وەختێکی وەزیری تەندروستی بێدەنگ بوو پروفیسۆر زائربرۆخ ئێستێک راما و ئەوجار گوتی: من سەبارەت بەو کارانەی کردوومن یادداشتی فرەم هەنەکەهێشتا بە شێوەی کتێب دانەرێژراون،بەلام پێش بینی دەکەم بیرەوەریەکانی من دە بەرگ دەبن.

وەزیری تەندروستی گوتی: ئەی مامۆستای بلیمەت مەیەڵە وەشانی بیرەوەریەکانت وەدرەنگ بکەوێ، چوونکە لەبەر ناسەقامگیر بوونی بارودۆخی ئورووپاودنیایە مەترسی ئەوە هەیەکەهەرگیز بڵاونەکرێتەوە، لەگەل ئەوەی کەهێشتا وێرانەی کاولەکانی شارەکانمان هەروا

لەگۆڕین باس لە شیمانەی هەڵگیرسانی شەڕێکی تر لەئارادایە،لەباروودۆخێکی نێونەتەوەیی ئاوادا هەرچەندی ئێوە بۆ وەشانی بیرەوەریەکانتان پەلە بکەن باشترە،من پێم دەکرێ یەک یان دووکەس لە کارمەندانی وەزارەتی تەندروستی بخەمە ئیختیاری جەنابت هەتا بۆ نووسینەوەی بیرەوەریەکان یامەتیت بدەن.لەگەڵ ئەم گشتە بەڵێن وڕێزلێنان و بەدەورداچوونە زائربرۆخ نەکەوتە ئەو داوەی کە وەزیری تەندروستی بۆی نابۆوە و گوتی من بۆ نووسینی بیرەوەریەکانم پێویستیم بە یارمەتی کەس نیەو دەتوانم لەپاش کارەکانی ڕۆژانەم هەموو شەوێ دوو یان سێ کاتژمێر لەوەختی خۆم بۆ نووسین تەرخان بکەم.

وەزیری تەندروستی هەڵیدایە دوو سێ کاتژمێری هەموو شەوێ بەس نیەو دەبێ ڕۆژانەش خەریکی نووسین بی .

زائربرۆخ گوتی من ئێوارانە کاری نەشتەرگەریم نیە،هەموو ئێواران دەتوانم کاتەکەم بۆ نووسین تەرخان بکەم بەڵام لەکاری سەرەکیم کە نوژداریە دەس هەڵناگرم وهەتا زیندووم ئەم کارە درێژە دەدەم.

لەدوای ئەم وتەیە زائربرۆخ بۆ ڕۆیشتن لەسەر جێی خۆی هەستا،وەزیری تەندروستی ناچارهەتا بەر دەرگا بەرێی کرد،ئەودەمەی مامۆستا لەهۆدەی چاوەنۆڕی وەژوور کەوت تا پێی دا رابرێ،گشت ئەو کەسانەی لەوێدا چاوەڕێی دیتنی وەزیربوون لەبەری هەستان،زائربرۆخ لەپاش وەدەرکەوتن لە وەزارەتی تەندروستی سواری ماشێنەکەی خۆی بوو، گەراوە نەخۆشخانە و بەدوکتۆر مادلینێری گوت نازانم کێ بە وەزیری تەندروستی گوتوە

کە من دەمەویٚ خانەنشین بم لەحاڵێک دا کەمن قەت بەو تەمایە نەبووما.

رەنگە پێت وابێ لەدوای ئەو روداوەی لە نەخۆشخانەی شاریتی قەوماو بەدرێژی باسی کرا،بەریان بە درێژەدانی کاری زائربروٚخ لەو نەخۆشخانەدا گرت و پێیان گوت بچێتەوە ماڵی خۆی.بەلاّم ئاوا نەبوو،هەر ئەو رۆژەی کە چووبوە دیدەنی وەزیری تەندروستی دیسان هەر لەو نەخۆشخانەیەدا درێژەی بەکاری خۆدا،بەم شێوەیەو بەپێی خوو ونەریت دەستەکانی شووشت ورووپۆشی خاوێنی دەبەر کردو دەستەوانەی نوژداری دەدەستان کردو بەرەو ژووری عەمەلیّ رۆیی.

رۆژی دوای ئەو روداوە،دوکتۆر راسێل کەدەزانین کاری وی راگەیشتن بەوەزعی ئەو کەسانە بوو کە لەکاتی عەمەل یان لەپاشاندا دەمردن،هاتە نەخۆشخانە وتەرمی ئەوژنەیان پێ نیشان دا کەهێشتا لەنەخۆشخانە دابوو،شکی نەما کە زائربروٚخ ئەو ژنەی کوشتووە،راپۆرتێکی ئامادە کردهەتا بەهۆی سەرۆکی نەخۆشخانەبدریّ بەوەزیری تەندروستی.

سەرۆکی نەخۆشخانەگوتی: لەپاش ئەوبەدناویەی رۆژی رابردوو محاڵە ئێمەبتوانین رازی بین زائربروٚخ جارێکی دی پێ دەژووری عەمەلیّ بنێتەوە،ئەگەرشارەداری"درسێد" پێی گوتین بۆ یەکیّ لەخزمەکانی بەدەستی زائربروٚخ کوژراوە رەپ وراست حاڵی دەکەین کە بەرپرسی کوژرانی ئەو ژنە زائربروٚخ و ئەو بەرپرسەپلەبەرزانەی حیزبین کەپشتیوانی لەزائربروٚخ دەکەن وئیزنیان پێداوە کەدیسان

درێژە بەنوژداری بدا،دەنا ئێمەلەم نەخۆشخانەیە ژووری عەمەلی لەسەر دادەخەین. تۆش کە بەرپرسایەتی راگەیشتن بە مردووەکانی ژێرعەمەل و دوای نەشتەرگەریت پێ ئەسپێردراوە لەهەمووان زیاتر شیاوی دەمەتەقەی گەڵ زائربرۆخی، بچووەماڵی و پێی بڵێ کەلەگەڵ خانەنشین کرانی با رازی بێ وئەوموچەوپاداشەی کە ئێستاو،ریدەگرێ بۆی ببرێتەوە،ئەگەر رەزامەندی نیشان نەدا تێی بگەیەنە کەلەمەو بەدوا لەهیچ نەخۆشخانەیەک ئیزنی کارکردنی پێ نادرێ.

ئەورۆژەی کە راسێل چووەماڵی زائربرۆخ ماوەی سێ کاتژمێر پێکەوە دوان،کەگێرانەوەی دووروودرێژ وبێ سوودە،پوختەی گوتەکانی دوکتۆر راسێل ئەمەبوو کە هەوڵی دا زائربرۆخ تێبگەیەنێ کەئەوبەهۆی رێک هاتنی بەشێک لەتەنراوەکەی مێشکی گیرودەی نەخۆشی خەرفان بووە و ئەو شێتیە هەمیشە لەکاتی عەمەلی نەشتەرگەری دا لێی دەردەکەوێ،هەربۆیە نابێ ئیتر کاربکا مەگەر چارەسەر بکرێ و شک نەمێنێ کە ئیدی تووشی ئەو شێتیە نابێ.

دوکتۆر راسێل هەوڵی دا بەزائربرۆخ بڵێ کەئەویش وپزیشکانی تری ئاڵمان لە دەس لەکارکێشانەوەی بە ناچاری زائربرۆخ بە پەرۆشن و نەیانەویست پزیشکی و نەشتەرگەری ئاڵمانێ لە هاوکاری مامۆستایەکی وا بلیمەت بێ بەش بێ بەڵام ئەودەمەی کە یەکێ لەنزیکانی هەرەخۆشەویستی مرۆ دەمرێ ،ئاخۆ بۆمان دەردەخسێ لەبەر ئەو خۆشەویستیەی هەیە لە شاردنەوەی رێگە بگیرێ ؟

هەرچەندی راسێل تێکۆشا زائیربرۆخی رازی بکاو ئەو لاپەرەی حازری کردبوو پێی ئیمزا بکا زائیربرۆخ گوێی نەدایەوگوتی نامەوێ خانەنشین کرێم،دوکتۆر راسێل لەدوای سێ کاتژمێر دەمەتەقەو گۆت و بێژ رایگەیاند لەوە پتر ناتوانم لەگەڵ جەنابت بدوێم ،تەنیا ئاگادارت دەکەمەوەکەلەمەو بەدوا نەلەنەخۆشخانەی شاریتی و نەلەهیچ نەخۆشخانەیەکی تردا رێگەی ئێوەنادەن بۆ ژووری عەسەلێ.
لەدوای ئەوەی راسێل لەماڵی زائیربرۆخ وەدەرکەوت ئاکامی باس وخواسەکەی خۆی لەگەڵ ئەو پیاوە بە ئاگاداری وەزیری تەندروستی راگەیاند وگوتی کە زائیربرۆخ رازی نیە خانەنشین بکرێ،جاچوونکە ئەو بە خانەنشین بوون رازی نیە دەبێ بەپێی یاساکانی گشتی خانەنشین کردن لەسەرکاری لابەی و خانەنشینی بکەی.
لەو زەمانی دا تەمەنی بە زۆری خانەنشین کردن بۆ ئەو کەسانەی لە بودجەی گشتی ولات مووچەیان وەردەگرت،تەمەنی حەفتا ساڵەیی بوو.
بەلام ئەوە هەلاواردەشی هەبوو، دەوڵەتی ئاڵمان، لەخانەنشین کردنی هێندێک لە کارمەندانی کەلەتەمەنی حەفتا ساڵیشیان هەڵدەبرارد ،خۆی دەبارد.دیتراوە هێندێک کەسی وا کە تەمەنیان لە حەفتاش پتر بوو و ماوەیەکیش لەخانەنشینیان رابردبوو بەهۆی پێویستی بە پسپۆرایەتیەکەیان دووبارە هێنرانەوە سەر کار.
بەهەمەحاڵ،دەوڵەتی ئاڵمانی رۆژهەلات دەیتوانی زائیربرۆخی سەرەرای خواستی خۆی خانەنشین بکا، بەلام وەزیری تەندروستی بەدوکتۆر راسێلی گوت: چوونکە زائیربرۆخ ناوبانگێکی زۆری

هەیەوفرەش خۆشەویستەئەگەر بە پێچەوانەی خواستی خۆی خانەنشینی بکەین لەناوخۆ ودەرەوە رەنگ دانەوەی خەراپی دەبێ، ئەرێ تێم دەگەی کە مەبەستم لەرەنگدانەوەی خەراپی دەرەوە چیە ؟.

دوکتۆر راسێل گوتی: دەزانم کەمەبەستت ئەمەیە گەورەپیاوانی سۆڤیەت نارازی دەبن وپێیان سەیر دەبێ.

ئەوی دەمی دوکتۆر راسێل جانتاکەی کردەوەو پەروەندەیەکی لێ دەرێناو هەڵیدایە :ئێمە ئەم پەروەندەیەی کە پڕە لەجینایەتە شێتانەکانی زائربرۆخ بۆ سەرکردەکانی سۆڤیەت دەنێرین،هەتا ئەوان بزانن کەئێمە ناچاربووین زائربرۆخ خانەنشین بکەین.

وەزیری تەندروستی گوتی:لەگەڵەوەش من وام پێ باشترە زائربرۆخی بە رەزامەندی خۆی خانەنشین بکەین،سەبارەت بەم مەبەستە لەگەڵ دوکتۆر"براگش" وتووێژ دەکەم،هیوادارم ئەو بتوانێ زائربرۆخ رازی بکا بۆخانەنشینی.

دوکتۆر براگش سەرۆکی زانکۆی پزیشکی بوو لەبەرلینی رۆژهەلات، کۆمەڵگای ئاڵمانی زۆریان رێز لەسەرۆکانی زانکۆ دەگرت و ئێستاش ئەوان فرە جێگای رێزن لە ئاڵمان دا.

سەرۆکی زانکۆکانی پزیشکی لەئاڵمانێ هەمیشە لەنێو مامۆستاکانی توێژەری پزیشکی یان نوژداری هەڵدەبژێردران، زەمانی پێشوو ئەگەر لەخودی ئاڵمان مامۆستایەک وەگیر نەکەوتبا کە هەل ومەرجی بۆ بوونە سەرۆکی تێدابا درێخیان نەدەکرد لەوەی کە مامۆستایەکی دەرەکی بکەنە سەرۆکی زانکۆ، هەروەکی لەسەدەی شازدەهەمی

زایینـی "پاراسـلێس"ی سویـسی یـان کـرد بـە سـەرۆکـی زانکـۆی پزیـشکی،پاراسلێس یـەکـەم پزیـشکە کـە بـەهـۆی ئاسـن رفێن (مگناتیس)هیندێک نەخۆشی چارەسەر کردن،یانی بەهـۆی ئـەو خاسیەتەی لە مگناتیس دا هەیەچارەسەری بۆ دوزینەوە.

شێوەی دەرمـان کردنـی پاراسـلێس ئـەمـە بـوو کـە مگناتیـسی لـەو ئەندامەی نەخۆش دەبەست لە ئازاری هەبوو،لـەپـاش چـەنـد رۆژ ژان بەتەواوی لەنێو دەچوو بەبێ وەی دەرمان دەرخواردی نەخۆش بدا.

براگش،سـەرۆکـی زانکـۆی پزیـشکی بـەرلینـی رۆژهـەلات،کـەسـێ بووکەلەسالی ١٩٣٥لەگەل"دێماک"ی زانای تری ئالمانی دەرمانەکانی نێودێر بە"سولفامید"ی بۆ دەرمانی هێندێک لە نەخۆشیان دۆزیەوە.

لەو زەمانی دا دەرمانەکانی ناودێر بە سولفامید دەنگدانەوەیەکی پتـر لەدۆزینەوەی دەرمانی ئانتی بیوتیکی"پنی سیلین"ی دایەوە،چوونکە بە دەرمانەکانی سولفامید دەردو نەخۆشی زیاتر چارەسەر دەکران و ئـەوەش کـە دەرمانـەکـانی سـولفامید "دەرزی" نـەبـوو ،بـەلکـو دەرخواردی نەخۆشیان دەدا و دژواریەکانی هەلگرتن و لێدانی پینـی سیلینی نەبوو.

براگش سەرۆکی زانکۆی پزیشکی بەوپلە زانستیە وئـەورێـزەی لـەلای پزیشکان ونوژداران و کۆمەلگای ئالمانیدا هەیبووتـەنیـا کـەسـێ بـوو کە دەیتوانی زائربرۆخ رازی بکا بۆخانەنشینی خۆی.

دوکتۆر براگش نامەیەکی بەخەتی خۆی (نەک بە ماشێنی نووسین = رونیـو) بـۆزائربرۆخ نووسـی بانگێـشتنی کـردەمـالی خـۆی بـۆ چـای ئێوارانە،دوای ئەوەی زائربـرۆخ هـات پێشوازی لێکرد بـەخـۆی و ژن

وکور وکچەکەی هەتا بە دیدەنیەکی دوستانە لەقەڵەم بدرێ و لایەنی فەرمی تێدا رەچاو نەکرێ.

سەرۆکی زانکۆی پزیشکی لەزۆر بارانەوە دوا، جگەلە ئەو شتەی هۆی سەرەکی بانگێشتنی ئەو نوژدارە مەزنە بوو.

خودی زائربرۆخ ،کەپێشتر گوتمان لەوکاتی دا نەبێ کە لەسەری دەدا،خاوەن هۆش و هەستگەلی کامڵ بوو،تێدەگەیشت کەبراگش بۆ مەبەسنێکی تایبەت ئەوی بانگێشت کردووە؛گوتی من پێم وایە ئەم کۆبوونەوە دۆستانەیە بەبێ هۆ نیە و ئەتۆ کارێکت بەمنە.

براگش لەولام دا گوتی: بەڵێ فێردینانەی بەرێز (زائربرۆخ ناوی چکۆڵەی فێردیناند بوو)، من دەمەوێ نسحەتێکی چکۆڵەت بۆبکەم چوونکە خۆشم دەوێی

زائربرۆخ پرسی: ئەو نسحەتە چیە؟.

براگش گوتی بەبێ ئەوەی ویستبێتم پێت هەڵبڵێم،جەنابت نەشتەرگەرێکی هەرە بەرچاوی کەلە پێنج سەت ساڵ بەم لاوە لەجیهانی پزیشکی دا بەدی هاتووە و لەماوەی پێنج سەدە لەپزیشکی دا کەس نیە لەگەڵ تۆ پێکهەڵکێشرێ، ناوی هەرکەس بهێنرێ لەدواوەی تۆیە ئەویش بە مەودایەکی زۆر،من پێم خۆشە شانازیەکان وناوی مەزنی ئێوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەمێژووی زانستی پزیشکی ونوژداری دابمێنێتەوەو هیچ پەڵەیەک توانای ئەوەی نەبێ لە ورشەی ناوت کەم کاتەوە.

زائربرۆخ هیچی نەگوت و چاوەرێی درێژەی قسەکانی براگش مایەوە.

سەرۆکی زانکۆی پزیشکی گوتی:ئێوە لەمن باشتر دەزانن نەشتەرگەرێک هەرچەندی گورپوتواناى هەبێ رۆژێک لەبەرتێپەرینی ساڵەکانی تەمەن تووشی سستی دەبێ وئەگەر بەهۆی"زەرەبین" سۆمای چاوانی راگرێ (زائربرۆخ هەمیشە چاویلکەی دەچاوان دەکرد) ناتوانێ پێش بەلەرزۆکی دەستەکانی بگرێ و ئەوێ رۆژێ ناچاردەبێ دەس لەکار بکێشێتەوە، ئاخۆ واباشترنیە کەجەنابت لەهەرەتی شانازی وناوبانگ وخۆشەویستی دادەس لەکار بکێشیەوە هەتاوەکونێ ناوی مەزنی ئێوە هەمیشە بەگەورەیی لەمێژووی پزیشکی ونوژداری دا بمێنێتەوە،ئەوەندی تەمەن ماوە خەریکی نووسینی بیرەوەریەکانی پزیشکی خۆت بی هەتا گشت لا و تەنانەت داهاتووان کەڵکی لێوەرگرن.

سەرۆکی زانکۆی پزیشکی دوای ئەم گوتەیە چوونکە پێشبینی دەکرد قسەکان دەکشێنە جێگای هەستیار،چاوی لە ژن و کیژ و کورەکەی هەڵتەکاند کە لەژوورێ بچنەدەرێ.

لەپاش وەدەرکەوتنی ئەوان زائربرۆخ گوتی: من لە وتەکانی بەرێزتان وا هەڵدەکرێنم کە بە تەمان من لەسەر کار لابەرن .

براگش گوتی: فێردیناندی ئازیز،من دەیسەلمێنم کەهەمیشە ئێرەیی بەجەنابت بردراوە وئەمرۆش ئێرەییت پێدەبەن بەلام بیسەلمێنە کەمن ئێرەییت پێ نابەم چوونکە جگەلەسۆزی دۆستانە خۆمن نوژدار نیم هەتا ئێرەیی هاوکاربوون لەدلم دا چەکەرە بکا، ئەوەی دەیلێم لەروی دۆستایەتی و خۆشەویستنی شانازیەکان و ناوی باشی جەنابتە.

لەبەر ئەمەیە کە نسحەتت دەکەم، رادەسپێرم کەدەگەڵ خانەنشین بوونت رەزامەندی نیشان بدە. من دەزانم کەهەمیشە جەنابت زانستت بۆ خزمەت بە جسناتی مرۆڤ دەویست و دەتەوی وهەرگیز لەبیری ئەوە دانەبوویە لەرێگای زانست و هونەری خۆتەوە ماڵ وەسەریەک نێی،لەگەڵەوەی کە دەتوانی هەرچی ویستبات وەرت گرتبا لەوشاو سەرۆک ولاتانەی چارەسەرت کردوون، ئەمرۆ ،بەهۆی دەروەست نەبوونی ماڵی دنیاو دراووپووڵ، هیچت نیە تادوای دەسلەکار هەڵگرتن پێی بژی. من متمانەت دەدەمێ بەپێی ئەو یاسایەی پەسند دەکرێ ،ئەو مووچەوپاداشەی ئێستای وەردەگری هەتا کۆتایی تەمەن پێت بدرێ،بەشێوەیەکی وا هەرگیز ئێوە لەباری گوزەرانەوە هەست بە نارەحەتی نەکەن.

زائربرۆخ لەدوای بیستنی ئەو قسانە گوتی: ئەمن زۆرم پێ سەیرە کەلەبۆچی ماوەیەکە پێدادەگرن من لەکار دەس وەکێشم وخانەنشین بم.

براگش گوتی:فێردیناند گیان،بەوپەری رێزەوە کەمن بۆتۆ قایلم وپێم وایە لەبلیمەتەکانی ئادەمیزادی، دەبێ پێت بڵێم کەتۆ ماوەیەکە لەکاتی عەمەل کردنێ دا تێکدەچی و ئەونەخۆشەی عەمەلی دەکەی دەیکوژی،ئەگەربیانەوێ رێگەت پێ بگرن بەوکێردەی بەدەستت وەیە هێرشیان بۆ دەبەی وبەداخەوە تا ئێستا کۆمەڵێک نەخۆش بەدەستی تۆ کوژراون وتۆش لەوشێتیەی خۆت ئاگادار نی،بۆیە پاش ئەوەی ماوەی سەرهەڵدانی تێکچوونەکەت تێپەڕی لەبیرت دەچێتەوە چت کردووەوهەتا ئەمرۆش لەگەڵ ئەوەی کە چەند قەتڵت لەدەس

قەوماون بۆرێزگرتن لەرابردووی گرشەدارت دەستیان بۆئەوەی درێژ نەکردووە کە بتخەنەبەر لێکۆڵینەوەی یاسایی، بەڵام لەمەوبەدواوە محاڵە رێگەبدەن لەنەخۆشخانەی شاریتی یان هەر نەخۆشخانەیەکی تری کەلەژێرچاوەدێری وەزارەتی تەندروستی دابێ دەست بۆعەمەلێک بەری.

من دڵنیام کەتۆ ئێستا، ئەو جینایەتانەی لەکاتی عەمەلی نەشتەرگەری داکردووتن،نایەنەوە بیرت، چوونکەلەتایبەتمەندیەکانی خەرفان (شێتی جارجارە)یەکێ ئەوەیە کەپیاو یان ژنی تێکچوو پاش ئەوەی ماوەی هەڵچوونی شێتیەکەی تێپەڕی ئەوکارانەی لەو کاتی دا کردوونی فەرامۆش دەکا،تۆ کە نەشتەرگەرێکی بلیمەتی باشتر لەمن دەزانی کە خەرفان چلۆنە،لەهەرکەس دا ئەوشێتیە لەساتێکی تایبەت دا سەرهەڵدەدا و مەخابن شێتی جارجارەی تۆ هەمیشە لەکاتێکی وادا خۆدەنوێنێ کەلەژووری عەمەلێ دا ،کێردی نەشتەرگەریت بەدەستەوەیەو خەریکی عەمەل کردنی.

بەڵام زائربرۆخ دیسان قەناعەتی نەهات ونەیدەویست دەگەڵ خانەنشین بوونی خۆی رەزامەندی دەربڕێ، براگش پێی گوت:فێردیناند،ئەوکاتەی کە دەبینی هیچ کەس خوازیاری درێژە پێدانی کاری تۆ نیە وهەموو پێدادەگرن کەنابێ ئیتر کار بکەی،بۆدرێژەدانی کارت بۆ ئەوەندە پێداگری دەکەی،ئایا ئەم جەخت کردنە دەگەڵ پلەوپایەی زانستی تۆ دژایەتی نیە ؟.

زائربرۆخ بەهۆی پێداگری سەرۆکی زانکۆی پزیشکی رەزامەندی دەگەڵ خانەنشین بوونی خۆ راگەیاند وبریار درا براگش رازی

بوونەکەی بە ئاگاداری وەزیری تەندروستی بگەیەنێت وزائربرۆخ لەرۆژێ دیاریکراودا بچێتە لای وەزیری تەندروستی و بەنووسراو رەزامەندی خۆی پێشکەش بکا هەتا وەزیری تەندروستی کارە قانوونیەکانی پێوەندی دار بە خانەنشین بوونەکەی جێبەجێ بکا.

براگش، کەپێشبینی دەکردزائربرۆخ چوونی لای وەزیری لەیاد دەچێتەوە، یان ئەگەر لەبیریشی بێ ناچێ لە رۆژی دیاریکراودا چووە ماڵی نوژداری مەزن وئەوی لەگەڵ خۆی دا بردە لای وەزیری تەندروستی.

وەزیری تەندروستیش چوونکە پێشبینی دەکرد زائربرۆخ رەنگەخۆبەدەستەوەنەدا داوای لەدوکتۆر هاڵ ودوکتۆر راسێل و سەرۆکی نەخۆشخانەکرد کەلەوەزارەتی تەندروستی دا حازر بن و پەروەندەی جینایەتەکانی نابەقەستی زائربرۆخیش لەگەڵ خۆیان بێنن،هەتائەگەر پێویستی کرد بەڵگەنامەکانی ئەو پەروەندەبە بە نوژداری مەزن نیشان بدەن.

لەدوای ئەوەی کە براگش لەگەڵ زائربرۆخ هاتنە وەزارەتی تەندروستی ئەوی بەتەنیایی ناردە ژووری وەزیر و بۆخۆی چووە لای دوکتۆر هاڵ وئەوانی ترلەژوورێکی دیکەی وەزارەتی تەندروستی دا.

وەزیری تەندروستی بەرێزەوە پێشوازی لە زائربرۆخ کردوگوتی زۆر پێ کەیف خۆش بووم کەتەمات گرتووەلەمەوبەدواوە دەس بەکارێکی فرە بەکەڵکی کە دەبێتە هۆی پەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتووی ئاڵمان و بەڵکو رەگەزی بەرەی مرۆڤ وهەروەها دەبێتەهۆی نەمری ناوی مەزنی خۆتان،بکەی،من بەڵێنتان پێ دەدەم

بیرەوەریەكانت بەشێوەی كتێب بڵاودەبێتەوەوبۆئەوەی خەڵك زووترکەڵک لەئەزموونەكانی ئێوە وەرگرن هەرچەندێكی بیرەوەریەكانت ئامادە بوون بەرگ بەبەرگ بڵاوی دەكەینەوە،بەڵام بۆ ئەوەی تەشریفاتی یاسایی جێبەجێ بكرێ تكادەكەم تەمای خۆت بێنە سەر كاغەز.

زائربرۆخ لەپشت چاویلكانەوە،چاوەكانی خۆی،كەوەک چاوی زاروی‌ـان بێگەردوپاک بوون،دەچاوی وەزیری تەندروستی بڕین وپرسی؛ مەبەستی ئێوەلەوەی كەمن تەمای خۆم بێنمە سەركاغەز چیە ؟.

وەزیری تەندروستی گوتی: مەبەستم ئەوەیە كە بنووسی پێت خۆشە خانەنشین ببی.

زائربرۆخ وڵامی دایەوە: ئەز پێم خۆش نیە خانەنشین ببم.

وەزیری تەندروستی پرسی:مەگەر ئێوە وێڕای گوت وبێژ دەگەڵ دوكتۆر "براگش"ی سەرۆكی زانكۆی پزیشكی رەزامەندی خۆت لەم مەوزوعە رانەگەیاند؟.

زائربرۆخ وڵامی دایەوە:لەماڵی دوكتۆر براگش ئەو پیی دادەگرت من دەس لەكار بكێشمەوە و چوونكە بایەخ بۆ دۆستایەتی وی دادەنێم نەمویست وڵامی نای بدەمەوە.

وەزیری تەندروستی كە نەیدەویست بە تاقی تەنێ دەگەڵ زائربرۆخ دانیشی گوتی بەدوكتۆر براگش وئەوانی تر بڵێن بابێن، ئەوانیش لەژوورێكی ترەوە هاتنە نێو ژوورەكەی وەزیری تەندروستی.

چەند ئیستێک بێدەنگی داوەستا،پاشان وەزیری تەندروستی بەنەشتەرگەری مەزنی گوت:

بروابکە، من لە هەمووان پتر لەدەس کێشانەوەتان بەداخ دەبم چوونکە باوەرم وابووەو واشە کەئێوەلەشانازیەکانی تەندروستی ونەتەوەی ئاڵمانن بەلأم وەزعی تۆ بەچەشنێکە کەئیتر ناتوانی درێژە بەکار بدەی مەگەرماوەیەکی دووردرێژ بسێیتەوە و بکەویەبەرچارەسەرکردن ومتمانەت پەیدابێ کەنەخۆشیەکەت لەسەر نەماوە.

زائربرۆخ حاشای لەنەخۆشی خۆ کرد، وەزیری تەندروستی لەدوکتۆر راسێلی پرسی داخوا ئەو پەروەندەت لەگەڵ خۆ هێناوە .

دوکتۆر راسێل لەکیفەکەی پەروەندەیەکی دەرێناو لەپێش وەزیری تەندروستی رانا.

وەزیری تەندروستی پەروەندەکەی لێک کردەوە ورووی دەزائربرۆخ کرد وگوتی من بەوپەری پەرۆشی وداخەوە ناچارم کورتەی ئەو شتەی لەم دوسیەدا نووسراوە بۆتان وەگێرم هەتا بزانی کەلەساڵێک بەملایەوە لەنەخۆشخانەی شاریتی بەهۆی پەرتی وتێکچوونی جارجارەت تووشی چ کردارگەلێک بوویە.

ئەوجار وەزیری تەندروستی دەستی بە باسکردنی ئەوشتانەی پێوەندیان بە جینایەتەکانی نابەقەستی زائربرۆخ لەژووری عەمەلی دا بوو، کرد .

لەپاش ئەوەی کە وەزیری تەندروستی کورتەی هەریەک لەجینایەتە بەناقەستەکانی زائربرۆخی بە ناو هێنانی کوژراوەکان وچلۆنایەتی عەمەلی نەشتەرگەری ورێکەوتی قەومانی خەرابکاریەکەی بۆ نرژداری مەزن باس کرد،زائربرۆخ گوتی: ئەمانە گشت ئەو بوختانانەن کە

حەسوودان بۆيان هەڵبەستووم و من لە هەمـوو تـەمـەنم دا لـەلايـەن هەندێ لەهاوكارانمەوە  ئێرەییم پێ براوە.

وەزیـری تـەندروسـتی هـەڵیدایـە:وای دادەنێـین كـەدوكتـۆر راسـێل ودوكتۆر هاڵ وئەونوژدارانەی لە ژووری عەمەل دا یاریدەری تۆ بوونە ئێـرەییـت پـێ دەبـەن و بـەنـارەوا دەتخـەنـە بـەر تۆمـەت،ئایـا خوێنـدكارانی زانكـۆی پزیـشكیش كـەلـەبـۆ كـار فێربـوونێ لـەژووری عەمەلێ حازر بوون و تۆیان وەک خوا دەپەرست، لـەوانـە بـوون كـە ئێرەییان پێ دەبردی ؟.

ئەوەی ئەوان ئەوێ رۆژێ لەژووری عەمەلێ لەئێوەیان دی،یانی كـوت ولەتی مێشكی نەخۆشێكت وەک كێـک دەبـڕی و دەدەسـتی ئـەوانـت دەنا،ئەوەندەیان پێ سەیرو ترسێنەربوو كە نـەیـانتوانی لـەدركانـدنی خۆ بپارێزن،ئەگەر حاشای لـێ دەكـەن بـامن گـشت خوێنـدكارەكـانی زانكۆی پزیشكیت بنێرمەلای كەئـەوێ رۆژێ لـەژووری عـەمـەل بـوون هـەتـا لێپرسـینەوەیـان لێبكـەی و تێبگـەی كـەلـەوێ رۆژێ دا چـت كردووە !!.

زائربرۆخ هێشتا نەیسەلمانـدبوو كـەئـەوەی لـەپـەروەنـدەدا نووسـراوە راستە، وەزیری تەندروستی بۆئەوەی بەمشت ومـڕەكە كۆتـایی بێنـێ گوتی: جەنابی گیهیم رات ئـەم بـەرێزانـەی لێـرە حـازرن دەزانـن مـن یەكێ لەو كەسـانەم كـەفـرە رێـزی ئێـوەم لایـە ولـەنـەبـوونی ئێـوەدا هەمیشە بەرگریم لێكردووی.

منیش لەهەوەڵەوە كەگوێ بیس بووم لە وەتـاغی عـەمـەلێ بـەهـۆی فەرامۆشی و پەرتی هەستگەلەوە،بێ ئیرادە،تووشی قەتڵ دەبـی یـان

نەخۆشان نەقوستان دەکەی بەخۆم دەگوت ئێرەیی بە جەنابتان دەبەن،بەلام لەدوای بەدووداچوون بۆم دەرکەوت ئەوەی دەیلێن راستەو ئێستا من بەپێی ئەو ئەرک و بەرپرسایەتیەی لەسەر شانمە ناچارم کەئێوەلەسەر کار لادەم بابەپێچەوانەی خواستی ئێوەش بێ و لەوەش بەدواوە لەهیچ نەخۆشخانەیەکی کە لەژێر چاوەدێری وەزارەتی تەندروستی دابێ ئیزنی چوونە ژووری هۆدەی نەشتەرگەری نادرێ بەئێوە بەلام ئەو مووچەوبەرات وپاداشەی کەئەمرۆ وەریدەگری هەتا ئەو رۆژەی زیندووی ،بەپێی ئەو یاسایەی کەسبەینێ دەدرێ بەپارلمان،دەتدرێتێ.

زائربرۆخ لەدوای ئیستێک بێدەنگی گوتی: هەرچی دەتانەوێ بیکەن،بیکەن .

وەزیری تەندروستی پرسی : ئایا رازی خانەنشین بکرێی ؟.

زائربرۆخ گوتی: بەلێ.

وەزیری تەندروستی کاغەزو قەلەمێکی دادەستی"براگش"ی سەرۆکی زانکۆی پزیشکی، کەلەپەنا زائر برۆخ دانیشتبوو، هەتابیداتە وی و ئیمزای بکا.

لەگەل ئەوەی مامۆستا لەولامی وەزیری تەندروستی دا گوتی "بەلێ" ملی نەدا بۆ ئیمزاکردنی ئەو کاغەزەی کە خانەنشینیەکەی تۆمار دەکرد.

هەنگی هەستا سەرپێ وچاوێکی بە ئامادە بووان دا خشاند هەتا لەژووری وەدەرکەوێ،

براگش سەرۆکی زانکۆی پزیشکی گوتی: فێردیناند، ئیستێکی بگرە.
زائربرۆخ راوەستا و سورایەوە، براگش هەستاو بۆلای رۆیی،
نەشتەرگەری مەزنی ماچ کرد.
لەپاش وی وەزیری تەندروستی لەزائربرۆخ نزیک بۆوە،لەئامێزی
گرت. بەلام ئەوانی دی نەیانوێرا زائربرۆخ ماچ کەن چوونکە خۆیان
لە هەمبەر ویدا زۆر پێ چکۆلە بوو.

### ئاکامی پەلەی هەوالنێرێکی فەرانسەیی

وەزعی بەرلینێ لەکاتی قەومانی ئەم روداوانەدا لەباری سیاسیەوە
لەگەل وەزعی ئێستا جیاوازی هەبوو، ئەمرۆلە نێوان بەرلینی
رۆژهەلات ورۆژاوا هیچ پێوەندیەک نیەو دیوارێکی بەرزی کە شەو
ورۆژ بەهۆی قەرەول وسەگێ پارێزەر وتێلدرووو لەژێر چاوەدێری، دایە
دووبەشی بەرلینی لێک جیا کردۆتەوەو کەس ناتوانێ لەبەرلینی
رۆژهەلات بۆ رۆژئاوا و بە پێچەوانەوە بچێ.
بەلام ئەوکاتی دووبەشی بەرلین وەکو ئێستا لێک دانەبڕابوو و
هەوالنێرانی ئالمانی رۆژئاوا لەروداوەکانی ئالمانی رۆژهەلات، بە
پێچەوانەش، ئاگادار بوون، یەکەم هەوالنێری کە لە خانەنشین بوونی
زائربرۆخ ئاگاداری پەیدا کرد"پول رافۆ"ی هەوالنێری هەوالگری
فەرانسە، بوو.

ئەو، نە تەنیا پلەی زانستی زائربرۆخی لەلا بەرێز بوو بەڵکو بەیەکێ لە دۆستانی دەژمێرا، جارێکی دەگەڵ خانمەکەی لەماڵی نوژداری بلیمەت شێوی ئێوارەی خواردبوو.

پول راڤو تەلەفونی بۆ ماڵی زائربرۆخ کرد کەچی مامۆستا لە ماڵی نەبوو،خزمەتکارەکەی ولامی هەواڵنێری فەرانسەیی دایەوە ۆگوتی هەواڵی خانەنشین کرانی ،رێزدار، راستە.

پول راڤۆ کەخزمەتکارەکەی دەناسی و دەیزانی ناوی"ئان پیس"ە، بۆوەدەس هێنانی زانیاری پتر چووە ماڵی زائربرۆخ.

ئان پیس،کەدەیزانی هەواڵنێری فەرانسەیی لەدۆستانی ئاغاکەیەتی لەبەرانبەر پرسیارەکانی پول راڤۆ بێ خۆبەستنەوە ولامی دایەوە و گوتی: ئاگای لەهۆی خانەنشین کرانی "وەلی نیعمەت"ەکەی نیە،هەر ئەوەندەی دەزانێ کەئەویان خانەنشین کردووە.

لەپاشان ئان پیس ئاوا درێژەی دایە:

ئەمرۆ،نەودەمەی رێزدار هاتەوە من لە ماڵێ، لەچێشتخانە بورم،ئەو وەژوور کەوت و گوتی؛ ئان پیس منیان وەدەر نا ...

من گوتم: ئاغا، چلۆن دەکرێ کەسێکی وەک جەنابت بکەنەدەرەوە؟.

ئاغا، ولامی دایەوە: هەر ئەوەیە کە گوتم، منیان لە نەخۆشخانە دەر کرد و گوتیان نابێ لە هیچ کام لە نەخۆشخانەکان دا کار بکەم .

هەواڵنێرەکە پرسی: ئایا تۆ لە ئاغات نەپرسی لەبەرچی دەریان کردووە ؟.

ئان پیس ولامی داوە: نا ،نە من لەئاغام پرسیار کرد و نە ئاغا هۆی دەرکرانەکەی باس کرد.

پول راڤۆ ،بۆی نەدەچووە سەریەک کەخانەنشینی ئەو مامۆستایە هۆی دەروونی و روحی هەبێ،شکی نەما کە لەکارلابردنی زائربرۆخ لەبەر هۆی سیاسیە.

هەواڵنێری فەرانسەیی لەژنە خزمەتکارەکەی پرسی ؛ئاغا، کەی دێتەوە ماڵێ هەتا لەگەڵ خۆی بدوێم ؟ ئان پیس وڵامی دایەوە پێی نەگوتم چ کاتژمێرێک دەگەرێتەوە بەڵام من وای بۆ دەچم بەرلە شێوخواردن بێتەوە.

یەکێ لە ئەرکەکانی هەواڵنێری لەسەر هەوالنێری رۆژنامەوهەواڵگریەکان ئەوەیە پەلە بکەن لە گەیاندنی هەواڵ بەناوەندی رۆژنامەو هەواڵگریەکان،هەربۆیە پول راڤۆ رانەوەستا خودی زائربرۆخ ببینێ و شیکردنەوەی سەبارەت بە هۆی خانەنشین کران ئەو پیاوە بوێ چوونکە گەیاندنی هەواڵ بەناوەندی هەواڵگریەکەی، یانی پاریس، وەدرەنگ دەکەوت. هەواڵێکی بەم شێوەیە بەرێ کرد" پروفیسۆر فێردیناند زائربرۆخ، نوژداری بلیمەت کەیەکێ لەشانازیەکانی نەتەوەی ئاڵمان بوو،لەهەرەتی گورو تینی لەشی و روحی دا لەلایەن وەزارەتی تەندروستی دەوڵەتی ئاڵمانی رۆژهەلاتەوە خانەنشین کرا،وادێتە بەرچاو کە ئەو بۆتە قوربانی ململانێی سیاسی ..."

هەواڵگری فەرانسە ئەو هەواڵەی لە پول راڤۆ را پێی گەیشت بوو وەک هەمیشە ناردی بۆ تەواوی دنیا، لەهەموو رۆژنامەکانی ئوروپا و ئەمریکادا ،کە زائربرۆخیان دەناسی،بڵاو بۆوە،لەهەندێ لە

رۆژنامـەكـانی ئاسـیا و ئـەفریكـاش، كـەنـاوی زائربرۆخیـان بـەرگـوێ كەوتبوو، چاپ كرا.

لـەولاتـەكـانی ئالّمـانی رۆژهـەلات و ئالّمـانی رۆژئـاوا و سـویس هـیچ رۆژنامەیەک نەما کـە ئـەو هـەوالّـەی چـاپ نـەکـا و بـاس وخـواس و لێكدانــەوەی لــەســەر نــەبێ،لــە ولاتــی سویـسیش وەک ئالّمــانێ زائربرۆخیان بەباشی دەناسی چوونكە نوژداری مەزن ماوەیەک لەوێی كار كردبوو.

بەیانی رۆژی دوایی كەهەوالّی خانەنشین كرانـی زائربـرۆخ لـەتـەواوی رۆژنامەكاندا بلاّوبێوە،پول راڤۆ دیسان تەلـەفـونی بۆمـالّی زائربـرۆخ كردهەتالەگەلّ خودی خۆی سەبارەت بەهۆی خانەنشینیەكەی بدوێ، مامۆستا گوتی : فراوینێ وەرە بۆ ئێرە هەتا پێكەوە قسە بكەین .

پـول راڤـۆ كـەرۆژی پێشتر ئـەو هـەوالّـەی بـەرێ كـرد نـەیدەتـوانی پێشبینی بكا كەبلاّو بوونەوەی ئـەو هـەوالّـە چ گێـرەوكێـشەیـەک بـۆ زائربرۆخ و دەولّەتی ئالّمانی رۆژهەلات دەنێتەوە.

ئەگەر هەوالّی خانـەنـشینی زائربـرۆخ بـەبـێ رادەربرینـی هـەوالنێـری فەرانسەیی بلاّو بووباوە هیچ كێشەیەكی دروست نـەدەكـرد چوونكـە تەمەنی زائربرۆخ ـ كەچووبووە نێو حەفتاوچوار سالّەیی ـ بەتایبەت بۆ نەشتەرگەران، تەمەنی خانەنشینی بوو،بەلاّم جوونكـە هـەوالنێـری فەرانسەیی گوتبووی زائربرۆخ بۆتـە قوربـانی تـەتـەلّـەكـانی سیاسی وەزارەتـی تـەندروسـتی ئالّمـانی رۆژهـەلات دەبـوو پاكانـەی خـۆی و دەولّەتی ئالّمـان بكـا، پێویـستی پاكانـەكردنـەكـەش ئـەمـە بـوو كـە

بێدەنگی خۆی لەمەڕ زائربرۆخ بشکێنێ و هۆ راستیەکە بڵێ و رابگەیەنێ کە زائربرۆخ خەرفاوە.

رۆژی دوایی کەرۆژنامەکان هەواڵی پێوەندی دار بە خانەنشینی زائربرۆخیان بڵاو کردەوە یەکەم کەسی کە سەرنجی دایە وتێگەیی کە ئەو هەواڵە گەرەکە راست کرێتەوە دوکتۆر مادلینێر بوو.

بەو پێشینەیەی کە دوکتۆر مادلینێر لەروحیاتی زائربرۆخی دەناسی وای بۆچوو کە ئەوهۆیەی لە رۆژنامەکان دا بۆ لەسەرکار لادانی زائربرۆخ چاپ کراوە نابێ لەلای ویوە گوترابێ، ئەگەر زائربرۆخ ویستبای هۆی لەسەرکار لابردنی خۆی باس بکا دەیگوت کە ئێرەیی هاوکاران منی لەسەر کارلابردووە و نەیدەگوت بوومە قوربانی لەبێژینگ دانی سیاسی.

دوکتۆر مادلینێر لەگەڵ سەرۆکی نەخۆشخانە چوونە ماڵی زائربرۆخ، لەوێ رون بۆوە کە ئەو پیاوە سەبارەت بە هەواڵی خانەنشین بوونی خۆی هیچی بە هەواڵنێری فەرانسەیی نەگوتووە و ئەو کابرایە تەنیا پێوەندی دەگەڵ" ئان ییس"ی خزمەتکاری گرتووە.

فراوین لەدوای ئەوەی پول راڤۆ هات ئەو دوو پیاوەی کەلەلای زائربرۆخ بوون، ناسی، قەڵەمەکەی لە گیرفان دەرێناهەنا، بە بۆچوونی خۆی، بۆ کامڵ کردنی هەواڵی رۆژی پێشتر لەزائربرۆخ و دووکەسەکەی تر هەندێ زانیاری نوێ وەربگرێ.

دوکتۆر مادلینێر دەرفەتی لەو دەمە کورتەهێنا کەزائربرۆخ لەگەڵ سەرۆکی نەخۆشخانە بەسپایی خەریکی قسەکردن بوو، چاوێکی لە هەواڵنێری فەرانسە هەڵتەکاند هەتا بچێتە دەرێ،هەنگی پێی گوت

کاک رافۆ ئەتۆ ئەو هەواڵەی کە ئەمرۆ لە رۆژنامەکاندا چاپ کراوە دەبێ راست کەیەوە.

پول راشۆ پرسی کام بەشی دەبێ راست کەمەوە ؟.

دوکتۆر مادلینێر وڵامی داوە؛ ئەو بەشەی راست کەیەوە کە پێوەندی بەهۆی خانەنشینی پروفیسۆر زائربرۆجەوە هەیە چوونکە هۆی خانەنشینی مامۆستا ئەوە نیە کەتۆ نووسیوتە.

پول راشۆ پرسی هۆی خانەنشینی وی چیە ؟.

دوکتۆر مادلینێر گوتی ناتوانم پێت بڵێم ، بەهەرحاڵ ئەتۆ دەبێ نووسراوەی ئەمرۆی رۆژنامەکان بەم چەشنە راست کەیەوە؛ کە هۆی خانەنشینی زائربرۆخ پالاوتنی سیاسی نیە.

هەواڵنیری فەرانسەیی وای لێکداوە کە ئەگەر ئەو هەواڵە راست نەکرێتەوە زائربرۆخ دەکەوێتە بەر گوشار و تەنگەتاو کردنی دەوڵەت و حیزبی کومونیستی ئاڵمانی رۆژهەڵات و چوونکە لەپاش هاتنەوە ژوور و پرسیار کردن لە زائربرۆخ تێگەیی کە ئەو پیاوەش حەز دەکا ئەو هەواڵە راست کرێتەوە بەڵێنی دا راست کردنەوەی هەواڵەکە بۆ پاریس بنێری،لەسەر بەڵێنەکەشی سوور بوو و وەفای پێ کرد.

بەڵام رۆژنامەکانی سویس وبەتایبەتیش رۆژنامەکانی ئاڵمانی رۆژئاوا، بەدووی بابەتی خانەنشینی زائربرۆخ دا رۆیشتن.

زوربەی رۆژنامەکانی ئاڵمانی رۆژئاوا بەرکەنار کردنی زائربرۆخیان بەسەرهەڵدانی هۆی سیاسی زانی.

هەروەک وەزیری تەندروستی گوتبووی ؛لەدوای ئەوەی زائربرۆخ خانەنشین کرا (ئەوەش دەزانین مامۆستا کاغەزەکانی خانەنشینی

ئيمزا نەكرد)لەهيچ كام لەپاداشەكانى كاتى لەسەركاربوونى بێبەش نەكرا،بۆنموونە لەماشێن وشوفيرى وەزارەتى تەندروستى.

رۆژى پازدەهەمى مانگى ديسامبر لەمالّى زائربرۆخ را تەلەفۆن بۆ دەرگەوانى نەخۆشخانە كرا؛كەمامۆستا سوارى ماشێن بوو و بەرەو نەخۆشخانە وەرێ كەوت،دەرگەوان ئەو هەوالّەى بەئاگادارى سەرۆكى نەخۆشخانە راگەياندو داواى هەلّوێستى كرد،ئايا پێشى ماشێنى زائربرۆخ بگرێ يان نا ؟.

سەرۆكى نەخۆشخانە گوتى پێش بە ماشێنى مەگرن چوونكە هاتنى بۆ نەخۆشخانە چ قەيدى نيە بەلاّم نابێ بچێتە بەشى نەشتەرگەرى.

زائربرۆخ لەنەخۆشخانەى شاريتى دا دەفتەر كارێكى هەبوو،ئەوێ رۆژێ دواى ئەوەى هاتە نێو نەخۆشخانە لەماشێن دابەزى وراست چووە هۆدەى دەفتەرى كارى خۆى.سەرۆكى نەخۆشخانە تەلەفونى بۆ دوكتۆر مادلينێر كرد وگوتى گوايە "گيهيم رات" هاتووە هەتا شتەكانى تايبەتى خۆى بباتەوە؟.

دوكتۆر مادلينێر لەولاّم دا گوتى:ئەگەر ويستباى شتەكانى تايبەت بەخۆى بباتەوە شوفێرەكەى دەنارد.

كارمەندە لاوەكانى نەخۆشخانەى شاريتى كەدەيانزانى زائربرۆخ خانەنشين كراوە،هاتنەكەيان پێ سەير بوو،بەلاّم فەرمانبەرە بەسالّداچووەكان پەيان بە هۆى مەعنەوى وروحى هاتنى زائربرۆخ دەبرد و تێدەگەيشتن پياوێكى كەگەلێک سالاّن لەشوێنێک دا كارى كردووە وهەموو رۆژێ كارى خۆى بەتاسەو ئارەزوو و تەنانەت بەئەوين و خۆشەويستيەوە دەس پێكردووە بۆى ناكرێ لەپرێكا دلّى

لێ بەرداو بیرەوەریەکانی ساڵانی دوورودرێژ ئەویان بەو دامەزراوەیە لکاندووە.

زائربرۆخ کەچووە نێو دەفتەری کارەکەی دەرکەی لەسەر خۆ پێوەدا،چوونکە کەس نەدەچوەلای نەیاندەزانی لەوێدا چ دەکا.

لای نیوەرۆ یەکێ لە ژنەپەرستارەکان،هەربۆ سەرەدەر دەرێنان، خۆی گەیاندە پشت پەنجەرەی هۆدەی دەفتەر هەتا بزانێ زائربرۆخ لەو ژوورەدا چ دەکا،دیتی زائربرۆخ هەردوو ئانیشکی هاویشتوونە سەر مێزەکەو سەری وەسەر دەستەکانی کردووە،هەردەڵەی خەوی لێکەوتووە.

لەوێ رۆژێ را زائربرۆخ هەموو رۆژان،وەک ئەوکاتەی کاری دەکرد،بەوەختی دیاریکراودا دەهاتە نەخۆشخانە و دەچووە دەفتەرکاری خۆی ولەپشت مێزەکە دادەنیشت و باسکی داویشتنەسەر و سەری وەسەر دەکردن،کەس نەیدەزانی کەداخوا لەو حاڵەدا خەوتووە یان بەخەبەرەو بەناخی بیرەخەوەکانی کاری خۆی دا رۆچووە.

دووجاران دوکتۆر مادلینێر لە پشت پەنجەرەڕاڵەو حاڵەی دادیت،زۆری پەرۆش بوو، ئەوپیاوە مەزنەی،بەو دیمەن وقەڵافەتە،وەک سەمبولی ناهومێدی هاتە بەر چاو و فیلمی "فریشتەی کەوە"ی هێناوە یاد کەلەو فیلمەدا "مارلین دیتریش"خانمە هونەرپیشەی ناوداری ئاڵمانی لە دەورەی سینەمای بێدەنگ دا دەوری گێرابوو.

لەو فیلمەدا مارلین دیتریش دەوری ژنێکی دڵرفێن وحەکەدار دەبینێ کەمامۆستایەکی زانستگا دەخاتە داو وسەرەنجام ئەو مامۆستایە بۆژۆ وبەدناو دەبێ کارەکەی لەدەس دەدا،ئاخیرەکەی دەگەرێتەوە ئەو زانسگایەی کەدەرسی تێدا دەگوتەوە لەوژوورەی پۆلی بوو وەژوور دەکەوێ وسەری وەسەر مێزەکە دەکا و هەرلەوێ دەمرێ.

زائربرۆخیش لەهۆدەی کاری خۆی دا لەحاڵێک داکەسەری وەسەر مێزەکە کردبوو، لەبەرچاوی دوکتۆر مادلینێر وەک ئەو مامۆستایە دەچوو.

یەک دوو کەس لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە لەبۆ خۆشیرن کردن وەزیری تەندروستیان ئاگادار کردەوە کەزائربرۆخ رۆژانە دێتە نەخۆشخانە، وەزیری تەندروستی لەنەبوونی سەرۆکی نەخۆشخانەدا کە چووبووە سەفەربەدوکتۆر مادلینێری نوژداری یەکەمی نەخۆشخانەی گوت: کەسێکی کەخانەنشین کراوە نابێ هەموو رۆژێ وەک فەرمانبەرێکی لەسەرکار بەشێوەیەکی رێک لەشوێنی کاری خۆی حازربێ،هەبوونی فەرمانبەرێکی خانەنشین لەشوێنی کار،بەپێچەوانەی رێوشوێنەو رێک وپێکی کارەکان تێک دەدا، تۆدەبێ رێگە بگری لە هاتنی زائربرۆخ بۆ ئەوێ.

دوکتۆر مادلینێر لەوڵامی وەزیری تەندروستی دا گوتی:شوێنی کاری زائربرۆخ لەم نەخۆشخانەیەدا تالاری نەشتەرگەری بوو نەک هۆدەی دەفتەری کارەکەی،خودی خۆی ئیتر ناچێتە نێو تالاری نەشتەرگەری وئەوەش کەئەو ئیترنابێتە بەرهەڵستی رەوتی کارەکان لەم نەخۆشخانەیەدا چوونکە دوای هاتنە نێو نەخۆشخانە راست دەچێتە

هۆدەی خۆی و لەویش وەدەر ناکەوێ هەتا کاتی چوونەوەی بۆ ماڵێ،هەموومان دەزانین کەچوونکە زائربرۆخ گەلێک ساڵان لەم نەخۆشخانەیەدا کاری کردووە وتەنانەت لەساڵەکانی شەریش دا ئێرەی بەجێ نەهێشتووە بەخۆی ناوەستێ دڵی لێبەردا،لەباری مرۆییشەوە دوورە لەجوامێری کە ئێمە لەم رۆژانەی ئاخروئۆخری تەمەنی لەم تەنیا دڵخۆشیەی بێبەش کەین،ئیزن بدەن بابێتە ئێرە هەتا ئەودەمەی کە سروشت رێگە لە هاتنی دەگرێ،ئەگەرئێمە ئەمرۆ رێگەلەهاتنی بۆنەخۆشخانەبگرین دەبێتە هۆی سیابەختی وئازاری وی.

لەسەرەتای ئەم یادداشتانە دا گوتمان کە ئیش وکاری دوکتۆر هاڵ راوێژکاری زانکۆکانی پزیشکی بوو، کەچی ئەو لەکاروباری ماڵی زانکۆکانیش دا دەستی هەبوو،هەربۆیە وەزیری تەندروستی پێی گوت بچێتەلای زائربرۆخ و بەڵگەونووسراوەکانی خانەنشینی پێ ئیمزا بکا.

دوکتۆر هاڵ بۆ دیدەنی زائربرۆخ چووە نەخۆشخانەولەهۆدەی کارەکەی وەژوور کەوت،زۆربەکزی دی، بۆ ئەوەی نەختێ لە داماویەکەی کەم کاتەوەسەبارەت بە عەمەلەکانی نەشتەرگەری مامۆستا دوا و درێژەی گوتەکانی بەرەو"خانەنشینی"بردو کەوتەخۆ هەتا وەک وەزیری تەندروستی لەباری ژیانەوە زائربرۆخی دڵنیا بکا و گوتی:ئەوەی ئێستا وەری دەگری هەتا کۆتایی تەمەن و دوامین رۆژی ژیانت دەتدرێتێ،وێرای ئەوەش لەنەریت و دیاریکراوەکانی ئەم وڵاتەدا ئەسڵێک هەیە کەئەگەر هاتوو نرخی دراو دابەزی لەرادەی موچەی خانەنشینی زیاد دەکرێ .

زائربرۆخ بەبێ ئەوەی گوتەکانی دوکتۆر هاڵ هەڵبڕێ گوێی بۆ قسەکانی شل کردو لەپاش وەی کە لێدوانەکەی ئەو پیاوە تەراو بوو لەپڕ هەڵچوو،بەشێوەیەکی تورەگوتی : ئێوە پێتان وایە من فەرمانبەرێکی سادەی دەوڵەتم کەچاولەسەرمووچەی خانەنشینی داپچکرم ؟، من پیاوێکم کەلەهەوەڵەوە هەتا ئێستا لەبەروبوومی کاری خۆم نان خواردووە ولەمەو دواش هەر لەسەر زەحمەتی خۆم دەژیم،لەئاڵمان و ولاتانی دیکەدا دەیان نەخۆشخانە هەنە کە دەرکی تەلاری نەشتەرگەریان بەرووی مندا بکرێتەوە، من ئەگەر رۆژێ تەنیا یەک عەمەل جێبەجێ بکەم نانی خۆم پەیدا دەکەم.

دوکتۆر هاڵ چوونکە دیتی کە زائربرۆخ قەڵس بووە ئێستێک راوەستا و هەنگی گوتی من ئەمرۆ هاتووم کە ئەونووسراوانەی پێوەندیان بەخانەنشینی جەنابتەوەهەیە بەئیمزای ئێوە بگەیەنم.

زائربرۆخ هەربەو تورەیەوە گوتی:پێویستیم بەمووچەی خانەنشینی نیەو هیچ کاغەزێکیش ئیمزا ناکەم.

دوکتۆر هاڵ بەناچاری هەستا و مالاوایی لە زائربرۆخ کرد لێدا رۆیی.

سێ رۆژ دوای ئەم روداوە،ئەوکاتەی زائربرۆخ وەک رۆژەکانی بەرێ و لەکاتی دیاریکراودا هاتە نەخۆشخانە و بەرەو دەفتەری کاری خۆی چوو،دیتی کە دەرگەیان قفڵ کردووە. نزیکەی چارەکەسەعاتێک، ماتڵ بوو هەتا بزانن کلیل بەکێیە،کەچی نەیاندۆزیەوە.

زائربرۆخ گەرایەوە، بەلام رۆژی دوایی... دیسان لەکاتی خۆی دا هات ،بەلام دەرگا هەروا داخرا بوو.

یەکێ لە فەرمانبەرانی نەخۆشخانە کە زگی بەحاڵی زائربـرۆخ سـووتا لێی نزیک بۆوە و لەسەرەخۆ گوتی:"گیهیم رات" چاوەرێی کلیل مەبە چوونکە فرمـان دەرکـراوە کـەئیتـر ئێـوە نـابێ لـەم هـۆدەیە کـەڵـک وەرگرن.

بەم شێوەیـە زائربرۆخیـان لـەو نـەخۆشـخانەیە دەرکـرد کـە نزیکـەی پـازدەسـاڵان لـەوێـدا خـەریکـی کـار بـوو. لـەدوای ئـەوەی زائربـرۆخ لەقبووڵی مووچەی خانـەنـشینی خـۆی پاراسـت،جارێکی دیـش نـاوی لەچەند رۆژنامەی ئاڵمانی وئوروپایی دا چـاپ کرا،گشتیان نووسـیان کـــەئیترئیـــزن نـــادەن ئـــەو لـــەنـــەخۆشـــخانەی شـــاریتی دا کاربکا،زائربرۆخیش لەگەڵ ئەوەی کە پاشـەکـەوتێکی نیـە مووچـەی خانەنشینی ناوێ.

*زائربرۆخ بۆ بژیوی کەوتە تەنگانە*

زایربـرۆخ هـەربـەراسـتی پاشـەکـەوتێکـی نـەبوو،چوونکـە ئـەو پیـاوە لەهەموو تەمەنی دا سەبارەت بەکێشەگەلی دارایی بێ ئیعتینـا بـوو و دراوی هەرئەوەندە دەویست کە بژێوی رۆژانەو مانگانەی دابین بکا.
چـەنـد کـەس لـەدۆسـتانی زائربـرۆخ کـەدەیـانزانی ئـەو مووچـەی خانەنشینی وەرنەگرتـووە وبـەباشـیش ئاگـادار بـوون کـە ئـەو پیـاوە پاشەکەوتێکی بۆخۆ وەسەریەک نەناوە،کەوتنە خـۆ؛ بـۆ رێزلێنـانی و هـــەروەهـــا بۆئـــەوەی یارمـــەتیـــەکـــی داراییـــشی پـــێ بگا،هێنـــدێک کونفرانسیان لەبۆ پێک هێنا.

زائربــرۆخ پێــشنیاری دۆســتانی قبــووڵ کــرد و بریــاردرا کــەئــەو مامۆستایە،یەکەم کونفرانسی لە شاری هانوفێری هەڵکەوتوو لە ئاڵمانی رۆژئاوا ببەستێ.

هانوفێر یەکێ لەشارە گەورەکانی پیشەسازی وزانستی وهونەری ئاڵمانی رۆژئاوایە،تالارێکی بەربلاوی بە ناوی بیتهۆفێن لێیە کە لەتالارەکانی مێژوویی ئاڵمانی رۆژاوا دەژمێردرێ،وادانرا کە زائربرۆخ لەو تالارەدا وتاربدا وبۆ بابەتی وتارەکەش نەخۆشی شێرپەنجە هەڵبژێردرا.

لەو کاتی دا ئەو دیوارەی کە ئێستا لەنێوان هەرتک ئاڵمان دا هەیە لێنەدرا بوو،هاتوچوی نێوان دوو ئاڵمان هیچ کێشەیەکی لێنەدەکەوتەوە،هەرلەبۆیە لەدوای وەی کە رۆژی کونفرانسی زائربرۆخ دیاری کرا زۆرکەس تەنانەت لەئاڵمان و بەرلینی رۆژهەڵاتەوە چوونە هانوفێرهەتا گوێ بدەنە گوتاری زائربرۆخ .

ئەو شەوەی کە دەبوو زائربرۆخ لەتالاری بیتهۆفێن دا قسەبکا نەتەنیا پزیشک و نوژداران بەڵکو کۆمەڵێک لەتوێژەکانی تری کۆمەڵگاش وەک نووسەران، هونەرمەندان، مامۆستایانی زانکۆ و تەنانەت چەندکەس لە گەورەگەورەکانی دارایی و پیشەسازی ئاڵمانی رۆژئاواش لەو تالارەدا حازر بوون،هەروەها نزیکەی سەت کەس لە هەواڵنێرانی رۆژنامە،گۆڤارورادیۆکانیش هاتن هەتا گوێیان لە گوتاری زائربرۆخ بێ و بۆ رۆژنامە و گۆڤارورادیۆکانی خۆیانی بنێرن.

گشت ئەوکەسانەی لەوێ شەوێ دا بۆ گوێبیسی گوتاری زائربرۆخ لەوتالارەدا حازربوون سەبارەت بە نەخۆشی شێرپەنجە هەندێ

ئاگاداریان هەبوو،هەندێکیان کە پزیشکی شێرپەنجە ناس بوون سەبارەت بەو نەخۆشیەزانستێکی بەربڵاویان هەبوو لەگەڵ ئەوەش دا هەموو پێیان وابوو کە لەزمانی زائربرۆخەوە هەندێ شت دەبیسن کەهەتا ئەوشەوە نەبیستوویانە و نە خوێندوویانەتەوە. چوونکە زائربرۆخ بۆخۆی کۆمەڵێکی لەنەخۆشانی شێرپەنجەگرتوو عەمەل کردووەو هەوداو تەنراوەی شێرپەنجەی لەناوەوەی لەشی نەخۆشان دادیتووە بەعەمەلی نەشتەرگەری ئەوانی لە تەنیاوە سەلامەتەکان جیاکردۆتەوە ولەدوای عەمەلێ دیتبووی کەچلۆن نەخۆشەکان چاک دەبنەوەو یان لەدوای ماوەیەک دیسان تووشی سەرهەڵدانی شێرپەنجەدەبنەوە.

کەزائربرۆخ هاتە نێو تالار ژن وپیاو،ئەوانەی لەوێدا حازربوون،لەبەری هەستان.چەپلەیان بۆلێدا،چەپڵەرێزانەکە درێژەی هەبوو هەتا گەیشتەپشت مێزی گوتارخوێندنەوە.

لەپاشان بەئیشارەی مامۆستا دانیشتن،زائربرۆخ لەکیفەکەی دەستەکاغەزێکی دەرێناو لەسەر مێزەکەی دانا و دەستی بە وتاردانەکەی کرد.

سەرەتای قسەکانی زائربرۆخ مزگێنی ئەوەیان دەدا کە ئەوەی باسی لێوەدەکا گەلێک سەرنج راکێش دەبێ. چوونکە گوتی:دەبێ بە خانمەکان و برادەرانی بەرێز رابگەیەنم کەمن لەوکاتەیەوە بۆیەکەم جار لوو(تومور)ێکی شێرپەنجەییم لەلەشی نەخۆشێک دەرێناوە هەتا ئەمرۆ،نەمدیوە کەدوو تەنراوی شێرپەنجەیی لەناوەوەی لەش دا لەباری رەنگ وئەو رەگازۆیەی دەیکا بەتەواوی وێک بچن.لەدەرەوەی

لەش دا تەنراوەکانی شێرپەنجە،لەباری رەنگەوە، وێکدەچن بەلاّم لەژوورەوەی لەش دا هیچ وێکچوونێک لەنێوان تەنراوە پڕ مەترسیەکان و ریشەداکوتانی ئەوان لەئارا دا نیە.

ئەوجار مامۆستا دەستی خستە ژێر چەناگەی وسەری بەرداوە،چەندساتێک بێدەنگ بوو،لەدوای ئەوەی سەری هەڵبڕی گوتی:گەرەکە ئیستا وەزیر لە مەترسی رزگار کریّ،ئیستێکی تر گوتی؛هەرکام لەو سیّ مۆرەیە بجووڵینین وەزیر دەکەوێتە بەر مەترسی.

ئەم دوو رستەی لەخۆرایی کەهیچ پێوەندیان بەبابەتی گوتارەکەوە نەبوو،بیسەرانی زۆر کاس و وڕ نەکرد،چوونکە هەندێ جاران وتاربێژ شتی وا دێنێتەسەر زمان کە بەروالّەت هیچ پێوەندیەکی بە بابەتی سەرەکیەوە نیە کەچی دوای چەند ساتێک دەردەکەویّ کەبەستێن خۆشکردنێکە بۆ بابەتی سەرەکی، گوتاربێژ لەم رووەوە ئەو شتە بیّ پێوەندانە دەڵیّ هەتا سەرنجی بیسەران پتر بۆ لای خۆ راکێشیّ وهەستی زیتەوەری ئەوان پتر دنە بدا،بەلاّم کە وتەکانی زانربرۆخ لەم بارەیەوە هەروا درێژەی کێشا وەدەرکەوت مامۆستاهەروەک بابەتی سەرەکی گوتارەکەی لەیاد چووبێتەوە تەنیا سەبارەت بە مۆرەکانی شەترەنجیّ وەک ئەسپ،فیل،وەزیر وپیادە دەدویّ و هەردەڵەی شەترەنجی لەپێشەو مۆرەکانی تێدا دەبینیّ و سەبارەت بە جووڵەی ئەوان باس دەکا.

لەنەکاوڕا مامۆستا لەبابەتی بزواندنی مۆرەکانی شەترەنجەوە هاتە سەر باسی ئەو بەنگەڵە (خانووی بچکۆڵەی کوێستانی)ی کەلەکاتی

دانیشتنی لە سویس بەكرێی گرتبوو، برێكی باسی كەش وهەوای ئەو وڵاتە كردو لەپاشان رستەی قسەكانی رست كردن بەرەو بابەتی كڕینی ماشێن.

دەمگۆی خەرفانی زائربرۆخ لەدۆستانی وەراست گەرا كە لەتالارەكە دا حازر بوون و شكیان نەما كە هۆی لە سەركاری نەشتەرگەری لادانیشی راستە،چوونكە دوودڵیەك نەما كە گوتاربێژ تووشی تێكچوونی ئاوەزو هەستگەل بووە.

یارانی زائربرۆخ بەناوی سپاس وپێزانین لەگوتاربێژ،نزیكی مێزی گوتار خوێندنەوە بوونەوە دەیانەویست باسەكەی پێ ببڕن و لەمێزەكە دووری كەنەوە،كەچی ملەی دەكردو نەیدەویست لەمێزەكە جیابێتەوە و دەیگوت وتاری من هێشتا نەگەیوەتە كۆتایی،بەڵام سەرەنجام رەكێش رەكێش لەمیزەكەیان دووركردەوەو لەتالار بردیانە دەرێ،

لەهەواڵنێرانی رۆژنامەو گۆڤارو رادیۆكانیان خواست بۆرێز گرتن لەو خزمەتانەی زائربرۆخ بەزانست كردوونی و لە رابردوودا گیانی سەتان كەسی لەمردن رزگار كردووە،هەواڵی هاتەران پاتەرانی گوتارەكەی لەنێو هەواڵەكانی خۆدا بڵاونەكەنەوە ونەڵێن ئەو زانایە تووشی تێكچوون هاتووە، ئەوانیش لەبڵاو كردنەوەی هەواڵی تاڵی گوتاربێژی زائربرۆخ خۆیان پاراست.

زائربرۆخ هەرگیز لەبیری وەسەریەكنانی ماڵ ودارایی وپاشەكەوت نەبوو هەتا لەكاتی پیری ولەكاركەوتوویی یارمەتی دابین كردنی

ژیانی بدا،ئەو هەمیشە کارو لێکۆڵینەوەی دەکردبەبێ ئـەوەی بیـەوێ لەکارو توێژینەوەی خۆی دارایی کۆکاتەوە (*).

ئـەوانـەی ئـەویـنـداری کـاری خۆیـانن ودەسـتیان پـێ لـەکـاری خـۆ هەڵناگیرێ،کارو توێژینـەوەیـان لـەبـۆ کۆکردنـەوەی دراو ناوێ،ئیـشق وئەوینی وان بەکارەکـەیـان دەبێتـەهـۆی ئـەوەی ئـەگـەر هـەیـان بـێ ئامادەن لەگیرفانی خۆیان پارەو مووچەش بـدەن هـەربـەو مـەرجـەی کارو لێکۆڵینەوەیان پەکی نەکەوێ.

زائربرۆخیش یەکێ بوو لەعاشقانی کارولێکۆڵینەوەی خۆی لەهیچکـام لـەدەورانـەکـانی ژیـانی نـەکـەوتـە بیـری کۆکردنـەوەی پاشـەکـەوت وخرجکردنەوەی دارای وئەو رۆژەی بەرگریشیان لەدرێژەدانی کـارەکـەی کرد ئامادە نەبوو ئەو کاغەزانەئیمزا بکا کەپێوەندیان بـەخانـەنشینی وی هەبوو،هەتا ئەوەندە تەمـەنـەی ماویـەتـی مووچـەی خانـەنشینی وەرگرێ.

ئەو پیاوە لەگەڵ ئەوەی دەیزانی هیچی پاشـەکـەوت نـەکـردووە رازی نەبوو مووچەی خانەنشینی وەرگرێ.

---

* لەم وڵاتەشدا کەسی بەم چەشنە هەبوونەو ئێستاش هەنە،پیاوێکی دەناسم کەلـەتـەمـەنـی حەڤدەساڵیەوە هەتاحەفتاوچوار ساڵی بەبێ برانـەوە خـەریکی وەرگێڕانـی گوتـار وکتێبـان بـووە لـەزمانـەکـانی بێگانـە ڕا بۆسـەرزمـانی فارسی،ئێـستا کـە تـەمـەنـی گـەیـوەتـە حەفتاوچوارساڵەیی و تووشی چەند نەخۆشی بووە هەربەتەواوی بێ پاشەکەوتە وبـەمانـای پر بەپێستی وشە؛ نەدارە. وەرگێڕی فارس.

مەبەستی ئەوپیاوە مەزنە خودی جەنابی مامۆستا "ذبیح الله منxوری"یە کەلەمێژووی ئێـران دا رەنگە کەمکەس قەرەی لەقەرەی بدا و رەنگە کەم نـەتـەوەی دنیا خزمـەتکارێکی وایـان هەبێ ،کەبەداخەوە لەوپەڕی هەناسەساردی وبێنازی دا لەدەورانی پیریەکەی سەری نایـەوە. روحی شادو رێگەی بەردەوام بێ. ئەویندار.

ئـەوچـەنـدجارەی کـەزائربـرۆخ لـەئیمـزا کردنـی نووسـراوەکـانی پێوەنددار بەخانەنشینی خۆی ولەئاکامدا وەرگرتنی مووچەکەی خۆی پاراست خاوەنی هۆش وهەستگەلی ئاسایی بوو و ناکرێ بڵـێن کەخەرفاوی وای دەکرد ئەوانە ئیمزا نەکا.

ئەوەی ئەو پیاوەی دنەدەدا کەمووچەی خانەنشینی وەرنەگرێ ئەمە بوو؛ وای بیر دەکردەوە کەئەوکەسەی بەڵگەکانی خانەنشینی خۆی ئیمزا دەکاو مووچەکەشی وەردەگرێ بەئاشکراونەهێنی پێی لێدەنێ کەئیتر وازی لە درێژەدانی کار نیە،یان توانای درێژەدانی کاری نیە.

وەزیری تەندروستی سەبارەت بە زائربرۆخ نێتێکی باشی هەبوو و نەیدەویست مووچەی زائربرۆخ ببڕێ،بەڵام ئەویش ناچار بوو لەڕێوشوێنی گشتی پێڕەوی بکا و مووچەی ئەوپیاوەی کەئیتر نابێ کار بکا ببڕێ. لەئەنجومەنی وەزیرانی ئاڵمانی ڕۆژ هەڵات داگوترا ئەو کاتەی مووچەی زائربرۆختان بڕی ئەو ناچارە مووچەی خانە نشینی وەرگرێ.

مووچەی زائربرۆخ بڕدرا دەگەڵ بڕینی مووچەکەی ئەوماشێنەی کە بەپارەی وەزارەتی تەندروستی بۆی کڕابوو لێیان وەرگرتەوە، زۆر پێنەچوو کە نەبوونی داهات لەماڵی زائربرۆخ هەست پێکرا، هاوسەرەکەی"مارگو" بۆی نەدەکرا پێداویستیەکانی ماڵێ بکڕێ.

*شێوەی مامۆستا بۆ بەی بردن بە سیفلیس*

لەوزەمانی دا كەزائربرۆخ بەشێوەیەكی رێكوپێك لەنەخۆشخانەی شاریتی دا كاری دەكرد رۆژێكی دوكتۆر مادلینێر دیتی لەوهۆدەیەی ڕاكەدەچوونە ژووری عەمەلیّ كتێبێكی لێیە،هەركە كتێبەكەی چاوپێكەوت زانی كە هی زائربرۆخە. چوونكە مامۆستا خووی وابوو كەلەنێوان رێگای مالێ و نەخۆشخانەدا،لەنێو ماشێن، كتێبی موتالا دەكرد.

ئەو كتێبەی كە ئەوی رۆژێ دوكتۆر مادلینێر چاوی پێكەوت،واتێگەیی كەهی زائربرۆخە و لێی بەجێ ماوە. كتێبەكە سەبارەت بە نەخۆشی سیفلیس بوو،بەلام بە نووسراوەی زائربرۆخ نەدەژمێردرا.

زائربرۆخ لەكاتی موتالای كتێبەزانستیەكان دیمانەوبۆچوونەكانی خۆی لەپەراوێزی لاپەرەكانی دا دەنووسی. دوكتۆر مادلینێر تەماشای كردلەوكتێبەدا لاپەرە نیەبەخەت وقەلەمی زائربرۆخ پەراوێزێكی لەسەر نەنووسرابێ، لەدوای دیتنی پەراوێزەكان،كەلەبارەی سیفلیس دابوون،لەناخی خۆی دا بەدڵ پەسنی زائربرۆخی كرد.

لەراستی دا زائربرۆخ بەهۆی كاری نەشتەرگەری خۆی لەبارەی نەخۆشی سیفلیس موتالاو تێبینی زیاتری لە هەموو پزیشكانی سیفلیس ناسی هاوچەرخی خۆی هەبوو،چوونكە ئەوان شوێنەوارەكانی نەخۆشی سیفلیسیان لەدەرەوەی لەشی مرۆڤ دا

دەخستە بەرتوێژینەوە و زائربرۆخ ئەوشوێنەوارە نالەبارانەی لە ناوەوەی لەشی مرۆڤ دا بەچاوی خۆ دەدی.

ئەو لەکاتی عەمەلی نوژداری لەنێو لەش دا ئەندامێکی دەدی کەتووشی نەخۆشینەکانی دەورەی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس ببوو و پزیشکی پسپۆرو سیفلیس ناس نەشیابوو تێبگا کامە ئەندام دوچاری نەخۆشینەکانی دەورەی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس بووە.

نەخۆشی سیفلیس سێ قۆناخی هەیە؛ لەقۆناخی یەکەم دا نیشانەکەی زیپک (کوان)ێکە کەلەنێو گەڵ یان لەسەرلێو، لەوپزیشکانەی کەدەگەڵ میکرۆبی سیفلیس هەڵس وکەوت دەکەن هەندێ جار لەسەری قامکیان، پەیدا دەبێ، ئەو زیپکەو کوانە لەزاراوەی پزیشکی دا پێی دەگوترێ"شانکەر". ئەگەر لەکات وساتی خۆی دا چارەی نەکەن نیشانەکانی قۆناخی دووهەم وەدەر دەکەوێ و ئەو کوانە لەنێو دەچێ، زیپکەگەلی تر لەدەست و پێ دا وەدەردەکەون و دەنگ گۆڕانی بەسەردادێ، ئەم قۆناخەش پاش ماوەیەکی تێدەپەرێ و ئاسەواری رواڵەتی نەخۆشیەکە لەنێو دەچن.

لەدوای ئەمە قۆناخی سێهەمی نەخۆشیەکە دەس پێدەکا، ئەوکەسەی کەتووشی ئەم نەخۆشیەیەلەرواڵەت داهیچ جیاوازی دەگەڵ کەسانی سەلامەت نیەو هیچ پزیشکێکی سیفلیس ناس ناتوانێ لەسەرئاسەوارە رواڵەتیەکان تێبگا کەئاخۆ کەسێ دوچاری قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس بووە یان نا ؟.

شۆپ دانانەکانی قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس جوراوجۆرن وگشتیشیان مەترسی دارن،نەخۆش کە بەگشتی خۆی بە سەلامەت و

بێوەی دێتەبەرچاو وبەئیشتیا وهەڵپەوە خۆراک دەخوا و بەچاکی دەخەوێ و هەست بە چ ئێش و ئازاران ناکا لەپڕێک دا تووشی کوێری دێ یان گرفتاری شەپڵەی گشتی لەش دەبێ.

زائربرۆخ کەنەخۆشینەکانی قۆناخی سێهەمی سیفلیسی لە دیوی ناوەوەی لەشی تاکەکان دا دەدی یەکەم کەسەکەگوتی لەلەشی مرۆڤ دا هیچ ئەندامێک نیە کەلەمەترسی شیمانەی نەخۆشینەکانی قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس پارێزراوبێ.

یەکێ لەنەخۆشینەکانی قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیس شێتی یە،نەخۆش کەهیچ ئاگای لە نەخۆشی خۆی نیەرەنگە لەنەکاوڕا شێت بێ،نەخۆشی سیفلیس گرتوو ئەگەر بەتەواوی خۆی چارەسەر نەکا نەخۆشینەکانی نەخۆشی سیفلیس بۆمنداڵەکانی رادەگوێزێ و رەنگە ئەوان شێت یان کوێر یان تووشی سستی و سڕی یادەوەری و هەستگەل بێن.

چەند جار وارێکەوت کەکەسێک لەسەرقسەی پزیشکان بۆچارەسەرکردنی یەکێ لەنەخۆشیەجوراوجۆرەکان کەوتە بەرعەمەلی نەشتەرگەری زائربرۆخ. لەکاتی عەمەل دا زائربرۆخ شوێنەواری نەخۆشی سیفلیسی لە یەکێ لەئەندامەکانی دادیت کەپزیشکان لێی ئاگادار نەبوون،بەپزیشکی چارەگەری گوت کەکابرای باسکراو لە پاش ئەوەی لەنەخۆشخانە چووەدەر دەبێ بۆچارەکردنی نەخۆشی سیفلیس بخرێتەبەرداودەرمان.

بەرلەزائربرۆخ ئەوپزیشکەی کە دەیەویست بزانێ ئاخۆ کەسێ تووشی نەخۆشینەکانی قۆناخی سێهەمی نەخۆشی سیفلیسە یان نا دەبوو

شیکاریەک بکا کەلەپزیشکی دا بە"رەنگدانەوەی واسرمان"نێوی دەرکردووە. واسرمان میکرۆب ناس وپزیشکێکی ئاڵمانیەکەلەساڵی ١٩٥٢ی زایینی ماڵاوایی لەژیان کرد،بۆپەی بردن بە هەبوونی میکرۆبی سیفلیس لەلەشی مرۆڤ دا شیکاری بەنێوبانگی"رەنگدانەوەی واسرمان"ی داهێنا،کە باس کردنی دووردرێژی دەوێ وحەوجێی بەپەرتوکێکی پزیشکی هەیە.

بەکەڵک وەرگرتن لە رەنگدانەوەی واسرمان کەبەزمانی فەرانسەیی دەبێتە"راکسیۆن دوو واسغمان" دەیانتوانی بەبێگومان بزانن کەئاخۆ لەلەشی کەسێ دا میکرۆبی سیفلیس هەیە یان نا؟.

بەڵام کەڵک وەرگرتن لە رەنگدانەوەی واسرمان بۆ پەی بردن بە هەبوونی میکرۆبی سیفلیس لەلەشی کەسێک دا دوو کەمایەسی هەبوو یەکەم ئەمەکەکارەجوراوجۆرەکانی ئەوشیکاریە ماوەیەکی درێژە دەکێشا دووهەم ئەوەبووکە نەیاندەتوانی بەبێ هەبوونی تاقیگەیەکی تەیار ئەوشیکاریە بکەن.

پزیشکەسیفلیس ناسەکانی ئاڵمانی وپزیشکانی تری ئوروپایی چوونکە لەشاری وادا دەژیان کەلەوان دا تاقیگەی تەیارهەبوون دەیانتوانی لەو شیکاریە کەڵک وەرگرن بەڵام لەوڵاتانی ئافریقایی و ئاسیایی کە لەو زەمانی داهیچ تاقیگەیەکی وا نەبوو کەڵک وەرگرتن لەوشیکاریە هەرنەدەرەخسا.کەچی زائربرۆخ لەئاکامی ئەزموونەکانی مەیدانی شێوەیەکی بۆ پەی بردن بەنەخۆشی سیفلیس لەلەشی مرۆڤ دا دۆزیەوە کە پزیشکێک لەدوورکەوتووترین شوێنەکانی ئەفریکا وئاسیادا کەدەستی بەتاقیگە رانەدەگەیشت بەهۆی ئەو

دۆزینەوەیەوە دەیتوانی بزانێ کەئاخۆ کەسێک تووشی نەخۆشی سیفلیس (لەقۆناخی شاراوەیی دا) بووە یان نا ؟ .

شێوەی زائربرۆخ بۆپەی بردن بە هەبوونی میکرۆبی سیفلیس بەم چەشنەبوو کە برێکی لەخوێنی ژن یان پیاوی گومانلێکراو دەگرت وبرێکیش بەڵغەمی لەیەکێ لە"گانگلیۆن"ەکان بەهۆی دەرزی دەکێشا (بە پۆزایی لەنفاتیکی گەردن دەڵێن : گانگلیۆن)، خوێن وبەڵغەم گرتنەکە لەدوو چرکەی پتر پێنەدەچوو.

هەنگی ئەو دووانەی لەجامێک دا لێکدەدا و دایدەنا هەتا بنیشێ،دیارە لەپاش نیشتنەکە خوێناوەکە دەکەوتە لای سەرەوە. زائربرۆخ خوێناوەکەی دە جامێکی دیکەدەکرد ونەختێکی گیراوەی ناودێربە"شلەی رینجێر"بەسەردا دەکرد (شلەی رینجێر گیراوەیەکی خوێیە کەلەتاقیگەدا یان لەو جامەی داکە دەیانەوێ میکرۆب پێبگەیەنن بەکاری دێنن.)، هەرکە زائربرۆخ ئەوشلەیەی دەخوێناوەکە دەکرد بە ماوەی پێنج چرکەمیکرۆبگەلی سیفلیس سەریان هەڵدەدا.بەم شێوازە هەر پزیشکێک دەیتوانی تەنانەت لەو شوێنانەی کەتاقیگەشی لێنەبا لەماوەیەکی گەلێک کورتدا دیاری بکاکەئایا کەسێ تووشی نەخۆشی سیفلیس بووە یان نا.

ئەگەرچی ئەم داهێنانەی زائربرۆخ لەمەودای نێوان دووشەری یەکەم ودووهەمی جیهانی بێدەنگەی لێکرا و هەراوهوریایەکی لێنەکەوتەوە بەڵام شاکارە نوژداری یە کانی ئەم پیاوە دەنگدانەوەی جیهانی لێ پەیدا بوو،یەکێ لەوشاکارانە پێوەندی دەست وپێی پەریو بەلەشی

بریندارەکانی شەڕەوە بوو کەئێمە لەسەرەتای سەر بردەی زائربرۆخ دا بەشێوەیەکی سەرپێی باسمان کردو زووبەسەری دا رابردین.
لەبۆیە رەنگبێ خوێنەران سەرنجیان نەدابێتێ کەئەوشاکارەبێ پێشینانەچەندە گرینگ بوونە کەتائەوێ رۆژێ کەس هێزو نەترەی جێبەجێ کردنی ئەوانی نەبووە.

*ئەو ئیشتوفان بێرکەی کەویستی هیتلەر بکوژێ*

یەکێ لەعەمەلەنەشتەرگەریەکانی زائربرۆخ لەشەری دووهەمی جیهانی داکە فرەناوبانگی رۆیی و تەنانەت سەرنجی هیتلەری سەرۆکی دەولەت و دیکتاتۆری ئالمانی بۆلای خۆ راکێشا دەرمانکردنی ئیشتوفان بێرک بوو کەلەباکووری ئەفریقا دا بەخەستی زامدار ببوو.
ئیشتوفان بێرک هەرئەو ئەفسەرەیە کەلەرۆژی بیستی مانگی ژوئیەی سالی ١٩٤٤ بۆمێکی سەعاتی لە ژووری هیتلەردا داناو بۆخۆی وەدەرکەوت وبۆمەکە تەقیەوە،لەوتالارەی داکۆبوونەوەی کۆنفرانسێکی سەربازی گیرابوو، چەندکەس کوژران بەلام هیتلەر بێوەی بوو.
درێژەی باسی ئەم تەمای کوشتنە کەلەپاش کۆتایی شەری دووهەمی جیهانی گەلێک سالان لە رۆژنامەو گۆڤارو کتێبان دا سەبارەت بەوی لێدوان دەکرا دووردرێژە،کورتەی مەبەس ئەمەسە؛ ئەفسەرانی هێزەکانی چەکداری ئالمان کەدەیانزانی ئالمان لەشەردا تێدەشکێ ولەپاشان رەنگە تێدابچێ تەمایان گرت بەکوشتنی هیتلەر کۆتایی

بەشەربێنن ولەگەڵ دەوڵەتـەکانی ئـەمریکا وئینگلـیس وسـۆڤبەت دا ئاشتی بکەن،ئەگەرلە دوای کۆتایی هاتنی شەریش ئاڵمان ناچاربکرێ تاوانی بۆئەو دەوڵەتانە ببژێرێ،ئەفسەرانی ئاڵمانی وەئەسـتۆ گرتنـی زەرەروزیانی شەریان پێ باشتربوو لەتێداچوونی ئاڵمان .

ئیشتوفان بێرک سینگی ڕەپێش کرد هەتا بۆمێکی سـەعاتی بـەهێـز دەژووری کـاری هیتلـەر دا دانێ،لـەڕۆژی بیـستی مـانگی ژووئییـەی ۱۹٤٤ بۆمەکەی کەدەنێو جانتایەکی دەستی دا دانـدرابۆوە لـەتـالاری کۆنفرانـسی سـەربـازی دالـەپـەنـا هیتلـەری دانـا (لـەناوچـەیـەکـی هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەلاتی ئاڵمان لەنزیک بەرەی شەر لەگەڵ سۆڤیەت دا.)، بەبیـانووی هێنـانی نووسـراوێکی پێویـست لـەژووری کـۆنفرانس چووەدەرەوە وبەفرۆکە خۆی لەو مەڵبەندە دوورکردەوە.

بۆمەکە لەچرکـەی دیـاری کـراودا تـەقیـەوە کـەچـی هیتلـەرنـەکوژراو تـەنانـەت برینـداریش نـەبوو،لـەدوای ئـەوتـەمـای کوشـتنە نزیکـەی هەزارکەس لەئەفسەرانی هێـزە چـەکدارەکـان وکـەسـانی ناسـەربـازی گیران ولەسێدارەدران، گەرووی هێندێکیان بەقولاپی دوکانی قەسـابی داکرد،ئیشتوفان بێرکیش لەدوای گیرانی لەخاچ درا.

"ئیـشتوفان بێـرک" ئـەفـسەرێکـی دلێـرو ئـازا بـوو ، ئـەو ڕۆژەی لـەبـاکووری ئـەفریقـا و لـەکـاتی هێـرش بردنـەسـەر مـەتـەرێـزەکـانی هاوپـەیمانـان وبـەتونـدی زامـداربوو پلـەی سـەرگـورد (یـاوەر)ی هەبوو،ئەولەهێرشی دلێرانەی بۆ سـەر هێـزی ئینگلـیس بـەچـەشـنێک برینداربوو کەپزیشکان و نوژدارانی نیزامی لەباکووری ئەفریقا پێیان

لەبێ توانایی خۆ ناو گوتیان کەئەولەبەرئەوبرینە قولآنەی کەدەهەموو لەشی بووە ،دەمرێ.

مارشال " رومێل "ی ناودار کەفەرماندەری هێزەچەکدارەکانی ئالمان لەباکووری ئەفریقا بوو، ئەم ئەفسەرە ئازایەی گەلێک خۆش دەویست ،لەپاش قسەکردن لەگەڵ بەرلین فەرمانی دا کە ئیشتوفان بێرک،کەلەراستی دا ببووە لەشێکی لەبەریەک هەڵدراو،راگوێزن بۆ بەرلین بەڵکو لەوێ بتوانن چارەسەری بکەن .

لەبەرلین دا زائربرۆخ لەشی شەقارشەقاری ئەفسەری زامداری دیت وگوتی ئەزباوەرناکەم بشێم وی نەجات بدەم بەلآم هەوڵی خۆ دەدەم.

لەدوای گوێستنەوەی ئیشتوفان بێرک بۆنەخۆشخانەی بەرلین نوژداری بلیمەت دەستی راستی بریندارەکەی بڕیەوە، چوونکە ئێسقانەکانی هێندە ورد ببوون کەنەدەخرانەوە سەریەک، بێجگەلەوەش نیشانەکانی قانقاریای تێدادەبیندرا، گوتی ئەگەر دەستەکە نەپەرێنم قانقاریا هەموو لەشی دادەگرێ ونەخۆشەزامدارەکە دەکوژێ.

چاوی چەپی" ئیشتوفان بێرک"یش بەچەشنێک هەلاهەلاببوو کەزائربرۆخ بەهیچ کلۆجێک نەیدەتوانی چارەی بکا وبەناچار چاوی چەپیشی بەتەواوی دەرێنا.

دەستی چەپی بێجگەلەقامکەگەورەی سەلامەت بوو،بەلآم تەقینەوەی بۆم ئەنگوستی گەورە (ئەسپێ کوژە) ی دەستەچۆپەی پەراندبوو.

ئـەنگوسـتە گـەورە لـەهـەر دەسـتێک دا وبـۆ کـەڵـک وەرگـرتن لەقامکەکانی دیکە پێداویستیەکی حاشا هەڵنەگری هەیە وبەبێ قامکە گەورە کەڵک لەئەنگوستەکانی تر بۆ کاران وەرناگیرێ.لەنێو هـەر پێـنج قامکـەکـانی دەسـت دا ئـەنگوسـتە گـەورە تـەنیـا قامکێکەکەروی دەچوار قامکەکانی دیکە دایەو تلیەکانی ترلەتەنیشت یەک هەڵکەوتوون و رویان تێک نیە.زائربرۆخ لەبۆئەوەی کە بتوانێ قامکەکانی ئیشتوفان بێرک والێبکا بەباشی کەڵکیان لێوەرگرێ تەمای گرت کە ئەنگوستی شادە (دۆشاومژە)ی بۆ لەجێگای قامکی گەورە دانێ هەتا بەوهۆیەوە باشتر بتوانێ کەڵک لە ئـەنگوسـتەکانی توتەوبرای توتە ودۆلەدرێژەی وەربگرێ. زائربرۆخ مەودای دەدا.نێوان قامکی دۆشاو مـژە و سـێ ئـەنگوسـتەکـانی دیکـەی دەسـتی چـەپـی زامدارەکە وقامکەکەی واهەڵدەخست کەروی بکەوێتە سێ قامکەکانی دیکەی.

هاوکـات لـەگـەڵ ئـەوکارانـەی کـە زائربـرۆخ لـەسـەر دەسـتی چـەپـی بریندارەکەی دەکرد نەشتـەرگـەری لـەسـەر بـەشـەکـانی تـری لـەشـی ئەنجام دەدا،بۆنموونە سێ ئێسقانی لەلەشی سێ کەروێشکی زیندوو دەرێنا و دە سێ شوێنی لەشی زامدارەکەی دا جێکردنەوە.

واباس دەکـەن کـە؛ لـەئالـمـان دا یـەکـەمـین کـەسـی کـە لـەلایـەن زائربرۆخـەوە کـەوتـە بـەر لێـدانی "پینـی سـیلین" بـۆ پـێش گـرتن لەئیلتیهاب و چڵک هێنانی زامەکان "ئیشتوفان بێرک" بوو.

هـەروەک دەزانـین ئینگلیـسەکـان" پینـی سـیلین"یـان داهێنـاوەو لەپێشدادەرمانێک بـوو کـەنـەختێک بـەزەحمـەت وە دەس دەکـەوت.

لەپایزی ساڵی ١٩٤٣داکە"چرچێل"ی سەرۆک وەزیرانی بریتانیا لە باکووری ئەفریقا تووشی نەخۆشی ستلۆجەم (ذات الريه)هات"لۆردمۆرێن"ی پزیشکی تایبەتی خۆی گوتی ئەگەرپینی سیلینی لێنەدرێ ئەمرێ.ئەمرۆش دەرمانی کاریگەربۆچارەسەری ستلۆجەم،جا چ یەکەڵ یان دووانەبێ (یانی سیەک یان هەردوو سی زامدار بێ)،دەرمانی دژە میکرۆبی پینی سیلینە.ئەوەندە پینی سیلینەی بۆ دەرمانی چرچێل پێویست بوو ئەوکاتی ٦٠٠لیرەی ئینگلیسی تێچوو کەچی ئەمرۆ پترلەچەند مارکی تێناچێ.

ئاڵمانیەکان،بەوبەهرەوشیاویەی هەیانبوو لەخۆرێکخستن وتەکوزی دا،توانیان لەماوەیەکی کورتدا رادەیەکی زۆر پینی سیلین بەرهەم بێنن،بەچەشنێکی وا کە لەهاوینی ١٩٤٤بەدواوە گەلێک لەسەربازانی بریندراری ئاڵمانی کەچارەسەری ئەوان پێداویستی بە دەرمانی دژەمیکرۆب هەبوو دەکەوتنە بەر لێدانی پینی سیلین.

ئیشتوفان بێرک لەدوای ئەوەی لەنەخۆشخانە هاتە دەرێ ئەگەرچی دەستێک وچاوێکی نەبوو بەڵام دەشیا دەستی چۆپەی خۆی بەباشی دەکارکا.هیتلەر پاش ئەوەی ئیشتوفان بێرک لەنەخۆشخانە هاتەدەرێ چاوی پێکەوت وگوتی دەبینم زائربرۆخ سەبارەت بەتۆ موجێزەی کردووە.

لەدوای ئەوەی کە ئیشتوفان بێرک لەئەفریقا بریندار بووپلەی"سەرهەنگ"ی پێ بەخشراوئەورۆژەی هیتلەر لە دوای هاتنەدەری لەنەخۆشخانە چاوی پێکەوت کردی بە سەرۆکی ستادی

هێزی ئیحتیات،لەئاڵمانیٚ دا ئەو ئیشەدەدرا بەکەسێک کەلانی کەم پلەی "سەرلەشکر"ی هەبا.

لەپاش ئەوەی کە ئیشتوفان بێرک گیرالەدادگای سەربازی دا گوتی پێشەوا (یانی هیتلەر)م خۆش دەویست و رێزی لەلام هەبوو ،بەڵام ئەوینی وڵاتەکەم لاپتر وبەسۆزتربوو لە خۆشەویستی هیتلەر،دەشمزانی کە تاقانە بەختی نەجاتی ئاڵمان ئەوەیە کە ئەو لەسەر کار لابدریٚ.

هیتلەر گوتەنی؛ زائربرۆخ سەبارەت بە ئیشتوفان بێرک هەربەڕاستی موجیزەی نواندبوو،بەڵام مەودای نێوان ئەورۆژەی کەئەوئەفسەرە لەنەخۆشخانە هاتە دەر و ئەو کاتەی لەسێدارە درا،ماوەیەکی زۆری نەکێشا.هیتلەر تا دوامین رۆژی ژیانی، ئەوکەسانەی کەلەدەسکیسی رۆژی بیستەمی مانگی ژووئیەدا بەدژی وی بەشداریان کردبوو ،دەیکوشتن.بەشێوەیەکی وا کە نۆ رۆژ بەر لەوەی خۆی و ماشووقەکەی"ئورابرون"دەژێرزەمینی کوشکی سەدری ئەعزەمی ئاڵمان دا خۆبکوژن،"دەریاسالار" کاناریس سەرۆکی رێکخراوی جاسووسی ودژەجاسووس (دەزگای زانیاری و پاراستن)ی لەداریٚ دا چوونکە راپۆرتیان دابۆیە کە کاناریس ئاگاداری داو دانانەوەی ئەو کەسانە هەبووە کەبەتەمابوون بە بۆمی سەعاتی بیکوژن، کەچی هیتلەری وریا نەکردۆتەوە وبەرگری نەکردووە لە جیٚ بە جیٚ کردنی ئەوگەلەکۆمەیە.

*کارکردنی مامۆستای بلیمەت بە پلەی یاریدەری*

چوونکە رۆژنامەکانی ئاڵمانی رۆژهەڵات سەبارەت بە؛شێتیە جاربەجاری (خەرفان)ەکەی زائربرۆخ چیان نەدەنووسی لەئاڵمانی خۆرئاوا خەڵک و بگرە نوژدارانیش ئاگایان لە خەرفانی ئەو مامۆستایە نەبوو وتەنیا بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەو هەواڵەی کە بەدرێژی باسی لێکرا،ئاگاداربوون کە خانەنشین کراوە. ( لەحاڵێکدا کەزائر برۆخ بەڵگەنامەکانی پێوەندی داربە خانەنشینی خۆی واژۆ نەکرد.)

لەبەرلینی رۆژاوا دا نەخۆشخانەیەکی بچکۆڵەهەبوو ،هی نوژدارێکی بەناوی دوکتور "ژونگ بلۆت"،ئەو کابرایە ماوەیەک دوای خانەنشین بوونی زائربرۆخ تەمای گرت بانگێشتی ئەومامۆستایە بکا هەتا لە نەخۆشخانەکەی دا خەریکی کار بێ.

چوونکینێ گشت نەخۆشخانەکانی ئاڵمانی رۆژهەڵات بەروی زائربرخ دا داخرابوون و ئەوپیاوەیان لەهیچ کام لەنەخۆشخانەکان وەرنەدەگرت و مووچەی قانوونی ئەو مامۆستایەشیان بڕی و خاوخێزانی زائربرۆخیش خۆ لە دێمەی نەدەژیان،مامۆستای بلیمەت وچاران پێشنیازی دوکتۆر ژونک بلوتی بۆ کارکردن لەنەخۆشخانەی وی دا پەسند کرد، رەنگە پێویستیش نەبێ کەبەدرێژی باسی بکەین کەمەبەستی دوکتۆر ژونگ بلوت کە نووسراوی فەرمی ناردە لای مامۆستا،کەڵک وەرگرتن لەناووناوبانگی زائربرۆخ بوو و دەیەویست بە راکێشانی ئەو پیاوە ناودارە بۆ نەخۆشخانەکەی،نەخۆشخانەی

خۆ، وەک دەڵێن "لانسێ " بکاهەتا ئەونەخۆشانەی کەپێداویستی عەمەل کردنن نەک تەنێ لە هەموو شوێنەکانی ئاڵمان ڕا بەڵکو لە وڵاتەکانی تری ئورووپاش ڕێگای نەخۆشخانە کەی بگرنەبەر،بەتایبەت دەوڵەمەندان بێنە نەخۆشخانەتایبەتیەکەی.

ئەورۆژەی کە زائربرۆخ بۆیەکەم جارهاتەنەخۆشخانەی بچووکی دوکتۆر ژونک بلوت لەبەرلینی رۆژاوا،دوکتۆر ژونک بلوت وژنەکەی وگشت کارگێروفەرمانبەرانی ئەونەخۆشخانەیەلەبەردەرکێ بۆپێشوازی لەمامۆستای چازان بەریز راوەستابوون،بەرێزەوەئیکلاڵمیان بۆکێشا،هەنگی لەدووی وی هاتنەنێو نەخۆشخانەو دوکتۆر ژونک بەشەجوراوجۆرەکانی نەخۆشخانەکەی بەزائربرۆخ نیشان دا.

ئەوکاتەی زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی دوکتۆر ژونک بلوت دەستی بە کارکرد دەگەڵەوەی خەڵک پتری رودەوێ کرد بەڵام داهاتەکەی بەو رێژەیە زیادی نەکرد چوونکە ئەو کەسانەی دەهاتن زیاتر لەئاڵمانی خۆرهەڵات و شاری بەرلینڕا دەهاتن ،کەلەو سەردەمی دا هاتوچۆیان ئازاد بوو،وهەموو وافێرببوون کەهەقدەستی نوژداری بەنرخێکی هەرزان بدەن و دوکتۆر زائربرۆخیش زێتری داوا نەدەکرد،یەکێ لەرازەکانی خۆشەویستی و رێزی زائربرۆخ لەنێو خەڵکی دا هەرئەولا نەکردنەوە بۆ دەوڵەت و ماڵ و داهاتەبوو.

بەڵام دوکتۆر ژونک بلوت کەمەبەستی لەبانگێشتنی زائربرۆخ بۆهاوکاری زیادکردنی داهاتی نەخۆشخانە بوو دەیەویست بەهۆیەک لەناووناوبانگی زائربرۆخ کەڵک وەرگرێ بۆ کەڵەکەکردنی داهات،پێشهاتێک،بەلێکدانەوەی خۆی،ئەوهەلەی بۆ رەخساند.

لەئاڵمانی رۆژاوادا دامەزراوەیەک هەبوو بەناوی "فوکس فیلم" کەفیلمی بەڵگەیی هەڵدەگرتنەوە،لە دوای ئەوەی زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی ژونک بلوت دا دەستی بەکار کرد ئەو دامەزراوەیە هاتنە لای سەرۆکی نەخۆش خانە هەتا لەیەکێ لەعەمەلیاتە نەشتەرگەریەکانی زائربرۆخ فیلم هەڵگرێتەوە.

دوکتۆر ژونک بلوت بەوهیوایەی کەئەوفیلمەبەڵگەییە یارمەتی بەناوودەنگ و وەرمێن کەوتنی کاری نەخۆشخانە کەی دەکا،پێشنیازی فوکس فیلمی پەسند کردو رەزامەندی زائربرۆخیشی وەرگرت بۆئەوەی فیلم هەڵگرەوە کان لەوەتاغی عەمەل دا حازر بن و فیلم هەڵگرنەوە.

لەورۆژەی دا کە دەبوو فیلم هەڵگرەکان بێن،دوکتۆر"بلوت" پێی گوتن :ئەگەر لەدوای چوونەژوورتان بۆ هۆدەی نەشتەرگەری،هەستان کردکەزائربرۆخ پێی ناخۆشە،گوێ مەدەنێ و تەنانەت ئەگەرهاتو سەبارەت بە ئێوە تورەیشی دەربری ،کاری خۆتان جێ مەبەڵن.

دوکتۆر بلوت لەگەڵ ئەوەی کە رەزامەندی زائربرۆخی بۆ هاتنی فیلم هەڵگرەوەکانی لە ژووری عەمەل وەرگرت بوو لەوەی دەترسا کە رەنگبێ مامۆستا پێی ناخۆش بێ وبەو هۆیەوە ئەوانیش فیلم هەڵگرتنەوە رابگرن و لێبدەن برۆن.

ناوبانگی زائربرۆخ ئەوەندە زۆربوو کەلەوێ رۆژێدا خودی بەرپرسی "فوکس فیلم "یش لەگەڵ فیلم هەڵگرەکان هاتە نەخۆشخانەی.

ئەوی رۆژێ، بریاربوو لەنەخۆشخانەی دوکتۆر بلوت دا یەکێ لەدوو گورچیلەی ژنێکی کە تووشی نەخۆشی گورچیلەببوو

دەرێنن،زائربرۆخ هەرکە وەژوورکەوت بەدوکتۆر بلوتی گوت من ئەمرۆ نەشتەرگەری ناکەم و دەبمە بەردەستی تۆ.

ئاخۆ زائربرۆخ لەو کاتوساتە دا،بەهۆی بیرشاشی،خۆی وادەهاتەبەر چاو کەهێشتا نەبووەبە نەشتەرگەرێکی سەربەخۆ و لەژووری عەمەل دا بەپلەی یاریدەری کاری دەکرد؟. ئێمە لەوبیروبۆچوونانەی کەئەوی رۆژێ بوونەهۆی ئەوەی کە زائربرۆخ ئەو پێشنیارە بکا ئاگادار نین،دوکتۆر بلوتیش سەری سوڕما لەپێشنیازی بلیمەتێ وەک زائربرۆخ چوووونکە ئەو پێشنیازە واوەیدەچوو کەمامۆستایەکی مەزن بە شاگردێکی خۆی بڵێ دەیەوێ لە بەردەستی وی دا کار بکاو ببێتەشاگردی!.

بەڵام دوکتۆر "بلوت"دوای واق وڕمان لەپێشنیازی زائربرۆخ بەبێ ئەوەی تەنانەت بەبیریشی دابێ کە چ روداوێک خەریکی قەومانەلەناخی خۆی دا پێ کەیف خۆش بوو چوونکە ئەوێ رۆژێ،فیلم هەڵگرەوەکان، لە عەمەلی نەشتەرگەریەکە فیلمیان هەڵدەگرتەوە،جا چ شانازیەک لەوەی مەزنتر کەپیاوێکی وەک زائربرۆخ لە ژووری عەمەل دا یاریدەری بێ.

لەرۆژی دیاری کراودا نەخۆشیان بردە هۆدەی نەشتەرگەری و دوکتۆر بلوت و زائربرۆخ هاتنەژوورێ ودوکتۆری بێهۆشی وپەرستارەکان لەپێش ئەودوو نوژدارە لەوێ حازربوون و لەدوای هاتنە ژووری فیلم هەڵگرەوەکان، دەس بە عەمەل کرا.

دوکتۆر بلوت دەستی کرد بە عەمەل کردن و زائربرۆخ لەپاش ئەوەی شوێنی نەشتەرگەریەکە لێک ئاوەڵا کرا ، بەپەنس،هەردوولێوی

برینەکەی لێک کردەوەهەتادوکتۆر بلوت جێگای برینەکە بەباشی ببینێ .

فیلم هەڵگرەکانیش دەستیان بەکاری خۆکردولەژووری عەمەلێ لەدەنگی ئاپاراتی فیلم هەڵگرتنەوە بەولاو ە هیچ دەنگی دی نەدەهانەبەرگوێ،جارجارەش کەیەکێ لە پەرستارەکان ئاسێرێکی نەشتەرگەری هەڵدەگرت تا بیداتە دوکتۆر بلوت جرینگەیەکی کزی کانزا بەرگوێ دەکەوت.

عەمەلیاتی هەڵگرتنی گورچیلەیەکی عەیب دار پێداویستی وەیە کەتەواوی پلووسکەکانی خوێن، یانی ئەو دەمارانەی کەدێنەوە سەرگورچیلە،ببەسرێن و هەنگی گورچیلەکەهەڵبڕن چوونکە ئەگەرئەودەمارانە نەبەسرێن نەک تەنیاخوێن شوێنی عەمەلەکە دادەگرێ بەڵکوئەوەندە خوێنێ دەدەڵێنن کەنەخۆش ماڵاوایی لەژیانێ دەکا.

بەلام دۆزینەوەی پلووسکەکان (دەمارەکان)ی خوێن بۆ بەستنیان،لەگشت عەمەلەکانی گورچیلەدا،کارێکی هەر وا سووک وسانانیە وکەم تازۆر کات دەبا،چوونکە هەندێ جار بەهۆی گورچیلە خەراپ بوون،هەندێ لەرێگاکانی خوێن بەتەنراوەی ماسیو یان تەنراوەگەلێ کەبەشێوەیەکی تر شکڵیان گۆراوە،دادەپۆشرێن ،جا،نوژدار ناچارەئەو تەنراوانە لەدەمارەکان جیاکاتەوەوهەنگی دەمارەکان ببەستێ.

گورچیلە خرابۆکەی ئەو ژنەش هەر ئەو حاڵەتەی هەبوو،دوکتۆر بلوت تەنراوەکانی لەدەماران دەکردەوە هەتا بیانبەستێ.

لەنێو بێدەنگی ژوورەکەدا لەپڕ دەنگی زائربرۆخ،بەشێوەیەکی سەرکۆنەکەرانەوە،بەرزبۆوە،رودەدوکتۆر بلوتەوە، گوتی:بۆهێندە ساوەساویێ دەکەی ؟...ئەمەی (ئاماژەی بەگورچیلەکە)هەڵبڕەو برینەکەبپێچەوە !!.

لەهۆدەکەدا، ئەم روتێکردنە سەرکۆنەکەرانەیە لەبەرگوێچکەی گشت ئەوکەسانەی حازربوون ؛هەرلە فیلم هەڵگرەکان وبەردەست و پەرستارەکان ڕا بگرە،تەنانەت ئەو دوکتۆرەی کەبەرپرسی بێهۆشی بوو،ئاسایی هاتە بەرگویێ،چوونکە هەموو و تەنانەت بەرپرسی بێهۆشیش پێیان وابوو زائربرۆخ لەبەر ئەوەی بۆتە یاریدەری دوکتۆر بلوت کەئەگەر هاتو شتێکی لەبیرچوو یان هەڵەیەکی کرد،ئاگای لێبێ و وەبیری بێنیتەوە.چوونکەپلەی زائربرۆخ ئەوەندە بەرز بوو کەهیچ کەس باوەری نەدەکرد کەئەو ببێتە یاریدەری نەشتەرگەرێکی وەک دوکتۆر بلوت،مەگەر بۆ مەسلەحەتێکی پسپۆرانە وچاوەدێری بەسەر عەمەلی نەشتەرگەری دوکتۆر بلوت دا.دوکتۆر بلوت لەبەرانبەر فەرمانبەرانی تەندروستی وفیلم هەڵگرەکاندا بەو تێراخورپینە،زۆر بەخۆدا شکایەوەو سوور هەڵگەرا،بەلاّم هیچی نەگوت.

زائربرۆخ چاوەنۆری وڵامێک بوو لەلایەن دوکتۆر بلوتەوە،کەدەگەڵ بێدەنگی وی روبەرو بوو بەشێوەیەکی تورە وقلّسانەتر گوتی:مەگەردەگەڵە تۆم نیە ؟! بۆچی بەفەرمانی من ناکەی؟ (قامکی بردەسەرگورچیلەکە) ئەمەی هەڵبرە و توری دە.

ئەم ئيراد گرتنە پترلە رەخنەگرتنەكەى پێشتر وەبەردڵى گشت ئەوكەسانە كەوت كەلەژوورەكە دا حازر بوون، هەموو وا تێگەيشتن كەدوكتۆر بلوت لەحاڵى ئەنجام دانى كارێكى هەڵەدايەو زائيبرۆخ هەقيەتى خۆى لێ تورە كاو سەركۆنەى بكا.

دوكتۆر بلوت كەئيتر بەخۆ نەدەوەستا و نەيدەتوانى بێدەنگ بێ گوتى:"گيهيم رات" مەگەر ئێوە نازانن كەلە پێشدا دەبێ تەنراوەكان لەدەمارەكان جياكرێنەوە و دوايە دەمارەكان ببەسرێن وهەنگى گورچيلە هەڵببرێ، من ئەگەر بەبێ بەستنى دەمارەكان گورچيلەكە هەڵبرم خوێن ئەوەندە فركەى دەكا كەنەخۆشەكەى پێ دەمرێ.

زائيبرۆخ گوتى ئەوكاتەى كێردى نەشتەرگەرى دەكەوێتە بەردەستى كەسانى وەك تۆ ئاكامەكەى هەر ئەمە دەبێ كەلەنەشتەرگەريەكى ساكارى گورچيلەدا دەمێننەوە.

دوكتۆر بلوت ديسانيش بێدەنگ بوو.

ئەو فيلم هەڵگرەوانەى لەوێ بوون و چ ئاگايان لەتێكچوونى جارجارە (خەرفان)ى زائيبرۆخ نەبوو،هيچ شكيان نەماكەدوكتۆر بلوت خەريكى كارێكييەكەلەگەڵ رێساكانى زانستى وهونەرى نەشتەرگەرى دا يەك ناگرێتەوەو هەربۆيە زائيبرۆخ بەپێى ئەركى خۆى ئيرادى لێدەگرێ وپێيان سەيربوو كەلەبەرچى دوكتۆر بلوت لاسارى دەكا وپێرەوى لە فەرمانى مامۆستاى مەزن ناكا.

لەژوورى عەمەلێ دا،هيچ كەس نەيدەزانى كە زائيبرۆخ ديسان تووشى هيرشى شيتى بۆتەوە، مامۆستاش كەلەداخى بێدەنگى دوكتۆر بلوت هەڵچوو بوو،گوراندى: هەى ماڵات!!،مەگەر بەتۆ ناڵێم

ئەمە (قامکی بردەسەر گورچێلەکە)ی ببڕە وهەڵیدێرە،ئەدی بۆ جوابم نادەیەوە؟!.

دوکتۆر بلوت وتی جەنابی زائربرۆخ بەرپرسی عەمەلکردن منم نە تۆ،ئەتۆ لێرەدا یاریدەری منی ونابێ خۆ دە کارەکانی من هەڵقوتێنی جائەوجا لەبەرچاوی زەقبووی ئامادەبووان،بەتایبەت فیلم هەڵگرەوەکاندا ئەورووداوەی لەنەخۆشخانەی بەرلینی خۆرهەلات دا روی دابوو دووبارە بۆوە،زائربرۆخ هێرشی کردەسەر دوکتۆر بلوت وبەرۆکی گرت.

فیلم هەڵگرەکان کەهەستیان کرد لەشانۆیەکی دەگمەنی تاقانە،کەنەلەرابردوودا وێنەی هەبوەو نەلە داهاتوو داهاوتای پەیدادەبێ، وێنەهەڵدەگرنەوە،بەشێلگیری درێژەیان بە فیلم هەڵگرتنەوەی خۆ داو بەوردی هەوڵیان دەدا کەهیچ کام لەدیمەنەکانی کێشەوهەرایەکە لەدەس نەچێ.

هاوسەری دوکتۆر بلوت کەبەهۆی هەراوهەنگەمەکە خۆی گەیاندبۆوە ژووری عەمەل هەوڵی دەدا زائربرۆخی لەیەخەی مێردەکەی بکاتەوە،فیلم هەڵگرەکانیش بەبێ ئەوەی تەنانەت چاوترووکانێکیش لەو دیمەنەدەگمەنانە لەکیس خۆ بدەن،درێژەیان بە فیلم هەڵگرتنەوەی خۆ دەدا.

ئەگەرهاوارکردنی دوکتۆری بێهۆشی سەرنجی ئەوانی دیکەی بۆلای حاڵی نەخۆشەکەرانەکێشابایە ئەو ژنە بەخترەشە دەمرد،بەلام هاواری ئەودوکتۆرە پەرستارەکان و دوکتۆر بلوت وفیلم هەڵگرەکانی هێناوەسەرەخۆ کە ئەوژنەلەسەرتەختی عەمەلێ یەولەبەرانبەر

مەترسی مەرگ دایە، هەرچۆنێکی بوو زائربرۆخیان رەکێش راکێش لەژووری عەمەلیٚ بردە دەرەوە وفیلم هەڵگرەکانیش بەپەلە رێگای چوونەدەریان گرتە پێش چوونکە پێشبینیان دەکرد دوکتۆر" ژونک بلوت "داوایان لێدەکاهەتا فیلمی دەستەویەخەبوونەکەی بدەنیٚ؛ بۆئەوەی لەنێوی بەریٚ، ئەگەرچی ئەویٚ رۆژیٚ داوایەکی ئاوهانەهاتە گۆریٚ بەڵام لەپاشان دوکتۆر بلوت داوای لەسەرۆکی دامەزراوەی فوکس فیلم کرد بەخاتری ئابرووی نەخۆشخانەو هەروەها رێزی زائربرۆخ لەپیشان دانی ئەو فیلمە خۆ بپارێزن.

لەدوای ئەوەی دوکتۆر بلوت توانی عەمەلە ناتەواوەکەی ژنەتیوی تاین درێژەبداو تەواوی بکا، گوتی: ئێستا دەزانم کەپاش هێنانی زائربرۆخ بۆ ئەم نەخۆشخانەیەئەوی سەبارەت بە شێتی زائربرۆخ بەمنیان گوت؛ راستە.

سبەینێی ئەو رۆژە ،چوونکە هێشتا پێوەندی تەلەفونی لەنێوان بەرلینی خۆرهەلات ورۆژاوادا نەپچرابوو، لە نەخۆشخانەی دوکتۆر بلوت ڕا تەلەفونیان بۆماڵی زائربرۆخ کرد کە؛چوونکە ئەویٚ رۆژیٚ نەخۆشیکیان بۆ عەمەل کردن نیە پێویست ناکا زائربرۆخ خۆی زەحمەت دا و بێتە نەخۆشخانە. رۆژی دوایی زائربرۆخ هاتە نەخۆشخانە بەڵام رێگایان پێنەدا بچێتە ژووریٚ.

لەویٚ رۆژیٚ ڕا زائربرۆخ بەشێوەیەکی راستەقینە خانەنشین بوو بەڵام ئەونەخۆشانەی کەنەیاندەزانی ئەو تووشی شێتی جارجارەیە و بڕواشیان پێی هەبوو دەچوونە ماڵی داوایان لێدەکرد وتەنانەت لێی

دەپارانەوە کە بیانخاتەبەر عەمەلی نەشتەرگەری، ئەگەرچی لەماڵێش بێ.

ئەم دەورانە لەژیانی دوکتۆرایەتی زائربرۆخ پڕلەکارەساتترین و پەرۆشی هێنترین دەورانەکانی ژیانیەتی لەدوای سەرهەڵدانی نەخۆشی خەرفانیەوە.ئەولەو دەورانەدا بەبێ ئەوەی بزانێ چ دەکا کۆمەڵێک لەو کەسانەی بۆ عەمەلی نەشتەرگەری هاتبوونەلای ،لەکاتی عەمەلێ دا لەت لەتی کردن یان بەشێوەی تر کوشتنی وناردنیە گۆرستان.

بەلام بەرلەوەی کەسەبارەت بەم دەورانەی ژیانی زائربرۆخ بدوێین پێویستە ناوی پیاوێک بێنین کەلەدوامین مانگەکانی تەمەنی زائربرۆخ دا شەقلی بەسەر ژیانی وی دا دیارە وهێشتا ناومان نەهێناوە، ئەوپیاوە یان بە ناوی "شورد فکێر"ناودەبرد.

*پیاوێکی هەڵاتوو کەهاتە نێو ژیانی زائربرۆخ*

"شوردفکێر"لەهەوەڵی گەنجیەتی بەرەو "چەپی بوون "دەشکایەوە ولەدوای ئەوەی کە هیتلەر هاتە سەرکار، لەبەرلین دادوکانێکی بچکۆلەی کردەوە بۆ فرۆشتنی کۆنەکتێبان وجارجارەش بۆخۆی کتێبی دەهەرزان قیمەتی بەچاپ دەگەیاندن و دەی فرۆشتن.

لەپاش هەڵگیرسانی شەر لەمانگی سپتامبری ساڵی ١٩٣٩ لەبەر ئەوەی یەکێ لەو کەسانەبو کەدەبوو بۆ ئەنجامدانی خزمەتی

سەربازی حازر ببێ، چووە ئیجباری ودوکانە چکۆڵەکەی بەشاگردەکەی ئەسپارد.

بەڵام ئەو لەکاتی خزمەتی سەربازی دا نەیدەتوانی زمانی خۆی گرێ بدا،جارێکی تەمبێ کرا،بەڵام چوونکە سەربازێکی ئازاودلێربوو گەیشتە پلەی"گرۆبان"ی. لەساڵی ١٩٤٥دا (ساڵی کۆتایی شەر) شوردفکێرلەکارخانە یەکی چەک سازی دا پاسەوانی دەکرد،نەوکارخانەیەدا،وەک هەمووکارخانەکانی تری ئاڵمان،کرێکاران شەو و رۆژ خەریکی کوێرەوەری کێشان بوون،شەوێکی شوردفکێر لەیەکێ لەکارگاکان بەکرێکارانی گوت:لەیەکێ لەم شەوانەدا فرۆکە بۆم هاوێژەکانی ئەمریکا وئینگلیس ئەم کارخانەیە دەکوتن و ئێوە هەمووتان دەکوژرێن.

چوونکە لە هەموو کارخانەکانداسیخۆڕی ئالمانی هەبوون،سبەینێ شوردفکێریان گرت،زانی کەهیچ شک نیە دەینێرنە مەیدانی شەر. کەچی بەرلەوەی نۆرە ناردنی بۆ دادگایەی بگاتێ لەبەندیخانەدا کردەوەیەکی وای لێ رودا کەلەروانگەی نازیەکانەوە کردەوەیەکی لەبەخشین نەهاتوو دەژمێردرا،ئەویش گورانیەکی بەدژی هیتلەربوو کەلەوێدا دەگوترا؛دەبێ ئەو لەسێدارە بدرێ.

گوتنی ئەو گۆرانیەلەبەندیخانەدا وسەرنج دان بەرابردووی سیاسی ئەوپیاوە بوە هۆی ئەوەی دادگا لەرۆژی١٤ ئەپریلی١٩٤٥بەتاوانی خیانەت بە نیشتمان حوکمی ئیعدامی بەسەردا بڕیەوە. شوردفکێرداوای پێداچوونەوەی کردو دوسیەکەی گەراوە بۆدادگای پێداچوونەوە، رۆژی ٢٩ی ئاڤریلی١٩٤٥دادگای پێداچوونەوە پێی

جەختی لە سەرحوكمەكەی دادگای بەرایی كردەوە، رایانگوێست بۆ گرتووخانەی بەرلین هەتالەبەرەبەیانی رۆژی سیهەمی ئاپریل ئیعدامی بكەن.

لەبەرەبەیانی ئەو رۆژەی دا رێژنەی تۆپ و خومپارەكانی سپای سۆڤیەت بەسەرگرتووخانەی بەرلین داباری ، چوونكە سپای سۆڤیەت كەگەیشتبوەبەرلین،هەروەكی لەمێژووی شەری دووهەمی جیهانی دا نووسراوە؛ بە چل هەزار عارەبانە تۆپ بەرلینی بۆمباران كرد.

لەبەندیخانەی بەرلین دا بەهۆی داباریني تۆپ وخومپارە،هەودای گشت خۆرە دیسپلین و تەرتیبێک پسا و هەرچی زیندوو مانەوە لەزیندانەوان و گیراو بۆی دەرچوون، شوردفكێر یش كەهەرچلكی سەربازی دەبەر دابوو بەڵام بەهۆی مانەوە لە بەندیخانەدا ریشی هاتبوو،ئەویش بۆی دەرچوو.ئەو نەیدەزانی بچێتەكوێ و چلۆن خۆی حەشار بدا.ئەگەر ئاڵمانیەكان گرتبایان دەكوژرا و ئەگەرسەربازەروسەكان دیتبایان ،چونكە جل وبەرگی سپای ئاڵمانی دەبەر دابوو،دەكەوتە بەر دەسرێژیان یان بەدیل دەگیرا.

لەحاڵێک دا كەشێواو وشپرزە لەشەقامەكانی بەرلین دا دەخولاوە گەیشتە بەرانبەر نەخۆشخانەی شاریتی و وەبیری هاتەوە كە نوژداری مرۆڤ پەروەر زائربرۆخ لەوێ كاردەكا.

شوردفكێر ،ئاگاداری وەگیركەوت كە زائربرۆخ لەپەناگای نەخۆشخانەدا خەریكی كارە،ئەوەندە لەوپەناگایە دا خۆی مەڵاس دا

هەتا لەنێوان دوو عەمەلی نەشتەرگەری دا زائربرۆخ چەندچرکەیەک لەژووری عەمەل هاتەدەر.

شوردفکێرخۆی گەیاندێ وبەچەند وشە حاڵ ووەزعی خۆی تێگەیاند وگوتی پەنای بۆ هێناوە. زائربرۆخ گەراوە ژووری عەمەلێ و لەجانتاکەی خۆی تیخێک و سابوونێکی دەرێناو دای بەشوردفکێر و گوتی برۆ دەسشوری و ریشت بتاشەو پاشان وەرە ژووری عەمەلێ.

شوردفکێر ریشی تاشی و لەهۆدەی عەمەلێ خۆی گەیاندەوە لای زائربرۆخ،مامۆستا روپۆشیکی سپی و خوێناوی وێدا وگوتی :ئەمە دەبەرکە ولەئێستاڕا تۆ یەکێ لەبەردەستەکانی منی.

شوردفکێر هەڵیدایە:مـن هیچ زانیارێکم لەبارەی پزیشکی ونوژداریەوەنیە،چلۆن دەتوانم بەردەستی ئێوەبکەم.

زائربرۆخ گوتی: لەگەڵ من وەرەژووری عەمەلێ وهەتامن لەوێم تۆش لەوێ بەولەدوای من لەژووری عەمەلێ وەرە دەرێ، بەوشێوەیە کەس لەتۆ ناپرسێ کە ئاخۆ لەپزیشکی و نوژداری چ سەرەدەرێ دەردەکەی یان نا و راشدەسپێرم جیرەیەکی خۆراکت بدەنێ هەتا بەبرسیەتی سەرنەنێیەوە.

لەو رۆژانەی کە شەری بەرلین درێژەی هەبوو شوردفکێر لەنەخۆشخانەبوو،لەدوای کۆتایی شەر لەوێ هاتە دەرێ و بەوپەری سەرسورمانەوە تەماشایکرد لەوشارەیدا کەهەموو خانووبەرەکان تێک رمیابوون دوکانە چکۆڵەو هەژارانەکەی وی نەروخابوو، هەردەتگوت تۆپ وخومپارەکان شەرمیان بەخۆدا هاتبووە کەئەو دوکانۆکەیە

نوغرۆ کەن وپلەوپایەی خۆیان لەوەی بەرزتر هاتبۆ بەرچاوکە خاپووری ئەو دوکانۆکەبێ.

شوردفکێر بەرلەشەڕ لەبەرئەوەی گەنج بوو وتازە دەستی بە کار کردبوو،کتێبی دەهەرزان قیمەت وبە زۆریش ئەفسانەکان، بەتایبەت ئەفسانەگەلی پۆلیسی بڵاو دەکردەوە، کەچی لەدوای شەڕ،پیاویکی خاوەن ئەزموونی گەشەکردوولەباری تێگەیشتنەوەی لێ دەرچوو،لەدوای ئەوەی بارودۆخی بەرلین بەشکلێکی واگۆراکەئەو بتوانێ دوکانۆکەی خۆی دیسان بکاتەوە،کەوتەسەر ئەوبیرەی کتێبی دەوا چاپ بکاکەلەهەقایەت و ئەفسانە سەرتر بن،بیرەوەری چەندکەس لەئەفسەرو سەربازانی ئاڵمانی سەبارەت بەساڵەکانی شەری دووهەمی جیهانی بەچاپ گەیاند وفرۆشتنی.

شوردفکێر رۆژێکی لەرۆژنامەدا چاوی پێکەوت کە زائربرۆخ خانەنشین کراوە،لەدوایە خوێندیەوەلەرۆژنامەدا کە لەنەخۆشخانەی دوکتۆر بلوت دا دەستی بەکارکردوە،بۆسێهەمین جار ناوی زائربرۆخی لەرۆژنامەدا دیت نووسرا بوو کەئیتر لەنەخۆشخانەی دوکتۆر بلوت دا خەریکی کار نیە.بەسەرنج دان بەوناسیاویەی کەپێشتر لەگەڵی دا هەیبوو کەوتەسەرئەوبیرەی کەپێشنیاربکا بەزائربرۆخ بیرەوەریەکانی بڵاو بکاتەوە.شوردفکێر پاش دیتنەوەی زائربرۆخ هەستی کرد کە بارودۆخی ژیان و گوزەرانی نوژداری مەزن باش نیە.

زائربرۆخ ئیتر لەنەخۆشخانەی شاریتی مووچەی نەدەدرایەچوونکە بەشێوەی فەرمی خانەنشین نەکرابوو، (ئەوبەڵگەنامانەی دەبوو واژۆیان کردبا،ئیمزای نەکردبوون) مووچەی خانەنشینیش نەدەدرایە.

زائربرۆخ لەبەرانبەر پێشنیاری شوردفکێر دا پێی گوت کەبیرەوەریەکانی لەم ماوەی دا بۆچاپ ئامادە دەبێ (ئەو بەڵێنەش هەرلەشاشی هەستگەلی ڕا سەرچاوەی دەگرت ،ئاخرچوونکە بیرەوەری تەمەنێک ناکرێ لەمانگێ دا بنووسرێتەوە).

شوردفگێر لەدوای ئەوەی لەمامۆستای بیست کەبیرەوەریەکانی هەتا مانگێکی دیکە ئامادە دەبن لەگەڵ یەکێ لەهاوکارانی خۆی کەخاوەنی دامەزراوەیەکی چاپەمەنی بەناوی"کیندلێر"لەشاری "مونیخ"بوو سەبارەت بەومەبەستەکەوتە گۆت وبێژ هەتا پێکەوە بیرەوەریەکانی مامۆستا چاپ و بڵاو بکەنەوە.

کیندلێر گوتی ئەگەر زائربرۆخ بیرەوەریەکانی نەنووسیبێ وبیەوێ لەمرۆڕا دەس پێ بکا هەتا ساڵێکی تریش بیرەوەریەکانی ئامادە نابن بۆ چاپ. بەڵام دەکرێ هەرچەندێکی حازردەبێ نێوەنێوە لەیەکێ لەگۆڤارەکاندا بڵاو کرێتەوە ولەدوای ئەوەی تەواو بوون بەشیوەی کتێب چاپی کەین،شتێکی دیش ئەوەیە کەدەبێ بیرەوەریەکانی زائربرۆخ بۆچاپ کردن لەگۆڤاردا بەتەرزێکی تایبەت رێک وپێک کرێن.چوونکە زائربرۆخ پیاوێکی نوژدارەو هەروەک گشت پزیشک و نەشتەرگەران بیرەوەریەکانی بەشێوازی زانستی دەنووسێ وخەڵکی ئاسایی تێناگەن کەئەو چ دەڵێ و ئەوکتێبەی کەبەم چەشنە لەلایەن نوژدار یان پزیشکێکەوە بنووسرێ فرۆشێکی زۆری

نابێ،چوونکە خەڵکی ئاسایی نایخوێننەوە،هەرلەبۆیە ئەو دەمەی پزیشک یان نەشتەرگەرێک کەبەتەمایەبیرەوەریەکانی خۆی بۆخەڵکی (نەک هاوکارانی خۆی کەپسپۆرن)بڵاوبکاتەوە نووسەرێک رادەسپێرێ کەبیرەوەریەکانی لەچوارچیوەی زاراوەو فورمولەکانی زانستی دەرکێشی وبەشێوەیەک دابرێژێتەوە کەبۆخەڵکی ئاسایی،ئەوەی لەزاراوەگەلی پزیشکی بێ ئاگان،شایانی تێگەیشتن بێ.

بیرەوەریەکانی زائربرۆخیش گەرەکە لەلایەن نووسەرێکەوە دابڕێژرێ ولەگۆڤارێک دا چاپ بکرێ ولەپاش ئەوەی کەگەیشتەکۆتایی بەشکڵی کتێب بڵاو بکرێتەوە ، رەزامەندی زائربرۆخ بۆ دارشتنەوەی بیرەوەریەکانی لەلایەن نووسەرێکەوە پێویستە، هەندێ لەزانایان رازی نابن کەهیچ کەس دەس دەبیرەوەریەکانیان وەردا.

شوردفکێر جارێکیتر رێگای ماڵی زائربرۆخی گرتە بەر هەتا ئەوەی لەبەرێوەبەری دامەزراوەی کیندلێری گوێ لێ ببوو پێی بڵێ و رەزامەندی زائربرۆخ وەربگرێ بۆئەوەی بیرەوەریەکانی لەلایەن نووسەرێکەوە رێک بخرێ و وەک دەڵێن گەلپەسند بێ، زائربرۆخ بەو مەرجەی رازی بوو ، شوردفکێر بەمامۆستای گوت کەبەم زووانە بۆ بەستنی گرێبەستێ سەبارەت بەبڵاوکردنەوەی بیرەوەریەکانی زائربرۆخ لەلایەن چاپەمەنی کیندلێرەوە دێنە لای.

ئاخرەکەی دامەزراوەی کیندلێر لاوێکی رۆژنامەنووسی کەهەم هەواڵنێر بوو وهەمیش نووسەر راسپارد بچێتە بەرلین و رەشنووسی

گرێبەستی بڵاوکردنەوەی کتێبی بیرەوەریەکانی زائربـرۆخ بـەمامۆسـتا ئیمزا بکا.

کیندلێر رایسپاردە لاوە رۆژنامەنووسەکە،کەوەک زوربەی هـەواڵنیـر و رۆژنامـەوانـەکـانی لاوی رۆژنامـەکـان زرینـگ وچوسـت وچـالاک بـوو، ئـــەوەنـــدی لـــەدەســـتی دێ دەبـــێ لـــەمامۆســـتا تێبگـــەیـــەنـــێ کەلەبیرەوەریەکانی دا گـەرەکـە ، هـەڵـس وکـەوتـی لـەگـەڵ زنـایـانی بـــەنـــاوودەنـــگ وپادشـــا وســـەرکۆمـــارەکـــان وفـــەرمـــانرەوایـــانی تروکەسایەتیەکانی ناو داری جیهانی کەعەمـەلـی کـردوون، بـەشێکی گرینگ بگرێتە خۆی چوونکە خەڵک پێیان خۆشە لـەژیـانی تایبـەتـی کەسایەتیەکانی ناودارو ناسراوی دنیا ئاگادار بن.

کینـــدلێر گـوێ بـیس ببـوو کـەزائربـرۆخ "ویـل هـیلم"ی دووهـەم ئیمپراتـۆری ئاڵمـــان و"جـــورج"ی پێنجـــەمـــی پادشـــای ئینگلـــیس و"ئیـــستالین"ی دیکتـــاتۆری ســـۆڤیەت و"موســـولینی" دیکتـــاتۆری ئیتالیای خستۆتە بەر عەمەلی نەشتەرگەری و هیتلـەریش هـاتوچۆی کردووە، سا رایسپاردە لاوی رۆژنامەنووس تابەزائربرۆخ بلێ هەرچەن بۆی دەلوێ لەبیرەوەریەکـانی دا سـەبـارەت بـە ژیـانی تایبـەتـی ئـەو خاوەن دەسەلاتانەو زەبربەدەستانی تر و تایبەتمەندیەکـانی رووحـی و دەروونی ئەوان بنووسێ.

"بێـــرن درۆڤ"بـــە بنهـــەنگلێـــک راســـپاردەی "کینـــدلێر"ەوە روی دە بەرلینێ کرد وچووەماڵی زائربرۆخ، بەڵام پێیان گوت کەمامۆسـتا بـۆ بـــەشـــداری کـــردن لـــە کـــونگرەی نـــوژداری وپزیـــشکی دا چۆتـــە شاری"ویسبادێن".

بێرن دۆرف روی دەشاری ویسبادێن، یەکێ لەشارەکانی ئاڵمان،کرد کەکونگرەی پزیشکی و نەشتەرگەری تێدا بەرێوە دەچوو، لەهوتێلە دەرەجە یەکەکانی شاردا بەدوای زائربرۆخ دا گەڕا چوونکە پێی، وابوو پیاوێکی وەک زائربرۆخی لەکاتی سەفەرکردن دا لەهوتێلە دەرەجە یەکەکان دادەبەزێ.

بەلام لەو جورە هوتێلانە دا ناوی زائربروخ لەدەفتەری دانیشتووەکانی هوتێل دا تۆمار نەکرابوو.

بێرن درۆف لەگەڵ چەند کەس لەپزیشک و نوژدارانی کە لە کونگرەدا بەشداریان کرد بوو پێوەندی گرت ولێی پرسین کەلەکوێ دەتوانێ دەگەڵ زائربرۆخ چاوی پێک بکەوی،کەچی هەستی پێکرد کەئەوان نایانەوێ ولامی رەپ وراستی بدەنەوە،دووکەس لەوان گوتیان زائربرۆخ نەخۆشە.

بێرن دۆرف نەیدەزانی کە زائربروخ لەکونگرەی پزیشکی و نەشتەرگەری ویسبادێن دا وەک گوتاردانەکەی تالاری" بیتهۆڤێن "ی شاری هانوڤێر تووشی هاتەران پاتەران گۆیی بووە وتێکەڵی کردووە.

لەکونگرەی پزیشکی ویسبادێن دابەپێی پروگرام قەراربوو زائربروخ سەبارەت بە نەشتەرگەری لەسینگ دا گوتارێ بدا،چوونکە ماسۆستا لەپێشەوایانی نەشتەرگەری سینە و لەبارەی نەشتەرگەری لەهەناو و دڵ دا یەکەمین داهێنەر بوو، بەرلەوی هیچکەس نەشتەرگەری لەسەر سیی و دڵ نەکردووە، واپێشبینی دەکرا کە گوتاربێژی نوژداری بلیمەت گەلێک سەرنج راکێش دەبێ.

بەڵام زائربرۆخ لەپاش چەند وشە قسەی ڕێک وپێک دەستی کرد بە وڕێنە و هاتەران پاتەران تێکخستنەوە ، ئەمجارە وڕێنە گۆیی مامۆستا بەشێوەیەک پزیشک ونوژدارانی بەشدارلەکونگرەدا بڕوادار بەشێت بوونی خۆی کرد کەبۆ پێڕاگەیشتن ناردیانە نەخۆشخانەی شارەوانی ویسبادێن .

بێرن دۆرف لەزۆر دەرگایانی دا هەتاتوانی بزانێ زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی شارەوانی دا کەوتووە،کەچی ئەو کاتەی بۆدیدەنی مامۆستا چووە ئەونەخۆشخجانەیە نەیانهێشت بچێتە ژووری زائربرۆخ .

هەواڵنێری لاو بە بیانووی هێنانی خۆراک وتەڕەکاڵ وچەپکەگوڵ بۆنەخۆشانی هەزاروبێدەرەتان خۆی گەیاندە نێو خەستەخانە .

لەنەخۆشخانە گشتەکاندا ئەوکەسەی کەلەدەرگانە چووە ژووری ئیتربۆگەران بەنەخۆشخانەدا تووشی گرفت و بەرهەڵستی نابێ، بێرندورفیش بۆدۆزینەوەی ئەوهۆدەیەی کەزائربرۆخی لێبوو دەستی بەپشکنین و گەڕان کرد، لەکاتی رابردن بەبەردەرکی هۆدەیەک دا کەدەرکەکەی نیوە کراوەبوو پیاوێکی بەساڵداچووی چاویلکە لە چاوی دی کەلەژوورەکەدا لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتبوو وخەریکی خوێندنەوەی چتێتکە وچوونکە گەلێک جاران وێنەی زائربرۆخی لەرۆژناسەو بڵاڤۆکان دا دی بوو ناسیەوەو چۆ ژووری .

زائربرۆخ سەری هەڵبڕی وپرسی کارێکت بە منە ؟ .

بێرن دۆرف خۆی ناساند و گوتی لەلایەن دامەزراوەی کیندلێری شاری مونیخەوە هاتووە هەتا سەبارەت بە بڵاوکردنەوەی کتێبی بیرەوەریەکانی قسەی لەگەڵ دا بکا.

زائربرۆخ گوتی کورسیەک بێنەو لەلای من دانیشە.

لاوەکە کورسیەکی لەقەرەوێڵەی مامۆستا نزیک کردەوە ولەسەری دانیشت وچاوی زائربرۆخ بەدەستی چەپی بێرن دۆرف کەوت،دیتی کەلەسەر قامکی ناوەنجی پۆزاییەک هەیەوبەبێ ئەوەی دەستی لێدا گوتی لێگەڕێ بائەو پۆزایەت لەسەر ئەنگوستی لابەرم.

بێرن دۆرف گوتی چاپەمەنی کیندلێر وەپەلە کەوتووە بۆئەوەی بیرەوەریەکانی ئێوە چاپ وبڵاو بکاتەوە،لەپاش ئەوەی کە بیرەوەریەکانت بۆچاپ ئامادەبوون ئەگەر لوتف بکەی دەستم دەدەمە خزمەتت تابیخەیتە بەرعەمەل، ئێستا کاری هەرەپێریست بۆمن وەرگرتنی بیرەوەریەکانی جەنابتە.

بیرەوەریەکانت لەبەرەوە لە گۆڤاری"وێژەی ئاڵمان"داچاپ دەکرێن ودوایە چاپەمەنی کیندلێر بەشێوەی کتێب لە چاپی دەدا، هەنگی بێرن دۆرف بەمامۆستای گوت :لەپاشەوەی بیرەوەریەکانی جەنابت بەشێوەی کتێب چاپ کرا رەنگبێ فیلمی لەسەر دەرێنن، جا ئەگەر ئێوە تەواوی ماف وبەراتی خۆتان سەبارەت بەبیرەوەریەکان بخەیتە ئەستۆی دامەزراوەی کیندلێرباشترە چوونکە لەداهاتوودا تووشی کوێرەوەری وزەحمەتی کەسانی تر نایەی.

زائربرۆخ پرسی مەبەست لەتەواوی ماف و بەرات چیە ؟.

بێــرن دۆرف وڵامـــی داوە یـــانی مـــافی ئێـــوە لـــەبابـــەت چـــاپی بیرەوەریەکانت لەگۆڤاری "وێژەی ئاڵمان" و مافەکـانی پێـوەنـدی دار بەچاپەکانی جوراوجوری کتێب مافی ئێـوە لـەبابـەت دەرێنـانی فـیلم لەسەر کتێبەکە.

زائربــرۆخ رازی بــوو کــەگــشت مــاف و بــەراتــی خــۆی لــەبابــەت بیــرەوەریــەکانیــەوە باوێتــە ئــەستۆی میـسیۆ کینـدلێر، بێـرن دۆرف هەڵیدایە:

لەبۆنەوەی رەش نووسـی گرێبـەسـتەکـە بنووسـم وئێـوەش ژێـرەوەی پاراف بکەن بڵـێ داخـوا چـەنـدەت "مـافی نووسـین"دەوێ لـەجیـاتی چاپی گۆڤارو کتێب و فیلم دروست کردن لە بیرەوەریەکانتان .

زائربرۆخ وەک کەسێکی کەلەزەینی خۆی دا خەریکی لێـک دانـەوەبـێ دەبیــرەوە رۆچــوو،بێرن دۆرف تــەماشــای کــرد ئــەنگوســتەکانیــشی دەجووڵێن وهەردەڵەی بەقامکان حیسابی دەکا،بەکاوەخۆ گـوتی مـن لەبری "مافی نووسین" ی بیرەوەریەکانی خـۆم پێـنج هـەزار مـارک و هەزار هێلکەمریشک ویەک سەت کیلۆ سێوم دەوێ.

بێـرن دۆرف بـەبیـستنی ئـەو رەقـەمـە چـاوەروان نـەکراوانـە سـەری ســـــــورما،چوونکینێ چـــــــاوەنـــــــۆڕ بـــــــوو پیـــــــاوێکی وەک زائربرۆخ،کـــەناوبانگـــەکـــەی پـــشتیوانی بـــەفـــرۆش گـــەیـــشتنی بیرەوەریەکانیەتی ،لەجیاتی سێ"حق التالیف"بـەلانـی کـەمـەوە داوای یەک میلیۆن مارک بکا،شکی پـەڕیـە سـەر ئـەوەی لابـەلای گـوێ لـێ بووە ،داوای کرد زائربرۆخ دوو پاتیان بکاتەوە،مامۆستا دیسان گوتی

لەباتی سێ"بەراتی دانان" خوازیاری پێنج هەزار مارک و یەک هەزار قل هێلکە مامر ویەکسەت کیلۆ گرام سێوە.

بێرن دۆرف نەیدەزانی کەزائربرۆخ هەست وخوستی ئاسایی نیە ولەسۆنگەی نەبوونی هەستگەلی ئاسایی و ئاوەزگەلی لەبار وای دێتە بەر زەینی کەهێشتا هەرەتی گەرمەی شەرە کەسێو و کێلکەمامر دەس ناکەون.

بێرن دۆرف رەشنووسی گرێبەستەکەی نووسی وزائربرۆخ ژێرەکەی ئیمزا کرد.

*دەسپێکی نەشتەرگەری کردن لە ماڵێ*

لەدوای ئەوەی زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی ویسبادێن هاتە دەرێ و گەڕاوە بەرلین دیسان ئەو نەخۆشانەی دەستیان وێرانەدەگەیشت، هاتنە لای.بەڵام زائربرۆخ لەهیچ نەخۆشخانەیەک کاری نەدەکردهەتابتوانێ ئەوان عەمەل بکاکەچی رەزامەندی خۆی نیشان دا کەنەشتەرگەریان بۆ بکابەڵام لەماڵێ.

هەرکەس ئەگەر سەریشی لەعەمەلەکانی نوژداری دەرنەچێ دەزانێ کەلەو کاتی دا،پێداوستی بنەڕەتی عەمەل کردنێک ئەمەیە کەنەخۆش بخرێتە بەر پشکنین و وێنەهەڵگرتنەوە،نوژدار پێویستە شوێنی عەمەلێ لە وێنەدا ببینێ ،خۆ زائربرۆخ لەماڵی خۆی دا ئامێری وێنەهەڵگرتنەوەی نەبوو،ئەگەر نەخۆشی بۆ ئەکس هەڵگرتن ناردبا دامەزراوەیەکی رادیۆگرافی (ئەکس هەڵگرتنەوە بەتیشکی X )ئەستەم

بوو وەریگرن چوونکەپاش کونگرەی پزیشکی ویسبادێن خەرفانی زائربرۆخ لەلای پزیشک ونوژدارانی ئاڵمانەوە ئاشکرا ببوو.

زائربرۆخ کەبەتەمابوو نەخۆشان لەماڵەخۆ بخاتەژێرعەمەل دەبوو کەلوپەل وئامرازی نەشتەرگەری بکڕێ و بێنیتەوە ماڵێ بەڵام چ دەسمایەکی بەدەستەوە نەبوو،ئەورۆژەی لەنەخۆشخانەی ویسبادێن گەراوە ماڵێ خۆی لەبەرلینێ، لەسی مارکی پتر دراوی لەماڵیدا نەبوو.

ئەوپیاوە کەدەیەویست لەماڵێ داعەمەلی نەشتەرگەری جێبەجێ بکا بێجگەلەئامرازگەلی نوژداری وئامێری وێنەهەڵگرتنەوە پێویستی بە چتگەلی تریش وەک حەواجی خوێن لێدان و خێوەتی ئوکسیژن هەبوو.

ئەو نەبۆخۆی کەلوپەل وپێداویستیەکانی نەشتەرگەری بۆ دەکڕاو نەیارمەتیشی لەکەس دەخواست لە بۆ پێکەوەنانی ئەو ئامرازگەلە چوونکینێ بەرزە فڕی وی ئیزنی پێنەدەدا لەخەڵکی دیکە یارمەتی بخوازێ.

ئەو لەگەڵ ئەوەی پارەوپوڵێکی زۆری لەعەمەلەنەشتەرگەریەکان هاتبۆدەست هەرگیز لەبیری ئەوە دانەبوو کەداهاتووی خۆی لەباری ماڵیەوە دابین بکا،زوربەی زاناکان ،بۆنموونە "ئەنیشتین" زانای مەزنی بیرکاریش هەر وەک زائربرۆخ بوون، ئەنیشتینیش لەگەڵەوەی لەهەموو درێژایی تەمەنی دا وەک مامۆستای زانسگا دەهاتەژمار و خەلاتی "نوبێڵ"ی لە فیزیک دا وەرگرت وکتێبەکانیشی بۆسەرگشت زمانەناسراوەکانی جیهان وەرگێردران، ئەودەمەی لەساڵی ١٩٥٥ی

زاینی لەتەمەنی ٧٦ساڵی داماڵاوایی لەژیان کرد بێجگەلەچەند دەست جلوبەرگ و چەندین بەرگ کتێب هیچی نەبوو،دوامین قسەشی کەچەند ساتێ بەرلەمردنی هێنایە سەر زمان کەس نەیزانی چ بوو چوونکە لەژنێکی پەرستار زیاتر کەسی لەسەرینێ نەبوو ئەو ژنە ئەمریکاییەش زمانی ئاڵمانی نەدەزانی ،ئەنیشتین ئیستێک بەر لەمردنی بەزمانی ئاڵمانی،کەزمانی زگماکی بوو،قسەی کرد.

زائربرۆخ لەدەورانی کار کردنی دا،بێ ئەوەی بۆ پەیدا کردنی ماڵ ودراو هەڵپەی بێ، پارە و پوڵێکی زۆر و زەوەندی هاتەدەست بەڵام هەرچی دەهاتە دەستی بۆی رانەدەگیرا، ئەورۆژەی کەلەنەخۆشخانە گشتیەکان وەدەریان نا ئەوەندەی دەسمایە بەدەستەوە نەبوو کەپێداویستیە سەرەکیەکانی پێ بکڕێ بۆئەوەی بتوانێ لە ماڵەکەی دا نەشتەرگەری بکا.

بەوحاڵەش، زائربرۆخ تەمای گرت بێ هیچ کەل وپەل و ئامراز و هۆگەلێک لەماڵی خۆی دا نەشتەرگەری بکا چوونکە لەزانستی توێگەری (تشریح)دا لەگشت نوژدارانی جیهان باڵا دەس تربوو و هیچ نەشتەرگەرێک نەبووکە لەشی مرۆڤ وەک وی بناسێ.

لەشی مرۆڤ لەباری زانستی پزیشکی و نوژداریەوە بەقەدەر بەربڵاوی"کاکێشان"ێک بەرفراوانە.دەیان ئێسک وماسولکەودەمار ورەگ دەلەش داهەنە کەنوژدارێک دەبێ هەموویان بناسێ وئاگاداری بەسەر ئەرکی هەرکام و هەردەستەیەک لەوان داهەبێ .

تەمەنێک بەس نیە بۆئەوەی مرۆڤ لەزانستی توێگەری (یانی ناسینی گشت چتەکانی لەش )دا بەباشی شارەزابێ وببێتە مامۆستا مەگەر وەکو زائربرۆخ لەبۆ فێربوونێ بەهرەیەکی لەرادەبەدەری ببێ.
زائربرۆخ ئەوەی لەکتێب گەلی توێگەری دا نووسرابوون لەمەیدانی کردەوەدا لەمەحەکی ئەزموون وجەرباندنی دەدا،لەکتێبی ئینسکلۆپیدیای زانستی توێگەری بەزمانی ئالمانی ،کەدوامین چاپەکەی بەرلەشەری دووهەمی جیهانی لە سەت بەرگ دا بلاو کرایەوە،هیچ وشەیەک نەبوو کەزایربرۆخ نەیزانێ وبەکردەوە مانای ئەو وشەیەی لەعەمەلەنەشتەرگەریەکان داهەست پێنەکردبێ.بەم چەشنە،چوونکە ئەو پیاوە متمانەی بەزانایی وتەردەسی خۆی هەبوو تەمای گرت کەوەک نەشتەرگەرانی رۆژگارانی رابردوو،بەبێ ئامرازگەلی نوژداری ئەمرۆیی،لەماڵی خۆی دانەخۆشان عەمەل بکا.
یاریدەرو بەردەستی زائربرۆخ بۆئەنجام دانی عەمەلەکانی نەشتەرگەری لەماڵێ دووکەس بوون؛یەکێ"مارگو" خێزانی کەتازەلەسەفەری دیداری خزم وقەومانی گەڕابۆوە و ئەوی دیکەش جزمەتکارەکەی کە پێشتر گوتمان بەناوی "ئان بیس" ناویان دێنا.
تەختی عەمەلێ هەرئەو تەختە بوو کەهەندێ جار ژنەکان لەچێشتخانە کەڵکیان لێوەردەگرت و هەندێ جار دەیانبردە عەنبارێ.
زائربرۆخ لەرابردوودا چوونکە پتر لە نەخۆشخانە گشتیەکانی کە بە بودجەو پارەی دەوڵەت یان شارەوانی بە رێوە دەچوون کاری

دەکرد،ئەونەخۆشانەی کەعەمەلی دەکردن بابەتی چارەسەری هیچی لێوەرنەدەگرتن.

بەڵام لەسێ دەستەوتاقم هەقی چارەسەری دەستاند:

یەکەم پادشا وسەرۆک کۆمار و پیاوانی تری سیاسی پلەبەرزی دەرەجە یەک.

دووهەم،لەودەوڵەمەندانەی کەدەیانەویست بەدەستی زائربرۆخ لەنەخۆشخانە تایبەتیەکان دابخرێنە بەر نەشتەرگەری.

سێهەم،لەونەخۆشانەی کەلەوڵاتانی دیکەرا دەهاتنە ئاڵمان هەتا زائربرۆخ عەمەلیان بکا.

کەچی لەوهەل ومەرجی دا کەدەیەویست نەخۆشان لەماڵی خۆی داعەمەل بکا ناچاربوو کەدەسمزیان لێ وەرگرێ،چوونکە چ هۆو سەبەبی تری نەبوو بۆ دابین کردنی گوزەران وژیانی .بەڵام نەخۆشی نەدەخستنەبەر گوشار و هەرچی و هەرچەندی دابایان رازی دەبوو.

چەندرۆژ لەدوای وەی کە لەماڵێ زائربرۆخ عەمەلەکانی نەشتەرگەری دەسپێکرد ژنێکی پەرستاری کەپێشتر لەبەردەستی مامۆستادا کاری کردبوو،زیاترلە روی ئەمەگناسییەوە،لەماڵەکەی حازر دەبوو و بۆ بێهۆش کردنی نەخۆشان وهەندێ کاری تری پزیشکی یارمەتی دەدا و شەوانە دەچۆوە ماڵی خۆی.

*دوو خولی نەشتەرگەری لە ماڵێ دا*

خولی نەشتەرگەری زائربرۆخ لەماڵێ بەدوو دەورە دابەش دەکرێ :

لەخولی یەکەم دا زائربرۆخ تەنیا ئەونەخۆشانەی دەخستەبەرعەمەل کە،وەک دەڵێن:دەیتوانی بەسەرپێی ئەوان چارەسەر بکاچوونکە لەماڵێ دا هۆوئەسبابی خەواندن وبەستەری کردنی نەخۆشانی نەبوو. لەوخولە داهیچ روداوێکی تاڵ لەماڵی مامۆستادا نەقەوما،تەواوی ئەوکەسانەی دەخرانە بەر نەشتەرگەری سەلامەتی خۆیان وەدەست دەکەوتەوە وچاک دەبوونەوە، ئەگەر زائربرۆخ بەو شێوازە درێژەی دابا بەکاری خۆی تووشی سەرەنجامی دژوارو وتاڵی شێتی جارەوجار (خەرفان) نەدەبوو.

بەڵام لەخولی دووهەم دا زائربرۆخ کەوتەسەرئەو بریارەی کەهەندێ نەخۆشی دەوا بخاتەبەر عەمەل کە پێویست بوولەپاش نەشتەرگەری بخەوێندرێن .

ئەمرۆ ئێمەدەزانین ئەوشتەی بووەهۆ کە زائربرۆخ بەتەمابێ دەس بکابە عەمەلەکانی نەشتەرگەری گەورە نیازی مایەکی نەبوو، چوونکە دوای ئەوەی لەماڵەکەیدا دەستی بەعەمەلە سەرپێیەکان کرد داهاتێکی پەیدا بوو کەبۆ ژیانی ساکاروبەربەستی وی بەس بێ،دامەزراوەی کیندلێریش پێنج هەزار مارکی بابەتی مافی دانان بەهۆی ناردەیەکی بانکی بۆنارد بەبێ ئەوەی کەتەنانەت زائربرۆخ تاقەدێرێکی لەبیرەوەریەکانی نووسی بێ ، یان بەنووسینی دابێ.

ئەگەربپرسن کەزائربرۆخ چلۆن دەیەویست بەبێ لەدەست دابوونی ئامرازگەلی کار،لەم چاخەدا، لەماڵی خۆی دا دەست بکابە ئەنجام دانی نەشتەرگەری گەورەگەورە،پێتان ئەلێین کەشێوازی کاری وی جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ نوژدارانی سێسەت یان چوارسەت یان

هەزارساڵ لەمەوبەری نەبوو،ئەو بەرلە دەستکردن بە عەمەل تەنانەت دەستەوانەشی نەدەکردەدەست و ئامرازو کەل وپەلی نەشتەرگەری لەماڵێ دا بەباشی دژە میکرۆب نەدەکران. چوونکە ژنەپەرستارەکەی کە رۆژانە دەهاتە ماڵی زائربرۆخ ویارمەتی کارەکانی دەدا، ئەو دەرفەتەی نەبووکەلەدوای عەمەلە نوژداریەکان ئامێری کار میکرۆب سڕی بکا، ئەوکارە "مارگۆ"ی هاوسەری مامۆستا یان خزمەتکارەکەی"ئان ییس"دەیانکرد. ئەوانیش چوونکە لە ئەلف وبێی لەشساغی و دژە میکرۆب کردن هەڕەیان لەبەڕەی نەدەکردەوە وهەرتەقەی سەریان بوو نەیاندەزانی چلۆن کەل وپەلەکانی کارێ پاک و خاوێن وبێ میکرۆب بکەن، هەتابەسەر ئامرازەکانەوە میکرۆبێ نەمێنیتەوە. زائربرۆخیش لەبەر تێکەڵ پێکەڵی خۆی پێی نەدەگوتن کەهەندێک لە میکرۆب و ڤیرووسەکان بەگەرمای ئاوی کوڵیو کەسەت پلەیە،لەنێو ناچن، لەبۆ قڕ کردنی ئەوان دەبێ لە گەرمای پتر کەڵک وەرگیرێ، ئەوگەرمیەش لە ئاوی کوڵیوکەلەمەنجەڵ یان هەر شتێکی دیکەدا دەکوڵێ،نایەتەدەست.

لەنەخۆشخانەکاندا هەندێ شوێنی دەورەگیراو هەنە بەناوی"ئوتووکلاف" کەلەوان دا گەرمای هەڵمی ئاوی کوڵیو وەک مەنجەڵی "لوکوموتیڤ " بەهۆی گوشاری هەڵمێ فرە دەبێ وپلەی گەرما لەیەکسەت دەرەجە پتر هەڵدەکشێ و دەگاتەسەت وپەنجا و دووسەت پلەش، هیچ جورە میکرۆب و ڤایروسێک لەوگەرمایەدا زیندوو نامێننەوەو گشت قڕ دەبن، ئامرازو کەل و پەلی نەشتەرگەری

لەدوای شوشتنەوەو لەنێو بردنی هەرچەشنە پەڵەیەکی خوێن وخڵتەو چتی تر دادەنێنە نێو ئوتووکلاف.

ئەمڕۆکە جورێ لە ئوتووکلاڤی برقی (کارەبایی)کەڵکی لێوەردەگیرێ کەبەهەڵمی ئاوی کوڵیو کارناکەن، ئەو ئوتووکلاڤە وەک سۆپایەکی برقی بەتینی کارەبا گەرم دادێ و پلەی گەرمای لەچوارسەتیش ژووروو تر دەچێ، ئەوکاتەی ئامرازگەلی عەمەلێ لەدوای شوشتنەوە دەخەنە نێو ئەو کورەیە و هەنگی تەوژمی کارەبای دەخەنە سەر لەپاش چەندچرکەو بەڵکو کەمتر،تەواوی کەل و پەلەکانی نوژداری بەکاملی میکرۆبیان لێ دەسرێتەوە.

ڤایروسی نەخۆشی "زەردوویی" لەگەرمای ئاوی کوڵیو دا لەنێو ناچێ،ئەگەر "ئینژکسیۆن"ێک لەنەخۆشێکی زەردوویی گرتوو بدرێ ولەپاشان دەئاوی کوڵیوی باوێن ئەگەر کاتژمێرێکیش بکوڵێ میکرۆبی زەردوویی لەنێو ناچێ، ئەگەرکەسێکی دیکەبەودەرزیە لێی بدرێ رەنگە نەخۆشیەکە بگرێتەوە،ئەو دەرزیەی لەکەسێکی بدرێ زەردووی گرتبێ پێویستە داندرێتە نێو ئوتووکلاف هەتا ڤایرۆسی نەخۆشیەکە بەگەرمای زۆر لەنێو بچێ.یان لە"سورەنگ"ی هەرزان بایی ،کەلەهەموو دەرمانخانەکان دا وەگیر دەکەوێ ولەجارێکیش پتربەکار نایە، کەڵک وەربگیرێ.

یەکەم نەخۆشی کەلەماڵی زائیبرۆخ دا کەوتە بەر عەمەلکردنی گەورە،ژنێکی قەڵەوبوو کەلەهەرتک بەلەکی دا"واریس"ی هەبوو.هەموولایەک دەزانین کەواریس نەخۆشیەکەلەلێک ئاوالابوونەوەی شادەماری رەشی لەش بەتایبەت لە"بەلەک"ی قاچ

داپەیدادەبێ.ئەگەر ئەستووربوونی شادەمار کاتی بێ ژانێک دە بەلەک دەوەستێ کە لەچەند چرکەپتر ناخایەنێ،هەندێ کەس ئەوژانەی دەگەڵ ژان ودەردی ماسولکەی پا لێدەگۆرێ، بە هەر حاڵ، ژان لەپاش چەند چرکەیەک هێدی دەبێ.

بەڵان ئەگەر لێک ئاوەڵابوونەوەکەی شادەمار لەقاچ دا هەمیشەیی بێ،ژانەکە هێدی نابێ وبەدەرمانیش چارەی دەماری فشۆڵ بوو ناکرێ، هەتازەمانی زائربرۆخ هیچ دەرمانێک بۆ واریس هەرنەبوو. واریسیان بەگوتەی پزیشکان ونوژداران"کوتێ ریزە"یان دەکرد، یانی دەیانسووتاند.

لەنەخۆشخانان دا ئامێرێک هەیە پێی دەڵێن "کوتێ ریزاتور" یانی"سووتێنەر"،ئەم ناوە پزیشکیە لەریشەی وشەیەکی یونانی "کوتێ ریۆن"،بەواتای "سووتیاگ" وەرگیراوە.

بەهۆی ئامێری سووتێنەر،لەبەلەکی پا دا واریس دەسووتێنن ولەنێوی دەبەن،ئامێری سووتێنەربەگشتی دوو جورە: یەکێ ئامێرێکە کە بەهۆی مادەکیمیاییەکان رایەڵەکانی لەش دەسووتێنێ، ئەوەی تر ئامێرێکە کەبەهۆی گەرمایی ئەورایەڵانەی کەدەبێ لەنێو بچن لەنێویان دەبا.

ئەگەر بیانەوێ تەنراوەکانی سەرروی لەش بەسووتاندن لەنێو بەرن لەو سووتێنەرە کەڵک وەردەگرن کە بە مادەکیمیاییەکان دەسووتێنێ.

بەڵام ئەگەر بیانەوێ ئەورایەڵانە بسووتێنن کە لەقوڵ دان ودەبێ بەشێکی پتروقوڵتر بسووتێ لەو سووتێنەرە کەڵک وەردەگرن کە

بەگەرمایی دەسووتێنێ،لەهەردوو حاڵ دا بۆنەوكارە،لە سڕكردن بەهرە وەردەگرن.

زائربرۆخ لەماڵی خۆی دا ئامێری كوتێ ریزاتور(سووتێنەر)ی نەبوو هەتا قاچەكانی ژنەئاڵمانیەكەی كە هاتبوە لای پێ بسووتێنێ،تەمای گرت بەكوتە ئاسنێكی كەدە ئاگر نریا و سووركرایەوە ئەو عەمەلە نەشتەرگەریە جێ بەجێ بكا.

لەوێ رۆژی دا،شێوەی عەمەل و ئامرازی زائربرۆخ فەرقێكی هەرەچكۆڵەی دەگەڵ شێوەوئامرازی نوژدارێك نەبوو كەهەزارساڵ پێشتر دەیەویست"كوان"ێك بەبێ سڕكردن،بەئاسنی سووربۆوەدەرێنێ.

زائربرۆخیش بەبێ سڕكردن وبەئاسنی سوورەوەكراو دەستی بۆ سووتاندنی واریسەكانی قاچی ژنەكە برد. ئاشكرایە كە ژنێكی بە ئاسنی سووركراوە وبەبێ سڕكردن بسووتێنن تووشی ژانی دەزۆر پڕئێش ومەترسی دەبێ، ئەوێ رۆژێ ئەو ژنە وای دەقیژاند كەهەر دەتگوت هەنجن هەنجنی دەكەن.

لەكۆن دا ژانی پەیدابوو لەعەمەلی نەشتەرگەری ئەوەندە سەخت ودان بەجەرگی خۆهەڵنەگر بوو كەنوژدار بەر لەعەمەل كردن بەیارمەتی بەردەستەكانی خۆی دەست وپێی نەخۆشیان دەدەبەست هەتا ڕانەكا و بە دەستەكانی پێش لە درێژەدانی عەمەلەكە نەگرێ.

بەهەرحاڵ،زائربرۆخ دوای ئەوەی لەكاری نەشتەرگەری لەخۆبۆوە و برینەكانی پێچا بەخێزانەكەی گوت ئەم ژنە ناتوانێ بچێتەوە ماڵی خۆی ودەبێ هەرلێرەبێ هەتا برینی قاچەكانی سارێژ دەبێ،ئەگەر

بەم حاڵەی کەئیستا هەیەتی بچێتەوە ماڵێ هەردوو لاقی تووشی "قانقاریا" (ئێسکە رەشە) دەبن.

"مارگۆ" هاوسەری زائربرۆخ پرسی دەبێ چ بکەم ؟.

مامۆستا گوتی:ئەم ژنەی لەسەر قەرەوێڵەی خەوی خۆت بخەوێنە.

هەنگی ژنی زائربرۆخ بەیارمەتی خزمەتکارەکەی،ئان بیس، ژنەکەیان بردەسەر قەرەوێڵەکە.

بەڵام دانانی نەخۆشێک لەسەرقەرەوێڵە بۆ پەرستاری لێکردنی بەس نیە،گەرەکە خۆراکی بدەیتێ وکەلوپەلی پاک وخاوینی لەبۆ ئامادەبکەیت و شەوانە چاوەدێری بارودوخی بی.

ژنەپەرستارەکە،هەروەک پێشتر گوتمان،شەوانە دەچۆوە ماڵێ و"ئان بیس"یش ژۆژانە لەکاروباری ماڵێ هەند ماندوو وشەکەت دەبوو کەنەیدەتوانی بۆئاگالێبوونی نەخۆشەکە بەدرێژایی شەوێ بەخەبەر بێ، پەرستاری لە نەخۆشەکە کەوتە ئەستۆی ژنی زائربرۆخ ،کەچی ژنەنەخۆشەکە هێندەی سکاڵا هەبوو ونارەحەتی دەربڕی کە زائربرۆخ ناچار بوو رۆژی سێیەم بینێریتەوە ماڵی خۆی.

هەرئەو رۆژەی کەنەخۆشەکە نێردراوە ماڵێ،بیرن درۆڤ لەلایەن دامەزراوەی چاپەمەنیەوە هات هەتا تونند نووسی بیرەوەریەکانی مامۆستا ئەنجام بدا.

مامۆستا بە دلۆڤانیەوە پێشوازی لێکرد،بیرن درۆڤ گوتی جەنابت ئەگەرچی نەشتەرگەرێکی بلیمەتی بەڵان بیرەوەریەکانی خۆتان بۆئەوکەسانە دەنووسی کەنوژدار نینەوکەسانی ئاسایین وچاوەنۆڕن

لەبیرەوەریەکانی تۆدا چتگەلی وا بخوێننەوەکەلەبۆیان سەرنج ڕاکێش بێ.

زائربرۆخ پرسی ئایا ئێوە پێتان وایەکە من نابێ بیرەوەریەکانم سەبارەت بەکارەنەشتەرگەریەکان بگێرمەوە؟.

بێرن درۆڤ گوتی ناوئاخنی سەرەکی بیرەوەریەکانی ئێوە کارە نەشتەرگەریەکانە کەچی هەرلەودەمەی دا کە ئەم بیرەوەریانە هەڵگری مەبەستگەلی پێوەندی دار بەنەشتەرگەرین دەبێ لەبۆ خوێنەرانی ئاساییش ڕاکێشەر بن.

زائربرۆخ پرسی ئاخۆ لەگەڵم هاورای کەمن بیرەوەریەکانم لەدەورانی منالیەوە دەس پێ بکەم؟.

بێرن درۆڤ گوتی ئەگەر بیرەوەریەکانت لەسەردەمی منالیەوە دەس پێ بکەی لەروانگەی خوێنەرانەوە زۆر سەرنج ڕاکێش دەبێ.

زائربرۆخ کەپیاوێکی ڕاستگۆ بوو بەبێ خۆبادان دەستی بەبیرەوەریەکانی سەردەمی منالی کردو گوتی:کە باوکی پیاوێکی هەژار بوو بەپینەدۆزی پێلاوی خەڵکی گوزەرانی خێزانەکەی دابین دەکرد و لەدوای ئەوەی کە مالاوایی لەژیان کرد دایکی هەربەو کاروئیشە دابین کردنی ژیان وگوزەرانی بنەماڵەی گرتە ئەستۆ ورەنگە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا تاقانەژنێک بوو بێ کە پینەجیەتی دەکردوبەدروونەوەی پێلاوان زاروڵەی دەخۆی فراژوو دەکردن.

بێرن درۆڤ هەڵکراندنی بیرەوەریەکانی مامۆستای فرە بەلاوە پەسند بوو و گوتی زوربەی خەڵکی حەز دەکەن لەبیرەوەریەکانی پیاگ وژنەمەزنەکان دا وەخوێنن کەئەوان لەسەردەمی منالی وتافی لاوەتی

دا هەژار بوونەوبەكوێرەوەرى ژياون و بەهەوڵ وهيمەتى خۆ، خۆيان لەبەلەنگازى رزگار كردووە.

چوونكينىٚ زۆرينەى خەڵكى لەسەردەمى منالّى ودەسپێكى تافى لاوەتى دا،نەدارن وئەوكاتەى لە بيرەوەرى يەكىٚ لەپياوان وژنانى گەورەدا دەخوێننەوەكەئەوان لەسەردەمى منالّى وگەنجى دا بەدەسبەتالّى دەژيان وەك ئەوەيە كە بيرەوەريەكانى منداڵى وسەردەمى لاوەتى خۆيان زيندوو دەكەنەوە. يەكى تر ئەوەيە كەئەوكاتەى خەڵك لەسەربردەى پياو وژنانى مەزن دا دەخوێننەوە كەئەوان لەبنەماڵەيەكى نەداردا هاتوونەتە دنيا وعەسڵ ونەسەبێكى ناودارين نەبووە،لەوەى كەخودى خۆيان لەبنەماڵەيەكى ناودارى رەسەنزادە نەبوونە شەرمەزار نابن و رەنگبىٚ لەناخى خۆدا شانازيش دەكەن كەوەك تاقمێك لەمەزنانى جيهان بىٚ ئەسڵ ونەسەبێكى ناو بەدەرەوەن ولەخێزانێكى هەژاردا چاويان بەدنيا هەڵێناوە.

لەوىٚ رۆژىٚ دا زائربرۆخ ئەوەندەى سەبارەت بەسەردەمى منداڵى خۆى باس كردكە دوو پاژى لەكتێبى بيرەوەريەكانى وى پڕ دەكردەوە، بێرن درۆڤ گوتى ئەگەر ئێوە هەربەم شێوەيەبيرەوەريەكانى خۆتان باس بكەن كتێبى بيرەوەريەكانى جەنابت بەرلەو كاتەى پێشبينيمان كردووە لەبۆ چاپ ئامادە دەبن.

چوونكە كارى لاوى توندنووس تەواو ببوو ويستى بڕوا،بەلاّن زائربرۆخ ئاماژەى بەچەند كتێبى ئەستوور كردكە لەسەرمێزەكە داندرابوون وگوتى ئەم كتێبانە ببە وبيانخوێنەوە.

بێرن درۆڤ گوتی من دەرفەتی خوێندنەوەی کتێبم نیە چوونکە ئەوەی ئێستا توندنووسیم کردووە دەبێ لە شەودا پاکنووسی بکەم و سبەینێ سەرلەنوێ دێمەوە و توندنووسی دەکەمەوە وسبەی شەویش دیسان هەمەن هەمەن، دەبێ بەرنامەی پاکنووسی جێبەجێ بکرێ.

زائربرۆخ یەکێ لەکتێبەکانی هەڵگرت و لەبەردەمی لاوەکەی دانا وگوتی بەوحاڵەش تۆ دەبێ ئەم کتێبەی کە لەبارەی نەشتەرگەری دایە وەخوێنی، ئاخر تۆ ژیاننامەی من ،کەنەشتەرگەرێکم، دەنووسیەوە، دەبێ لانی کەم لەچتە سەرەکیەکانی نەشتەرگەری ئاگاداریت هەبێ.

بێرن درۆڤ بەهۆی پێداگری زائربرۆخەوە ناچاربوو کتێبەکە لەگەڵ خۆی بەرێ وبەرلەوەی لەدەرگا وەدەر کەوێ زائربرۆخ گوتی بۆئەوەی متمانەم پەیدابێ کەتۆ کتێبەکەت خوێندۆتەوە هەندێ لەبەشەکانی کتێبەکەت لێ دەپرسمەوە.

کابرای رۆژنامەنووس رۆیی هەتا سبەینێ بێتەوە،کەچی رۆژی دوایی کەهاتەوە ماڵی زائربرۆخ پێیان گوت کە مامۆستا لەژووری عەمەلێیە.

بێرن درۆڤ چووە هۆدەی چاوەنۆری ئەو ماڵەو دیتی کەچەند نەخۆش لەهۆدەی چاوەنۆڕی دا دانیشتوون و چەمەڕان هەتا لەلایەن زائربرۆخەوە بخرێنە بەر عەمەلی نەشتەرگەری.

لەوێ رۆژێدازائربرۆخ دەستی پیاوێکی کەلەگەڵ ژنەکەی هاتبووعەمەل کردو ناردیەوە ماڵێ.ئەوجار عەمەلێکی ئاپاندیست (ریخۆڵە کوێرە) ی ئەنجام دا و چوونکەنەیدەتوانی نەخۆشی عەمەل کراو بنێریتەوەماڵێ بە"مارگۆ"ی هاو سەری گوت بیخەوێنێ.

بێرندرۆڤ کاتژمێرێک لەهۆدەی چاوەنۆڕی دا مایەوە هەتا زائربرۆخ دەسی بەتاڵ بێ و بیرەوەریەکانی خۆی دیکتە بکا. بەلان فرەیی ئەونەخۆشانەی کەلەهۆدەی چاوەنۆڕی دا چاوەڕێی نۆرەی خۆبوون دەپیاوە گەنجەکەی گەیاندکەلەوێ رۆژێ دا زائربرۆخ بۆی ناکرێ بیرەوەریەکانی باس وبەیان بکا،بە"ئان بیس"ی خزمەتکاری گوت لە لایەن منەوە بەمامۆستا بڵێ ئەز سبەینێ بۆ درێژەی کاری خۆم دێمەوە.

زائربرۆخ ،ئەوێ رۆژێ هەتا کاتژمێر چواری ئێواری درێژەی بەکاری دا ولەپاشان خەریکی حەسانەوە بوو.

شەوێ تەلیفونی ماڵی زائربرۆخ زەنگی لێدا،ژنەکەی تەلەفونەکەی هەڵگرت،دەنگی ژنێکی گوێ لێبوو،ژنەکە گوتی من ئەوکەسەم کەئەمڕۆ لەگەڵ مێردەکەم هاتین بۆ ماڵی ئێوە، پروفیسۆر زائربرۆخ دەستی شووەکەمی عەمەل کرد،بەلان ئێستا مێردەکەم تووشی تایەکی توند بووە بەپروفیسۆر بڵێ بێ ونەخۆش ببینێ.

مارگۆ ولامی داوە کە پروفیسۆر خەوتووە بەڵام هەڵیدەستێنم و پەیامی تۆی پێ رادەگەیەنم.

مارگۆ شووەکەی لەخەو هەستاند وپەیامی ژنەی پێراگەیاند،زائربرۆخ گوتی لەم وەختەی شەوێ دا هیچ نوژدارێک ناچێتە ماڵی نەخۆش.

هاوسەرەکەی هەڵیدایە؛بەڵام ئەم نەخۆشە کەسێکە کەتۆ ئەمڕۆ دەستت عەمەل کردووە.

زائربرۆخ بە توڕەیی؛ هەرچی پێت دەڵێم وەریگرە،بەوژنە بڵێ بابچنە لای دوکتۆری خێزانی خۆیان.

مارگۆ چاری ناچار وڵامی مێردەكەی بەوژنە گوت و"گوشی" تەلەفونەكەی داناوە سەرجێی خۆی.

بەیانی رۆژی دوایی،لەدوائەوەی كەمارگۆ لەخەو هەستا وسەرێكی نەخۆشی ئەپاندیستی (ئەونەخۆشەی ریخۆڵەكوێرەی عەمەل كرابوو)دا دیتی كەتووشی نۆبەتێیەكی زۆر سەخت وتوند بووە.

زائربرۆخ لەخەو هەستا و خەریكی تاشینی ریش بوو.

مارگۆ پێی گوت: فیردیناند، ئەونەخۆشەی دوێنێ ریخۆڵەكوێرەت عەمەل كردووە تووشی نۆبەتێیەكی دژوار بووە،برۆ سەرێكی لێبدە.

زائربرۆخ گوتی: هەموو نەخۆشەكان تایان لێدی و دوایەش چاك دەبنەوە.

زائربرۆخ لەپاش تاشینی ریش،وەك هەموو رۆژێ،چووەحەمام ودوایە بەرچایی خوارد،لەدوای بەرچایی خواردن دیسان مارگۆ پێی گوت نۆبەتێ وتای ئەو نەخۆشەبەچەق وچۆیە برۆ سەرێكی لێبدە،من ئەگەرچی پزیشك نیم بەلاّم دەزانم كەنەخۆشێك لەپاش عەمەل كردنی "ئاپاندیسیت" نابێ بەم چەشنە تا دایگرێ.

كەچی دیسانیش زائربرۆخ گوێی نەدا گوتەی مارگۆ، چەند چركەیەك پێچوو بێرن دروۆڤ وەژوور كەوت و لەدوای سلاّو بەمامۆستای گوت هیوادارم ئەمرۆش وەك پێرێ بتوانین بەباشی كار بكەین.

زائربرۆخ پرسی: چ كارێكی بكەین ؟.

بێرن دروۆڤ كەلەو وڵامە چاوەنوارِ نەكراوە سەری سورِمابوو گوتی: مەگەر بریار نەبوو ئێوە بیرەوەریەكانی خۆتان بفەرموون و من توندنووسی بكەم ؟!

زائربرۆخ پرسیاری لێکرد:کەی ئێمە قەراروبڕیەکی وامان داناوە ؟.

بێرن درۆڤ زەق زەق دەچاوەکانی مامۆستا ڕاما وچاوەڕێی دەکرد کەلەچاوەکانی داشوێن پێیەک لەتێکچوون وشڵەژاوی هەستگەل بەدی بکا.بەڵام چاوەکانی زائربرۆخ لەپشت چاویلکەکانی ڕا ڕون و بەگرشە دەهاتنەبەر چاو.

مارگۆ کەلەوەی دەترسا هەتاچەند چرکەساتی تر لەنێوان مێردەکەی وئەولاوەی دا دەمەقاڵێەکی توند پەیدا دەبێ چاوی لە بێرن درۆڤ هەڵتەکاند کە لە هۆدەکە بچێتە دەرێ، لەوێ پێی گوت ئەمڕۆ وەزعی پرۆفیسۆر باش نیە وجەنابت بۆکارکردن پێ دامەگرە، ئەمڕۆ بڕۆ سبەینێ وەرەوە.

بێرن درۆڤ ڕۆیی،مارگۆ دەوروبەری نیوەڕۆ جارێکی دیکەش ڕادەی تای نەخۆشەکەی پێوانەکرد،هەراسان وترساو تێگەیی کەرادەی تای گەیوەتە چلی.

گوتمان کەمارگۆ پزیشک نەبوو بەڵام بەبۆنەی ئەوەی کە هاوسەری نوژدارێک بوو و هەندێ شتی لێ گوێ لێببوو وجارجارەش چاوێکی بە گۆڤارەکانی پزیشکی دا دەخشاند، تێدەگەیشت کەلەپاش عەمەلی ریخۆڵە کوێرە نەخۆش نابێ تۆبەتێی بێتێ و ئەگەر تای لێهات ئەم شیمانەیە هەیە کە تووشی نەخۆشی "پری تونیت" بووبێ.

ناوی ئەم نەخۆشیە لەوشەی"پریتووان"وەرگیراوە وئەم وشەیەلەریشەی وشەیەکی یونانی ڕا بۆتە بەشێکی زاراوەی پزیشکی، کەبنەما یونانیەکەی"پری تونایۆن"ە،یانی ئەوشتەی کەگشت دادەپۆشێ.

"پری توان"وەک رایەخێکە کەگشت دیوارەی زگی داپۆشیوە و هەمیشە پاک وخاوێنە،یانی پارێزراوە لەهەموو جورە میکرۆبێک، هەرلەبۆیە بۆشایی نێو هەناویش بەگشتی بێ میکرۆبە.(بۆشایی هەناونابێ دەگەڵ بۆشایی نێو ژوورەوەی گەدەو ریخۆڵەکان وئەوشتانەی تری کەلەنێو زگ دان لێک بگۆردرێ).

لەنێو ریخۆڵەکان دا هەمیشە میکرۆبی هەمەجور هەیە بەڵام لەبۆشایی زگ دا،یانی ئەو تۆربەیەی کە گەدەو ریخۆڵەو چتگەلی تری تێدا،بێ میکرۆبە و پاک وخاوێنە.

ئەگەرلەکاتێکی دا کەعەمەلی ریخۆڵەکوێرە دەکەن ئەوریخۆڵە زیادیە بتۆقێ وشتەکەی نێوی برژێتە سەر"پری توان"،یان لەکاتی عەمەلکردنی ریخۆڵەکوێرە،یان هەرعەمەلێکی تر،بەهۆی وردنەبوونەوە وسەرنج نەدان،پری توان بەمیکرۆبان پیس وئالوودە بێ رەنگە نەخۆشی "پری تونیت"سەرهەڵدا کەنەخۆشیەکی پرمەترسیە ولەزەمانی کەون دا کەئەودەمی دەرمانەکانی"ئانتی بیوتیک" هەرنەبوون،زیاتر دەبووەهۆی لەنێو چوونی نەخۆشەکە.

تەنانەت ئەمرۆ کەدەرمانی "ئانتی بیوتیک"یش لەبەردەست دایە ونەخۆشیەکانی میکرۆبی چارەسەردەکەن، پزیشکان لەنەخۆشی پری تونیت هەردەترسێن.

مارگۆ نەیدەزانی لەبەرچی مامۆستا نایەوێ ئەونەخۆشە ببینێ وئاگادارنەبوو کەمێردەکەی بەهۆی سفت بوونی خانەکانی مێشک لەبەشی یادەوەری و هۆشەکی دا،تووشی شێتی جارەکی (خەرفان) بووە.

ئەوێ رۆژێ ئەوکچەپەرستارەی دەهاتە ماڵی مامۆستا ویارمەتی دەدا،نەختێک درەنگ هات،مارگۆ بەوی گوت کەبارودۆخی ئەو نەخۆشەی دوێنی عەمەل کراوە باش نیەو تای تا چل پلە هەوراز چووە.

کیژە پەرستارەکە لەدوای ئەوەی نەخۆشەکەی دیت و گەرماوتینی لەشی پێوانەکرد،زانی دۆخەکەدژوارە.

مارگۆ هەڵیدایە من هەرچەندی بەپروفیسۆر دەڵێم ئەو پیاوەی چاولێبکا گوێم ناداتێ ،ئەتۆ بچو وپێی بلێ بەڵکو قسەی تۆ کاری لێ بکا.

ئەو دەمەی کچەپەرستارەکە چووەلای زائربرۆخ وپێی گوت کەحاڵی نەخۆشەکە گەلێک خراپە دەگەڵەوەی کە زائربرۆخ ئەوێ رۆژێ لەژێر کارتێکردنی تێکچوونە جارەکیەکەش دابوو بەدیتنی روپۆشی سپی کچەپەرستارەکە لەجێی خۆ هەستاو لەگەڵی چووەسەرینی نەخۆشەکە و پشکنینی پزیشکی بۆ کرد.

خووی تەمەنێک کارەکانی پزیشکی بەچەشنێک لەزائربرۆخ دا بەهێز بوو کەلەسەرینی نەخۆش چی بەکچە پەرستارەکە نەگوت سەبارەت بە وەزع وحاڵی،بەلام لەدوای وەدەرکەوتن لەهۆدەکەوپێوەدرانی دەرگاکەبەکیژە پەرستارەکەی گوت ئەم نەخۆشە بێشک تووشی نەخۆشی "پری تونیت"بووە.

کچەپەرستارەکە گوتی کەوایە زووتر دەبێ بۆچارەسەرکردنی دەسبەکار بین.

زائربرۆخ گوتی بەزوویی کارێکی بۆدەکەم،لووی"هیپۆتالامووس"ی دەخەمەبەر نەشتەرگەری.

کچەپەرستارەکە لەگەڵەوەی خووی گرتبوو کەهەرگیزعەیب لەکاری مامۆستایانی نوژداری وپزیشکی نەگرێ بەسەرسوڕماویەوە پرسی: فەرمووتان دەتانەوێ لووی"هیپۆتالامووس"ی نەخۆش بخەیتە بەرعەمەڵ؟!!.

زائربرۆخ گوتی :بەڵێ.

هیپۆتالامووس،بەشێکی مێشکی مرۆڤەکەلەژێرووی مێشک دا هەڵکەوتووە و لووی هیپۆتامووس لەوبەشە دایە،گەلێک لەسەرکرداری رەگەکانی "سەنپاتیک"یانی رەگەهەستیارەکانی لەش،شوێن دانەرە.

دەزانین لەلەشی ئێمەدا دووجورە رەگ هەنە؛یەکێ رەگەکانی بزوێنەر وئەویتر رەگەکانی هەستەوەر.

رەگەبزوێنەکان ئەندامەجوراوجورەکانی لەشی ئێمە،هەرلەپێڵووی چاوڕا بگرەهەتا جووڵەی دەست وقاچ ، دەبزوێنن، رەگەهەستەوەرەکان جیاوازی ساردی وگەرمی،نەرمی وزبری و...دەئێمە دەگەیەنن، هەرژانێک لەهەر شوێنێکی لەش داسەرهەڵدا ئێمە ئەوژانە بەهۆی رەگەهەستەوەرەکان هەست پێدەکەین وهەر دەرمانێکی تەسکین دەرکەدەرخواردی نەخۆش دەدرێ ،هۆی ئۆقرەیی وی لەلەش دا لەوەیەوە پەیدا دەبێ کەلووی "هیپۆ تالامووس"کەتەکوزی رەگەهەستەوەرەکانی بەدەستەوەیەفەرمان دەداکە"ژان"ئوخژنی بێتێ وراوەستێ.

*عەمەل كردنی لووی "هێپۆتالاموس" لەماڵێ دا*

كیژەپەرستارەكە هەتا ئەوێ ڕۆژێ نەیبیست بوو ولەهیچ كتێب و گۆڤارێكی پزیشكی دانەیخوێندبۆوە كە عەمەلكردنی لووی "هیپۆتالاموس"دەبێتە هۆی چاك بوونەوەی نەخۆشی"پری تونیت".

شتێكی دیكەش ئەوەبووكە؛ئەوكاتەی زائربرۆخ گوتیلووی هیپۆتالاموسی نەخۆش دەخەمەبەر نەشتەر گەری كچەپەرستارەكە بێشك پێی وابوو كەمامۆستا نەخۆشەكە رادەگوێزێتە نەخۆشخانە.چوونكە عەمەلی لووی"هیپۆتالاموس پێویستی بە هەڵەشكاوتنی كازەلاكی سەرهەیەو ئەوعەمەلیاتە لەماڵێ ناكرێ.لەبەروەی كەهەڵەشكاوتنی كاسەسەرئامرازگەلی وای گەرەكە كەتەنیالەنەخۆشخانان داوەگیردەكەون،بەلام پەرستار خووی گرتبوو كەلەبەرانبەر كارەكانی نەشتەرگەرێك،بەتایبەت نوژدارێكی مەزنی وەك زائربرۆخ دابێدەنگ بێ و سەرپێچی نەكا.

زائربرۆخ فەرمانی دابە كچەپەرستارەكە ؛هەتا بەیارمەتی ژنەكەی و"ئان بیس"،نەخۆش بەرنەسەر تەختی عەمەلێ.

كچەی پەرستار دەگەڵ ئەو هەموو رێزەی بۆ مامۆستای دادەنا،بێدەنگی شكاند و گوتی: ئەی گیهیمرات،ئاخر ئێمە لێرە ئامرازو كەل وپەلی نەشتەرگەری مێشك مان نیە.

زائربرۆخ گوتی ئامرازگەلی نوژداری مێشك وهەرجورە نەشتەرگەریەكی تر،لەهەرجێگایەكی نوژدارێكی كارامە ولیهاتوو هەبێ،هەنە.شتی سەرەكی بوونی نەشتەرگەرەو چتگەلی تر لاوەكی.

کچۆڵەی پەرستار ناچاربەیارمەتی هاوسەری مامۆستاو ئان پیس کابرای نەخۆشی بردەسەرتەختی عەمەلیٚ کابرای بەستزمان ئەگەرچی لەئاگری نۆبەتیٚ دا دەسووتا کەچی بیروهۆشی ئاسایی بوو،دەیەویست بزانیٚ لە بەرچی جێگایان گۆریوە.

زائربرۆخ گوتی: دەمامکی بێهۆشی باوێنەسەردەم وچاوان وبێهۆشی بکەن.

کابرای نەخۆش کەمەبەستی بێهۆشی تێگەیی گوتی لەبەرچی دەتانەویٚ بێهۆشم بکەن ؟.

کچەپەرستارەکە نەیهێشت نەخۆشەکە ببینیٚ ئامـاژەی بە مووە زۆرەکانی کابراکرد ومامۆستای وریا کردەوە کەبەو قژەزۆرانەوە ناکریٚ سەری ئەو پیاوە بدەنەبەر عەمەلی نەشتەرگەری.

مامۆستا گوتی: تیخێکی بێنن وموەکانی سەری بتاشن.

کابرای نەخۆش بەترس وهەراسانیەوە پرسی: لەبۆچی دەتانەویٚ مووەکانی سەرم بتاشن؟.

مارگۆی هاوسەری زائربرۆخ گوتی: لەبۆ ئەوهەی کە سەرت هەوای وێبکەویٚ وتایەکەت لەبەین بچیٚ.

کابرای چارەرەش بەلالآنەوە گوتی: تکادەکەم لەتاشینی مووەکانی سەرم چاوپۆشی بکەن چوونکە ئەمن زۆرم دڵ بەمووەکانمەوەیە.

بەڵام پارانەوەولالآنەوەی کابرای نەخۆش تەئسیری لەزائربرۆخ نەکردو مووەکانی سەری،لەوجێگایەی ڕاکە دەیەویست کاژەڵاکی هەڵەشکێویٚ،تاشی وبەکچەپەرستارەکەی گوت کەدەمامکی لەسەردەم وچاوان دابنیٚ و بێهۆشی بکا.

ئەودەمەی زائیربرۆخ دەیەویست سەری نەخۆشەکە بتاشی وکابرا نەیدەویست مووەکانی لەدەس بچێ، "مولێر"ی شانۆنووسی ناوداری فەرانسەیی لەکوێبوو،جێگەی سەوز،کەئەو دیمەنەو ئەو دەمەتەقەیەبەشێوازی خۆی ( ئەگەر کارەساتێکی لێ نەکەوتبا یەوە) لەشکڵی شانۆیەک دا هێنابا سەر قاقەز.

لەزەمانی زائیربرۆخ دا پزیشکان نەیاندەزانی کەلەنێوان لووی"هیپۆتالامووس" وئێش وژانی نەخۆشیەکان، بە تایبەتی نۆبەتێ،دا پێوەندیەک هەبێ،بەڵام ئەمرۆ زانستی پزیشکی دەڵێ لەنێوان ئەو لووە وهەندێ لەنەخۆشیەکان بەتایبەت نۆبەتێ دا پێوەندیەک هەیە. چوونکە لووی "هیپۆتالامووس "لەپایەی مێشک دا، لە ناوەندەکانی رێک وپێک کردنی رەگە"سەمپاتیک"،یانی رەگەهەستەوەرەکانە، جاچوونکینێ لووی هیپۆتالامووس رەگەهەستەوەرەکان رێک وتەکوز دەکا بێ شک لەو هەستانەی کەلەنەخۆشیەکاندا بۆمەپەیدا دەبن،شوێن دانەرە.

شتێکی تر ئەوەیە کە لووی"هیپۆتالامووس" ناوەندی میزان کردنی "ترمیک"ی لەشە،یانی میزان کردنی گەرمای لەشی بەستۆوەیە ولەئاکام دا ،بەچەشنێکی بێ بەرپەرچ دانەوە لەبارودۆخی گەرمای لەشی ئێمە دا شوێن دانەرە، هەربۆیەشە دەرمانی بەناو و دەنگی" ئاسپیرین" نۆبەتێ دەبرێ یان دەبێتە هۆی دابەزینی پلەی گەرمای نۆبەتێ چوونکە لەسەر لووی هیپۆتالامووس تەئسیر دەکا،

ئەگەر ئێوە لەکاتی سپی کردنی سێوێک دا قامکی خۆ بەچەقو ببرن وهەنگی هەست بەژان وئازار بکەن لە پاش خواردنی حەبێکی

ئاسپیرین ژانی قامکەکەتان دەشکێ، ژان شکانی قامکی ئێوە لە فرمانی لووی"هیپۆ تالامووس"ەوە هەڵدەستێ چوونکە میزان کردنی رەگەهەستەوەرەکانی بەستۆ وەیە.

ئاخۆ ئەگەر زائربرۆخ گوتی لەبۆ لەنێو بردنی نۆبەتێی ئەو نەخۆشە گەرەکە لووی هیپۆتالامووسی بدەینە بەر نەشتەرگەری ،لەو کاتی دا، دەیزانی لەنێوان نۆبەتێ ولووی هیپۆتالامووس دا پێوەندیەک هەیە؟، چوونکی ئەم راستیەی ئەرکەکانی کۆئەندام بە شێوەی زانستی،تائەم دوایانە پزیشکان ونوژداران نەیاندەزانی،سا ئەگەرئەم راستیەی زانی بێ دەبێ بێژین ئەم زانستەش لەدیاردەکانی دەگمەنی و بلیمەتی زانستی و هونەری ئەوپیاوە مەزنەبووە.

هەرچۆنءکی بێ ،لەپاشەوەی نەخۆش بێهۆش کرا،زائربرۆخ بەنووکی کێردی خۆی لەسەرپێستی کەللەسەری نەخۆش جغزێکی کێشا وەنگی ئەوعەمەلەی کەلەزاراوەی پزیشکی دا پێی دەڵێن"ترێ پاناسیۆن"،یانی هەڵە شکاوتنی کاسەسەر بۆعەمەل کردنێ لەسەرمێشک، دەسپێکرد.

زائربرۆخ بەدرێژایی ئەوجغزەی هێڵکرابوو ئێسکی سەری بەمشار بریەوە وئەوجارزوقانی خڕپراوەی کەلایی بە کازەلاکەوە مابوو،هەروەکی لەدەسپێکی ئەم توێژینەوەدا باسمان کرد،قەدی کردەوە و داینووشتاندەوە.

مارگۆی هاوسەری زائربرۆخ وکچەپەرستارەکە بەبێوەی متەقیان لێوەبێ عەمەل کردنی مامۆستایان تەماشا دەکرد،مارگۆ نەختێک

دەلـەرزی چوونکـە تائـەوێ رۆژێ نـەیـدیبوو مێـردەکـەی هێـسکی کاژەڵاکی سەر هەڵگرێ و دە مێشک دا عەمەلێ بکا.

زائربـرۆخ بـەچـەشـنێ لـەکـاری خـۆی دا مامۆسـتا بـوو کـەلـەدوای هەڵەشکاوتنی کاسەسەر،بەیەک جووڵەی کێرد لووی هیپۆتالامووسـی دۆزیەوەو بەجووڵەی دووهەم لووەکەی دەرێنا ودە زبڵدانی هاویشت.

لەدوای وەی کەلووی هیپۆتالامووس دەرهات مامۆسـتا ئیتـر کارێکی بەمێشکی نەخۆشەکە نەماجگەلەوەی زامەکەی بپێچێتەوە،بەڵام دیتی کە کچە پەرستارەکە سەری زۆر شۆرکردۆتەوەسەر نەخۆشەکە.

زائربرۆخ کەدەیزانی نەخۆش بێهۆشەو دەنگـی نابیـسێ،بەبـێ ئـەوەی دەنگی نزم کاتـەوە گـوتی: چ قـەومـاوە و بـۆ بـەم چـەشـنە بـەسـەر نەخۆش دا سەرت بەرداوەتەوە.

کچەپەرستارەکە سەری هەڵبڕی وبۆلای زائربرۆخ چوو وبەسپایی وتی نەخۆش هەناسە نادا.

زائربرۆخیش وەک کیژەکە شۆربۆوە سەر نـەخۆشـەکـەو نزیکـەی دوو چرکە لەدڵ و نەبزی وردبـۆوە،لـەپاشـان سـەری هـەڵبـڕی، هاوسـەرو کچـەپـەرسـتارەکـەی دیتیـان رەنگـی دەرووان دا نـەمـاوە چوونکـە زائربرۆخ تێگەیی کە کابرا مردووە.

لـەوسـاتەدا بـەهـۆی مردنـی نـەخۆشـەکـە،تێکچـوونی زائربـرۆخ رەوی وهاتەوە سەرەخۆ وبۆوە خێوی هۆش وئاوەز وئاقڵی ئاسایی.

لەوساتی دا،مامۆستای بلیمەت،بۆیـەکـەمـین جار،بـەبـێ ئـەوەی وەک کـارەسـاتـەکـانی رابردوو،تووشـی دوودڵـی بێ،تێگـەیـشت کـەهـەڵـەی کـردووەوبـەهـۆی ئـەوهـەڵـەیـەکـەسـێکی کوشـتووەو هـەڵـەکـەشـی

لەوهەلانەیەکەقەرە بوو ناکرێتەوە. شێتی دەورەیی وخەرفانی جارجارەی مامۆستای مەزن بەوجوولەتوندەی هەستاولە مەحکومیەتی ویژدانەوە لەنێو برا وزائربرۆخ لەودەمەی دا لەباری هۆش وئاقڵەوە هیچ جیاوازیەکی دەگەڵ سەردەمی ئاسایی نەبوو.

زائربرۆخ کەبەتوندی ڕەنگی چرژابوو بەهۆی ترسانی زۆرەوە متەقی لێنەدەهات وتەنانەت مووی لێنەدەبزووت، ژنەکەی وکچەپەرستارەکەش کەئەویان لەو حاڵەدا دەدی ورەیان نەبوو لێو لێک هەڵپچڕن،چوونکە بێدەنگی ئەو سێ کەسە لەژووری عەمەلێ دادرێژەی کێشا سەرنجی"ئان بیس"ی راکێشا کەلە چێشتخانەدابوو، هاتەژوور و ئەویش ،دوای پەی بردن بەو ترس وخەجلانەی کەبەسەر ئەو ژوورە دا خۆی سەپاند بوو،نەیتوانی هیچ قسە بکا وبێدەنگ بوو.

کێیە بتوانێ ئەو تۆفان وگێژاوەی کەلەوساتەدا روح و ویژدانی زائربرۆخ،ئەوبلیمەتە مەزنەی داگرتبوو،وەگێرێ!!.

چ کەسێ هەیە بتوانێ پەژیوانی وهەست بە مەحکووم بوونی ویژدانی ئەو پیاوەی شی بکاتەوە!!.

زائربرۆخ هەوەڵین نەشتەرگەر نەبووەکە ئەوهەڵەیەی لەدەس قەوماوە وبەهۆی ئەوهەڵەیە کەسێکی کوشتووە وبەرلەوی نوژدارانی دیکە هەڵەی بەوچەشنەیان لەدەس قەوماوە و ئەمرۆش جارجارە هەڵەیەکی وا کە ببیتە هۆی تێداچوونی نەخۆشێکی بێ تاوان روو دەدەن

بەڵام نوژدارانی پێش وپاش زائربرۆخ ئەو بلیمەتیە زانستی و سینفییەی ئەویان نەبووە هەتا ویژدانیان ئەوان بەشێوەیەکی ئاوا لەبەخشین نەهاتوو مەحکووم بکا.

ئەوکەسەی لەکەرتێکی زانستی تێکەڵاوبەهونەردا خۆی پێ کەسێکی هەرەکامڵە ئەگەر بەهۆی هەڵەیەک تووشی کارەساتێکی لەقەرەبوو نەهاتگ بێ،خۆی نابەخشێ.چوونکە ئەوشتانەی تاوان کەم دەکەنەوە لەخۆدا نابینێ هەتا لەرادەی سزادان ( ئەو سزادانەی بەلایقی خۆی دەزانێ) داشکێنێ.

لەپاش ماوەیەک بێدەنگی کەزائربرۆخ بێ جووڵە راوەستابوو،چاوی بەتەرمی مردوو وکاژەڵاکی ئاوەڵا ومێشک، مێشکی سپی ،کەوت و دەستی خوێناوی خۆی بەنێو چاوانی گرت، بەشێکی سەرو نێوچاوانی بەخوێن سوور هەڵگەڕا.

لەوکاتەی دا نەشتەرگەری مەزن هەستی کردکەبەراستی نەخۆش بووە و ئەوانەی کەدەیانگوت دەبێ دەس لەکار هەڵگرێ و ئەوتەمەنەی ماویەتی خەریکی سانەوە بێ ،هەقیان بووە وقسەی باشیان کردووە . بزووت تا لەهۆدەکە بچێتە دەرێ.

کەچی، کچەپەرستارەکەبەهۆی کارەیی بوونی ،واقعیەتەکانی ئەوکارەساتەی لەبیرنەدەچۆوە دامێنی روپۆشە سپیەکەی مامۆستای باداو رێگەی لەچوونەدەری گرت و گوتی پروفیسۆری بەرێز لەگەڵ ئەمە (قامکی بۆ مردوو راداشت) دەبێ چ بکەین.

رودانی مەرگی نەخۆش، لەوەختی عەمەلی نەشتەرگەری دا یان دوایە بۆهیچ نەشتەرگەرێک مەبەستێکی لەچارەنەهاتوو نیەونوژدار لەپاش

مردنــی نــەخــۆش مــەرگــەکــەی تــەئیـد دەکـا ئیزنــی ناشــتنی دەردەکا،زائربرۆخیش دەیتوانی ئیزنی ناشتنی ئـەو مـردووە بنووسـێ ولەویدا بینووسێ کەلەبەردژواریەکانی عەمەلی نەشتەرگـەری مـاڵاوایی لەژیان کردووە،بەڵام ویژدانی زائربرۆخ،کـەمـەحکـوومی کردبـوو،ئیزنی پـێ نـەدەداکـەئـەو ئیزنـی ناشـتنی مـردوو دەرکـا هـەتابیـدەنـە خـزم وکەسەکانی کەبۆبردنی تەرمەکەی دەهاتن.

پیاوێکی کەهەتا ئەو دەمەی سەتان و هەزاران کەسی لەمەرگ رزگـار کردبوو بۆئەوەی خۆی لە مەحکووم کردنی ویژدان دەربـاز کا،کـەوتـە بیری خۆکوشتن.

بـەچـەشـنێک حـاڵ ووەزعـی زائربـرۆخ هاڵۆزوپـەرێـشان بـوو کەکچەپەرستارەکە زگی پێ سووتا و ئەوی لەژووری بەنـاو عـەمـەلێ بردە دەرێ وبردیە هۆدەیەکی دیکەوگوتی لێرە بـە هـەتـا ئـاوت بۆ دێـــنم دەســـت ودەموچـــاوت بـــشۆوە، زائربـــرۆخ گـــوتی کـەپـسول (گـولاج)ێکـی "ئـەسیدسـیانتریک" لـەم کاتـەی دا بـۆ مـن پێویست ترە لەئاو.

"ئەسیدسنتریک" ژارێکی گەلێک بەهێزەکەهەرلەساتەکـانی هـەوەڵـەوە رەگەبزوێن وهەستیارەکانی لەش لە کاردەخاولەئاکـام دائـیش وکـاری تـەواوی ئـەندامـەکـانی لـەش رادەوەسـتێ،یەکـێ لـەوکارانـە هـەناسـە هەڵکێشانە و چوونکـەپـشووهەڵکێشان رادەگیـرێ مێـشک بـە،ساوەی چـەندچرکـەیـەک دەمرێ،لـەلـەشـی مـرۆڤ دا خانـەکـانی مێـشک پترلـــەگـــشت خانـــەکان،لـــەهـــەمبـــەر نـــەگـــەیـــشتنی "ئوکـــسیژن"داهـــەســـتیارن،هەرکـــەپـــشووهەڵمـــاڵاوئیترخوێنی

تازە (ئەوخوێنەی لەسیەکاندا پاڵێوراوە) نەگەیشتە مێشک خانەکانی مێشک کەئیدی بەهۆی خوێنەوە ئۆکسیژن وەرناگرن دەمرن وپێنج چرکە لەدوای ئەوەی گەیشتنی ئۆکسیژن بەمێشک راوەستا خانەگەلی مێشک دەمرن وجا ئەوجار مەرگی خانەکانی تری لەش دەسپێدەکا.

ئەگەر زائیربرۆخ لەوێ رۆژی دا نەیتوانی خۆی بکوژێ لەبەر ئەمەی بووکە ژاری ئەسیدسیانیدریک لەماڵێ نەبوو و هۆیەکەی تریش ئەمەبوو کەزەنگی ماڵێ زیقەی لێ هەستا و دەرکەوت کە بێرندرۆف هاتووە هەتا ئەوەی کە بیرەوەریەکانی مامۆستا توندنووسی بکا.

هاوسەری زائیربرۆخ ئەولاوەی بردە هۆدەی چاوەنۆڕی و دواینیشاند، کچەپەرستارەکە یارمەتی کردهەتا دەست و دەموچاوی مامۆستا بشۆرێتەوە، هەنگی لێی پرسی چ لەتەرمەکە بکەین .

زائیربرۆخ گوتی کەسوکاری ئاگادار بکەنەوە بابێن وتەرمەکە بەرن .

دەفتەرێک لەماڵی زائیربرۆخی داهەبوو کەناو وئەدرێس و ژمارە تەلەفونی نەخۆشانی تێدا دەنووسرا، کچە پەرستارەکە لەودەفتەرەدازمارەتەلەفونی ماڵی کابرای مردووی دۆزیەوە وپێی گوتن بێن وتەرمی مردووەکەیان بەرنەوە،

کەسوکاری مردووەکە هەرکەئاگادار کران نەخۆشەکەیان مردووە جیالەپەرێشانی وپەژارە گەلێکیان پێ سەیر بوو چوونکە دەیانزانی ئەوکەسەی ریخۆڵەکوێرەی عەمەل بکرێ پێی نامرێ بەتایبەت ئەگەرنەشتەرگەرەکەی زائیربرۆخ بێ.

دیوناس وکەسی دەنەخۆشەکە ئەودەمەی ویستیان تەرمەکەی بەرنەوە دیتیان کەسەری پێچراوە و ئەمەش زیاد بوو لەسەرسوڕماویان چوونکە نەخۆشەکەی وان ئەپاندیستی هەبوو و چ نەخۆشی دەسەرومێشکان دا نەبوو هەتا سەری بخەنەبەر عەمەلی نوژداری.

ویستیان لەزائربرۆخ داوای رونکردنەوە بکەن، نەیاندیتەوە. کچەپەرستارەکە" ئیزنی ناشتن "کەبەخەتی زائربرۆخ بوو دایەدەست کەس وکاری مردووەکە،لەوپسوولەیەدا بەبێ ئەوەی ئاماژەیەک بۆعەمەلی مێشکی کرابێ نووسی بووی؛ نەخۆش بەهۆی عەمەلی ریخۆڵەکوێرەوە مردووە.

کەس وکاری کابرای مردوو سکاڵایان بردە لای پۆلیس،لەپۆلیس ڕا رێنوێنی کران بۆ وەزارەتی تەندروستی و وەزیری تەندروستی ودوکتۆر مادلینێر هەوڵیان داکەس وکاری مردووەکە تێبگەیەنن کەزائربرۆخ لەگەڵ نەخۆشی ئەوان دژبەری ونەیاریەکی تایبەتی نەبووەوبەهۆی تێکچوون وخەرفانێ ئەونەخۆشەی کوشتووە ولەدوای مشت ومرێکی فرە بەم چەشنە رازیان کردن کە؛ زائربرۆخ لەمووچەی خانەنشینی خۆی (لەدوای ئەوەیکە پەسندکرا ) هەتاچەندساڵان لەبرپەمووچەیان بداتێ،بەڵام مووچەی خانەنشینی مامۆستا هەرگیز نەگەیی هەتا بەشیکی لێ بداتە میراتگرانی کابرای مردوو.

وەزیری تەندروستی ودوکتۆر مادلینێر بۆخستنەژێر چاوەدێری و دەرمانی مامۆستا ودوورکردنەوەی لەونەخۆش گەلەی کەدەچوونەلای رایانگوێستە نەخۆشخانەی شاریتی،درێژەی گلدانەوەی زائربرۆخ

لەنەخۆشخانەزەمانەت بوو بۆ بەرگرتن لەوەی کەکێردی نەشتەرگەری بەدەستەوە بگرێ ودیسان قەتڵی لەدەس بقەومێ،بێرنەرۆڤیش لەدوای راگوێستنی زائربرۆخ بۆنەخۆشخانە بەرەزامەندی دوکتۆر مادلینێر دەچووە ئەوێ ولەو رۆژانەی داکەحاڵی مامۆستا لەبار بوویا بیرەوەریەکانی دەنووسیەوە.

*رێورەسمی سەتەمین ساڵی نوژدارێکی مەزن*

لەحاڵێکدا کە مامۆستا بەناوی نەخۆش لەنەخۆشخانەدا رایدەبوارد، پزیشکان و نوژدارانی ئاڵمانی خۆرهەلآت بەبۆنەی سەت ساڵەی لەدایک بوونی "فین میکولیک رادکی" نوژداری مەزنی ئاڵمان تەمایان گرت لەشاری "فرانکفۆرت" رێورەسمێ بەرپاکەن.نابێ شاری" فرانکفۆرت "ی هەڵکەوتوو لەئاڵمانی خۆرهەلآت و"فرانکفۆرت " ی ئاڵمانی رۆژاوات لێ تێکچی، فرانکفۆرتی ئاڵمانی رۆژاوا گرینگایەتی لەفرانکفۆرتی ئاڵمانی خۆرهەلآت پترە و زانستگایەکی گەورەی، لێیە و جێی لەدایک بوونی"گوتە"ی شاعیری ناوداری ئاڵمانیە ولەکەناری روباری"ماین" هەڵکەوتووە،بەلآم شاری"فرانکفۆرت"ی ئاڵمانی خۆرهەلآت لەکەناری روباری"ئودێر"قەراری گرتووەولەباری شار ستانیەوە بەقەدەر "فرانکفۆرت"ی ئاڵمانی رۆژاوا گرینگ نیە.

سەرگرشتەی"فێن میکولیک رادکی"،کەدەیانەویست بەبۆنەی سەت ساڵەی لەدایک بوونی، لە"فرانکفۆرت " رێورەسمێکی بۆ سازبکەن،دووروودرێژەو ئێمە لەمەبەستی سەرەکی کە گێرانەوەی

سەربردەی زائربرۆخەلادەدا، هەربۆیە بەوەندەی لێدەگەرێین کە؛ "فێن میکولیک رادکی"مامۆستای "زائربرۆخ" بوو، ئەویش لەنەشتەرگەری دا ئیلهامی لەوپیاوە وەرگرت وهەنگی بۆخۆی گەیشتە پایەی بلیمەتی.

لەنێو نوژدار و پزیشکانی ئالمان دا هیچ کەس نەیدەتوانی وەک "زائربرۆخ"سەبارەت بە"فێن میکولیک رادکی" زانیاری بدابەوکەسانەی کە لە رێورەسمی سەت ساڵەی لەدایکبوونی ئەونەشتەرگەرەمەزنەدابەشداریان دەکرد وهەربۆیە ئەو کومیتەی کەبەرێوەبەری رێورەسمی سەت ساڵەی لەدایک بوونی ئەومەزنە بوو داوای لەزائربرۆخ کردلەو مەراسیمەدا حازربێ وگوتاری سەرەکیش بەستۆوە بگرێ.

چوونکە ئەدرێسی تازەی زائربرۆخ نەخۆشخانەی" شاریتی"بوو،زیافەتنامەکە گەیشتەدەست بەرپرسانی نەخۆشخانەی ناوبراو.

دوکتۆرمادلینێر وهاوکارانی بیروڕایان گۆریەوەکە ئایا زائربرۆخ دەبێ ئەوزیافەت نامەیە ببینێ ولەرێورەسمی سەت ساڵەی لەدایک بوونی مامۆستاکەی داحازربێ یان نا ؟.

ئاکامی راگۆرینەوەی سەرەتایی بەم چەشنەبوو کە؛چوونکە لەرێورەسمی سەت ساڵەی لەدایک بوونی فێن میکولیک رادکی لەشاری فرانکفۆرت ژووری عەمەلی لێ نیە وزائربرۆخ تیغی نەشتەرگەری بەدەستەوە نابێ تا نەخۆشێک بخاتە بەرعەمەل وبیکوژێ،حازربوونەکەی بۆکەسانی تر چ مەترسی نیە.

لەپاش ئەو تەگبیروڕایە سەبارەت بەوەی ئاڵووگۆڕی بیروڕایان کرد کەئاخۆ زائربرۆخ دەتوانێ لەفرانکفۆرت دا لە بارەی مامۆستاکەی گوتار بدا ؟.

ئاکامی کۆبوونەوەولێکدانەوەی دووهەم بووبەمەکە؛دووکەس لەفەرمانبەرانی لاوی بەهیزوگوڕی نەخۆشخانە لەگەل زائربرۆخ بچنەئەوتالارەی کەشوێنی بەرێوەچوونی رێورەسمەکەیە،ئەم بەر ئەوبەری بگرن وئەگەرزانیان زائربرۆخ لەکاتی لێدوانەکەی دا مەبەستگەلی بێ سەروقون دێنێتە بەرباس یەکێ لەوان زائربرۆخ بەرێتە دەرێ ویەکیان وتارێکی کورتی کەلەلایەن نەخۆشخانەوە (لەراستی دا لەلایەن خوودی مادلینێرەوە) ئامادە کرابوو بخوێنێتەوە هەتا ئەرکی زائربرۆخ جێبەجێ کرابێ.

بەم شێوەیە زیافەتنامەکەیان بەزائربرۆخ نیشان دا ودوکتۆر مادلینێر پێی گوت تابابەتی گوتاردانی خۆی ئامادە بکاوچوونکە لەن ەخۆشخانەدا کتێبخانەیەکیش هەیەئەگەر پێی خۆشە لەوکتێبانە بۆ گوتاری خۆی کەڵک وەرگرێ.

زائربرۆخ کەمامۆستای خۆی بەباشی دەناسی و وەزع وحاڵیشی بۆئامادەکردنی گوتاربێژی لەبار بوو،بابەتی گوتارەکەی تەرخان کرد بۆ دیمانەیەکی"فێن میکولیک رادکی"کەئەویش مەترسی هاتنی میکرۆبان بۆنێو برینە کانی نەشتەرگەری بوو.

فێن میکولیک رادکی بەچەشنێک لەبارەی میکرۆبەوە ( لەعەمەلەکانی نەشتەرگەری دا) حەمبەڵی بوو کە یاساغی کردبوو؛هاوکارانی هەقیان نەبوو قسەبکەن ئەگەر زاربەستیشیان بەدەمەوەبێ و

دەیگوت محاڵە کەسێ قسەبکاو میکرۆبی لەزار نەیەتە دەرێ ودەمبێن ناتوانێ بەرگری لەدەرپەڕینی میکرۆب بکاو میکرۆب پاش لەزار هاتنەدەر دەچێتەنێو برین وهەروەکی هەنگ ومێش ئاشقی شرینین میکرۆبیش ئاشقی زامە و ئەوەندە بەسە میکرۆبێک لەزاری کەسێک بێتەدەرێ ولەسەربرینی عەمەلی نەشتەرگەری بنیشی هەتا چل وهەشت کاتژمێری تر ژمارەی زاوزێی کەلەومیکرۆبە بەدی دێن لەژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان پتر دەبن.

چوونکە میکرۆب بۆزاوزێ پێویستی بەدوورەگەزی نێرومێ نیەوهەرکە لەسەر برینێک نیشت وخۆراکی پێ گەیی بۆزیادبوون دەبێتە دوو کەرت وهەنگی هەریەک لەودووکەرتە لەت دەبن وبەنۆرەی خۆیان دەبنە دوو میکرۆب و ئەم چەرخەیە هەروا درێژ دەبێتەوە.

لەبەرئەمەبووکە فین میکولیک رادکی بڕوای وابوو ئەوەندەبەسە میکرۆبێک لەسەر زامێک جێ خۆشکا،هەتا ئەوبرینە تووشی ئیتیهاب بێ (چلکێ بکا) وئەگەر لەیەکێ لەئەندامە گرینگەکانی لەشی نەشتەرگەری کراودا دابەزێ وبرینەکە چڵک بکا،دەبێتەهۆی مەرگ.

نوکتەیەک باس بکەین بێ جێ نیە،ئەویش ئەوەیە کەلەزەمانی"فێن میکولیک رادکی"دادەرمانگەلی"ئانتی بیۆتیک"، کەسەر قافڵەیان" پینیسیلین"ە،نەبوون هەتالەپاش عەمەلی نەشتەرگەری پێش بەچڵک کردنی زام بگرێ،بەڵام ئەورۆژەی"زائربرۆخ"دەیەویست سەباردت بە سەت ساڵەی لەدایک بوونی مامۆستای خۆی قسە بکا،ئانتی بیۆتیک هەبوو ونوژداران ئیتر وەک فێن میکولیک رادکی لە میکرۆب نەدەترسان وئەگەر زائربرۆخ لەمەڕ میکرۆب زۆردواباڵە بەر گوێچکەی

گـــــــــوێگران دەبێـــــــزا.

بەڵام هەرئەوانەی لە"میکرۆب"نەدەترسان لە"ڤیروس "تۆقیبوون، چوونکە دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیک کەمیکرۆب کوژن لەسەر ڤیروس بێ تەئسیرن. لەبەرهەندێ بوو کەزائیربرۆخ قسەکردنەکەی خۆی سەبارەت بە مامۆستای وەها ئامادە کردبوو کەبتوانێ پاش پێشەکیەکی لەسەرترسی مامۆستاکەی لەمیکرۆبان،سەبارەت بە ڤیروس بدوێ.

لەرۆژی دیاری کراودا زائیربرۆخ، لەحاڵێک دا دووکەس لەدوکتۆرەکانی نەخۆشخانە لەهەردوولای دەرۆیشتن، هاتەنێو تالاری بەرێوەچوونی رێورەسمەکە .زائیربرۆخ کەلەهەموو تەمەنی دا قیت وقنج هەنگاوی داویشت بە بەژن وبالآی وەک خەدەنگی هاتەنێو تالار بەلآم ئەوکەسانەی لەوپیاوەنزیک دەبوونەوە دەیاندیت کەدەم وچاوی پڕ لەگنج بووە وچاوەکانیشی ئەوگرشەی رابردوویان نیە.

زائیربرۆخ ئەودەمەی دەستی بەقسەکردن کرد،دوکتۆر"مادلینێر" وئەوانی دیکە کەدەترسان تێکچوونی ئەو پیاوەی سەرهەڵداتەوەو هاتەران پاتەران گوێی بکا،دڵیان داسەکنی، چوونکە زائیربرۆخ خاوەنی هەستگەلی ئاسایی بوو وژیروئاقڵانە قسەی دەکرد وگوتاری ئەورۆژەی کەدوامین قسەکردنی بەرلەمردنی بوو تەئسیرێکی باشی لەسەرگوێگران هەبوو،رەنگە بکرێ بڵێین سەرکەوتنێکی زانستی وروحی بوو بۆزائیربرۆخ.

ئەو دوای ئەوەی مامۆستای خۆی "فێن میکولیک رادکی" بەدڵپاکیەوە خستەبەر پێهەڵدان ورێزگرتن و چەند شاکاری

نەشتەرگەری وی باس کرد چووەسەرباسی"ڤیروس"،ئەگەرچی ڤیروس پتر پێوەندی بە پزیشکییەوە هەیە بەڵام پێوەندی پزیشکی و نوژداری ئەوەندە لێک نزیکە کە لەباری ئەرکەکانی کۆئەندامی لەشی مرۆڤ هەردووک دەبنەوە یەک.

زائربرۆخ گوتی ئێمە نوژداران هەروەک ئەمرۆ دەتوانین مەترسی میکرۆبان لەنێو بەرین دەشێین مەترسی هەندێ لەڤیروسەکانیش دوورکەینەوە،بەڵام لەئێستادا، زوربەی ڤیروسەکان ترسێکیان لەدەرمانەکانی" ئانتی بیۆتیک" نیەو ئێمە ناتوانین مەترسی ئەوان لەبەین بەرین.

لەپاشان ئاوای درێژە بەقسەکردنی خۆی دا: گشت برادەران و خاتوونەکانی بەرێز دەزانن کەوشەی"ڤیروس" لەزمانی لاتینی دا بەمانای ژارە،ئەوڤیروسە بوونەوەرێکی گەلێک بچکۆلەیەکەلەپێنج یەکی"میکرۆن"وردترە ولەم کۆیەداکەسێ نیە کەنەزانێ هەرمیکرۆنێک هەزاریەکی "میلی مەتر"ە.

ڤیروس ئەوەندە وردیلەیە کەئێمەبە"زەرەبین"ی ئاسایی نایبینین،ئەم بوونەوەرە زۆربچکۆڵەیەی کەلەهەمبەر دەرمانەکانی ئانتی بیۆتیک دا پارێزراوە هێرش دەکاتەسەر خانەکانی لەشی ئێمە و"خانە" دەمرێنێ ودەگەڵ مردنی خانە ئێمەش دەمرین.

ئەگەر" خانە"ی لەشمان بزانێ کەی دەکەوێتە بەرهێرشی" ڤیروس" بەهۆی "ئانزیم"زرێ دەپۆشێ، ئانزیم شتێکە لە خانەوە دەزێتەوە. بەڵام خانە نازانێ کەنگێ دەکەوێتەبەر هێرشی ڤیروس هەتا بەرگی پۆڵا دەبەرکا، چوونکە ڤیروس هەمیشە،لەناکاو،وبەکەڵک وەرگرتن

لە"خافڵگیری" تەواو پەلاماری خانە دەدا. رون وئاشکرایە کەبەرێزان دەزانن"ئانزیم"وشەیەکی یوونانیەولەدوو ووشە پێک هاتووەکەبەمانای"هەوێنی هەویر"ە (کەلەزوربەی ناوچەکانی کوردستان هەرلەخوودی هەویرەکە کەڵک وەردەگرن وپێی دەڵێن"هەویرترش" ). ویوونانیەکان پێیان وابوو"هەوێن" کەهەویر پێدەگەیەنێ ،و وەک دەڵێن "هەڵیدێنێ" تایبەتمەندیەکە دەبێتە هۆی هەڵاتنی هەویر، هەروەها لەبەرێزان شاراوە نیەکەزاراوەی"ئانزیم" ئێستا لەپزیشکی دابەو شتانە دەگوترێ کەلەنێو لەشی ئێمە دا وەبەر دێ ونەختێکی زۆرکەم لەوی، لەئەرکەکانی کۆئەندامی لەش دا ،گەلێک کاریگەرە .بەهەمە حاڵ خانە بۆی دەکرێ بەو ئانزیمەی کەبەدی دێنێ مەترسی ڤیروس لەخۆلادا بەڵام پێویستیەکەی ئەوەیە بزانێ چ کاتێ ڤیروس هێرشی دەباتەسەر.

بۆئەوەی ئێمە بتوانین مەترسی هێرشی ڤیروس بۆ سەر خانە پوچەڵ بکەینەوە پێویستە لەبەرماڵی خانە زەنگێکی وریاکردنەوە هەڵاوەسین،هەتا ئەو کاتەی ڤیروس لەماڵی"خانە" نزیک دەبێتەوە ودەیەوێ لاق بەریتە ژوورێ ،ئەو زەنگە بزرینگێتەوە و خانە وشیار کاتەوە،هەتا بێدرەنگ زرێ دەبەر کا .ئەگەر ماڵی خانە دیواری دە بڵیند و لێکنەپچڕاوەی هەبا زەنگ دانان پێویست نەبوو بەڵام "خانە"دیواری بەرزی نینە ودەورەکەی پەرژینێکە کە ڤیروس بەسانایی دەشێ لەدرزی تانەکەوە خۆدەژوورێ هاوێ و خانە خافڵگیر بکا .

بەڵام ئەگەر ئێمە بتوانین زەنگێکی راگەیاندنی مەنرسی لەبەرانبەرماڵی"خانە"داهەڵاوەسین هەتاڤیروس لە هەرلایەکەوە ویستی بێتە ماڵێ زەنگەکە زرینگەی لێ هەستێ چوونکە خانە لەچاوترووکانیک دا ئامادە دەبێ بۆ لادانی ڤیروس،هەرنەخۆشیەکی کە بەهۆی هێرشی ڤیروسەوە بۆسەرخانەکانی لەشی ئێمەپەیدابێ لە نێو دەچێ.نەخۆشی"پیری" یش لەنێو دەچێ ومرۆڤ هەمیشە لاو دەمێنێتەوە،لەبەرئەوەی پیری نەخۆشیەکە کەلەهێرشی ڤیروس بۆ سەر خانەکانی لەشی ئێمە سەرهەڵدەدا، کارتێکردنی ئەم ڤیروسە لەسەرەخۆیە و بەشێوەیەکی هەمەکی سی هەتا چل ساڵ،یان ماوەیەک پتر، دەخایەنێ هەتا ڤیروسی پیری لەشی ئێمە داڕزێنی وکۆتایی بە ژیانمان بێنێ.

لەوێ رۆژێ دا بۆ یەکەم جار،لەزمانی زائربرۆخەوە،راگەیەندرا کەپیری نەخۆشیەکە، کەوەک گشت نەخۆشی ڤیروسی دیکە لەهێرشی ڤیروسێکەوە دەس پێدەکا.

هەتا ئەوی رۆژێ زۆرجاران گوترابوو کەپیری نەخۆشیە،بەڵام پشتراستیان نەکردبۆوەکە هۆکاری بەدی هاتنی ڤیروسێکە.ئەم راگەیاندنە،کەئەمرۆ هەموو زانایانی ژینەوەرناسی و ئەرکەکانی کۆئەندام بەواقعیەت دەیزانن ، لەو زەمانی دا،راگەیاندنی دیمانەیەکی پزیشکی تازەباو و بێ پێشینە بوو،گەلێکی لەسەرئامادەبووان کاریگەری بەجێ هێشت.

زائربرۆخ درێژەی بەقسەکانی دا وگوتی پێشبینی دەکەم تا بیست - بیست وپێنج ساڵی ترئەم زەنگەی وریا کردنەوە لەمەترسیە کەدەبێ

لەدەرکی هەموو ماڵی خانەکان هەڵاوەسرێ،هەتا ئەوی لەمەترسی هێرشی ڤیروس وریاکاتەوە،دەدۆزرێتەوە،باشترین جوری زەنگی وریا کردنەوەئەمەیە کەبۆ بەرگری کردن لەهەموو جورە کانی ڤیروس تەنیا یەک زەنگ داندرێ، نەک بۆ هەر جورە ڤیروسێک زەنگێکی وریاکردنەوەی تایبەت دابنرێ.

لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە زائربرۆخ خەریکی گوتاربێژی بوو تەنانەت تووشی زمان تێکهالان نەبوو، چ بگا بە وەی هاتەران پاتەران گۆیی بکا،قسەکردنەکەی لەئالمانی رۆژاوا دەنگێکی زۆری دایەوە وگۆڤارەکانی زانستی و پزیشکی هەردوو دیمانەکەیان سەبارەت بە ڤیروسی پیری و دانانی زەنگی وریاکردنەوە لەماڵی خانەدا خستە بەر باس ولێدوان، لەسەریەک، گوتاربێژی ئەو پیاوە لە فرانکفۆرت بۆخۆی سەرکەوتنێک بوو.

لەدوای وەی کەلە فرانکفۆرت گەراوە هەروا لەنەخۆشخانەدا ڕایبارد، بەداخەوە ( دیارە لەبۆ زائربرۆخ !) وەزیری تەندروستی،لەگەڵ پێداگری زائربرۆخ وخۆپاراستنی لە ئیمزا کردنی بەڵگەنامەکانی خانەنشینی دەیەویست مووچەی خانەنشینی مامۆستا بسەپێنێ، لەسەرکار لادرا.وەزیری نوێ هیچ کاری بۆ بەرقەرارکردنی مووچەی خانەنشینی ئەوپیاوە نەکرد چوونکە ئەوی پێ بێنیاز بوو لەباری ماڵیەوە،لەحاڵیکدا کە ئەو پیاوە لەو تەمەنەی پیری دا بەراستی بۆ دابین کردنی بژیوی خێزانە بچکۆلەکەی دەس بەتاڵ بوو بەتایبەت کەلەدوای گەرانەوە لە فرانکفۆرت حاڵی بەرەو خەراپی چوو بەچەشنێکی وا کەهەندێ رۆژان نزیکەکانی خۆی نەدەناسی.

لەدوای نیشتەجێ بوونی هەمیشەیی پروفیسور زائربرۆخ لەنەخۆشخانەدا هاوسەرەکەی بۆدابین کردنی بژیوی ژیانی بەچەشنێکی واکەوتە تەنگانەوەکەنامەیەکی بۆ"تئودور هوس"ی سەرکۆماری ئاڵمانی رۆژاوا نارد و لەوێدا بۆمێردەکەی داوای یارمەتی کرد. مارگۆ لەو نامەیەدا نووسی کەمێردەکەی نەخۆشی روحییەو ماوەیەکە لەنەخۆشخانەدا دەژی وبەهۆی نارەحەتیەکانی دەروونی ناتوانێ کاربکا کەچی ئەگەرلەباری لەش ورەوانیش سەلامەت بایە لەقۆناغێکی ئەوتۆی تەمەن دایەکەزوربەی پیاوان کاریان بۆ ناکرێ لەو تەمەنەدا،بەڵام ئەوپیاوە زورهانەی کەئێستا نەخۆشە خزمەتی مەزنی بەپزیشکی و نوژداری ئاڵمان کردووە و پێویستە ئەمرۆ نەتەوەی ئاڵمان رێز لەخزمەتەکانی بگرێ، چوونکەجەنابت دەسەڵاتدار و نوێنەری ئەو نەتەوەیەی من پێموایە کە ئەرکی ویژدانی و نیشتمانی ئێوە ئەمەیە کە هەستن بەدابین کردنی بژیوی ئەم پیاوەو خێزانەکەی.

سەرکۆماری ئاڵمانی رۆژاوا لەوڵامی مارگۆدا نامەیەکی نووسی و داخ وپەژارەی خۆی بۆ نەخۆشی زائربرۆخ دەربڕی بەڵام لەبارەی هەنگاونان بۆ دابین کردنی بژیوی زائربرۆخ و خێزانەکەی داوای لێبووردنی کرد و گوتی بە داخەوە سەرکۆماری ئاڵمانی رۆژاوا بودجەیەکی لەبەردەست دانیە هەتابتوانێ لەوی را بۆ زائربرۆخ مانگانەیەک ببڕێتەوە یان بەشێوەیەکی کاتی یارمەتیەک بەوپیاوەو خێزانەکەی بکا و چاکتر وایە کەئەو(یانی مارگۆ ) بچێتە لای شارەوانی بەرلینی رۆژاوا.

مارگۆ نامەیەکی بۆشارەوانی بەرلینی رۆژاوا،کەلەو کاتی دا"ئەرنێست رۆتیەر"بوو،نووسی وئەوەی لەنامەکەی سەرکۆماردانووسیبووی دووپاتی کردەوە.

من وڵامی شارەوانی (شارەدار) بەرلینی رۆژاوام نەدیتوە بەڵام لەرۆژنامەکانی ئەوکاتی دا نێوەرۆکی وڵامەکەی شارەوانیم بەم چەشنە خوێندۆتەوە؛ کەچوونکە زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی شاریتی هەڵکەوتوو لە بەرلینی خۆرهەڵات دا کاری دەکرد، پێراگەیشتن بە حاڵ و وەزعی وی لەستۆی نەخۆشخانەی شاریتی یان شارەوانی بەرلینی خۆرهەڵاتە و چ پێوەندی بەشارەوانی بەرلینی رۆژاواوە نیە.

وڵامێکی لەلایەن سەرکۆماری ئاڵمان و شارەوانی بەرلینی رۆژاوا دراوە بە هاوسەری زائربرۆخ لەدووسەرچاوە ئاوی دەخواردەوە:

یەکەم:ئەمەبوو؛کەنەسەرکۆماری ئاڵمانی رۆژاوا لەباری سیاسیەوە،سەبارەت بەزائربرۆخ دیمانەیەکی لەباری هەبوو، نەشارەوانی بەرلینی رۆژاوا. ئەوان زائربرۆخیان بەدەست وپێوەندی کومونیستەکانی ئاڵمانی خۆرهەڵات دەزانی چوونکە دیتیان کە لەدوای کۆتایی هاتنی شەر لەبەرلینی خۆرهەڵات دا مایەوەو درێژەی بەکارکردن لەنەخۆشخانەی شاریتی دا کەلەژێردەسەڵاتی کومونیستەکان دابوو.

بەڵام راستیەکەی ئەمەیە: کەزائربرۆخ نە ئەندامی حیزبی کومونیست بوو و نە لە"سەنپاتیزان"ەکان ، یانی لایەنگرانی ئەو حیزبە، دەژمێرا،بەشێوەیەکی هەمەکی زائربرۆخ بەچەشنێکی وەها خەریک

ودڵبەستەی کاری نەشتەرگەری بوو کەلەهەموو تەمەنی دا دەگەڵ هیچ جورە چالاکیەکی سیاسی تێکەڵ نەبوو.

هەربەو هۆیەش،وەکی لەلاپەرەکانی پێشوو دا گوتمان لەدوای ئەوەی کە هیتلەر وحیزبەکەی (حیزبی سوسیالستی نەتەوەیی)هاتنەسەرکار زائربرۆخ نە بووە ئەندامی حیزب و نە رازی بوو لەوحیزبەدا، لەناوی وی، بۆ پروپاگەندە کەڵک وەرگرن .

سەرکۆماری ئاڵمان وشارەوانی بەرلینی رۆژاوا سەرنجیان نەدابووە ئەم خاڵەکەزائربرۆخ گەلێک ساڵان بەرلە وەی شەری دووهەمی جیهانی هەڵایسێ و لە ئاکامی ئەوشەرە دا ئاڵمان بەدوو وڵاتی رۆژاوا وخۆرهەڵات دابەش بکرێ،ئەو لەنەخۆشخانەی شاریتی دا کاری کردووە وئەگەر لەدوای کۆتایی هاتنی شەر ودابەشبوونی ئاڵمان بەدوو وڵات نەیەویست لەو نەخۆشخانەیەو لەئاکامدا لە بەرلینی خۆرهەڵات وەدەر کەوێ بەهۆی ئەو سۆزو خۆشەویستیە بوو کەبە شوێنی کاری خۆی هەبوو.ئەوەش سۆزێکە کەلەژن وپیاوانی پیروبەساڵداچوو پتر لەلاوان دەبیندرێ،لەژن وپیاوی پیردا خۆشەویستی شوێنی کار دەگەڵ خوو دەبنە دووانە وپیرەکان لەساڵەکانی ئاخروئوخری تەمەن دا بەشێوەیەک دەکەونە بەر کارتێکردنی خوو وخدەکانیان کە گۆرینی ئەو خووانەیان بۆ دژوارو سەختە.

سەرکۆماری ئاڵمانی رۆژاوا وشارەوانی بەرلین ئەم دیاردە سروشتیەی رەوان ناسییەیان نەدەدی وهیچ سەرنج یان نەدایە، وایان بەزەین داهات کەزائربرۆخ لەپاش کۆتایی شەربۆیە لەبەرلینی خۆرهەڵات

مایەوە کەخەڵکی ئەوێی خۆش دەویست و لەدەوڵەتی ئاڵمانی خۆرهەڵات پارەوپوڵی وەردەگرت.

دوومین سەرچاوە: وڵامی نەرێنی سەرکۆماری ئاڵمان وشارەوانی بەرلینی رۆژاوا لەبەرهەندێ بوو کەئەوان زائیربرۆخیان بەپیاوێکی دەوڵەمەند دەزانی وئەویان بە نیازمەندی وەرگرتنی مانگانە نەدێنا ژمار .

ئەوان پێیان وانەبوو کە مارگۆی هاوسەری زائیربرۆخ ئەونامانەی بەبێ ئاگاداری مێردەکەی نووسیوە و وایان لێکدەداوە کەنامەکان بەفەرمانی زائیربرۆخ نووسراون وئەو پیاوە دەگەڵەوەی دەوڵەمەندە،بەهۆی تەماح و لەبۆ کۆکردنەوەی ماڵ ودارایی دەیەوێ داهاتێکی هەمیشەیی تریشی هەبێ.

لەژیانی بەشیک لەکەسانی ناوبەدەرەوە و بەتایبەت لەژیانی بلیمەتەکان،ئێ ەفسانە، لەزەینی هەرەمەی خەڵکی،لەراستیەکانی مێژوویی بە هێزترە، یەکێ لەو ئەفسانانەی کەلەبارەی زائیربرۆخەوە کەوتبووە سەر زارو زمانان ئەمەبوو کە؛دوای ئەوەی"جۆرج"ی پێنجەم پاتشای ئینگلیسی خستە بەر عەمەلی نەشتەرگەری یەک میلیۆن مارکی ئاڵمانی هەق دەست وەرگرت،رەواجی یەک میلیۆن مارک لەوزەمانەی دا کەزائیربرۆخ لە پاتشای ئینگلیسی وەرگرت بوو بەلانی کەم پەنجا قاتی ئەو پوڵەی بوو لەساڵەکانی ئاخروئوخری تەمەنی زائیربرۆخ دا.

بەرتەک دانەوەی مەعنەوی بانگێشتنی دەرباری شاهانەی ئینگلیستان لەزائیربرۆخ بۆئەوەی جورجی پێنجەم بخاتەبەر عەمەلی

نەشتەرگەرى زۆرلەوە زياتر بوو كەئەمرۆ لەلايەن دەوڵەتى ئەمريكاوە لەدەوڵەتى سوڤيەت داوابكرێ نوژدارێكى سوڤيەت بچێ وسەركۆمارى ئەمريكا عەمەل بكا چوونكە لەنێوان ئەمريكا وسوڤيەت دا شەر هەڵنايساوە وسوڤيەت شكستى لەلايەن ئەمريكاوە بەسەردا نەهاتووە هەتاسەركۆمارى ئەمريكايە لە نوژدارى نەتەوەيەكى ژێركەوتوو داوابكا بچێتە ئەمريكا و عەمەلى بكا.

بەلام ئينگليستان وئالمان لەشەرى يەكەمى جيهانى دا پێكەوە بەشەر هاتبوون وئالمان لەبەر ئينگليس بەزى بوو،بەوحالەش پادشاى ئينگليستانێ ،كەلەوزەمانى دا ئيمپراتورى ٥٢٥ ولاتى ژێردەستە بوو و وەک باس دەكەن خۆرلەئيمپراتوريەكەى ئاوا نەدەبوو،لەنوژدارى نەتەوەيەكى دۆڕاو لەشەردا ( ئەويش لەخۆى)داوا دەكا كە بچێتە ئينگليستان و بيخاتەبەر عەمەلى نەشتەرگەرى،دەگەڵ سەرنج دان بەو مەبەستەى كەئينگليستان يەكێ لەناوەندەكانى نوژدارى جيهان دەژمێرا ونەشتەرگەرى ناودارو كارامەى هەبوون .

دەگەڵەوەى هەرئەو نوژدارە مەزنانەى ئينگليسى پێيان لێدەنا كە زائربرۆخ لەوان چازانترە وبۆعەمەل كردنى پاتشاى ئينگليسێ لەوان لەسەرترە.

عەمەلى زائربرۆخ بەسەركەوتنەوە دوايى هات ولەناوبانگ وشانازيەكانى زێتر بوو،بەلام بەپێچەوانەى بۆچوونى خەلكى پارەيەكى ئەستوورى بەنسيب نەبوو.

## سەفەر بۆ مونیخ

لەمانگی نوامبری١٩٥٠ی زایینی"کینـدلێر"ی بـەرێـوەبـەری دامـەزراوەی چاپەمەنی هەڵکەوتوو لە شاری"مونیخ" کە بڕیاربوو کتێبـی زائربـرۆخ چاپ کا بانگێشتی کرد تابۆ دیتنی فۆرمەکانی سەرەتایی کتێبـەکـە و نـاودێرکردنی ، کـەدەبـوو لـەپـشتی بـەرگـەکـەی بنووسـرێ،بڕواتە "مونیخ"ێ.

زائربرۆخ لەگەڵ "مـارگۆ"ی هاوسـەری چـووە مـونیخ ولـەنووسـینگەی کیندلێر دا حازربوو لەوکاتی دا هەست و ئاوەزی مامۆستا بـەتـەواوی ئاسایی بوو،دەستی بەخوێندنەوەی فۆرمە ئامادەکان کرد،بـەلام وردە وردە ئـەوی دەیخوێنـدەوە دەبـووە مایـەی سـەرسـوڕمانی مامۆسـتا وکەمکەمە هەڵچوو،بەتوڕەییەوە بە کیندلێری گوت:ئـەوهـەی کـەئێـوە چاپتان کردووە گوتەی من نیەو هەڵبەستەیەو بەمن لکێندراوە.

کینـدلێر دەیزانـی کـە بێـرن درۆڤ،ئـەوکاتـەی بۆنووسـینی کتێبـی زائربـرۆخ چووبـووەبـەرلینـی خۆرهـەلات،لـک وپـۆ وگـەلای دەزیـادی خستۆتە سەرهەندێ لەبەشەکان و ڕێی تێدەچـی هـەندێ بابـەتیـشی پێـوە هـەڵبـەستبێ و ئـەویـش دەگـەڵـەوەی ئـەوەی دەزانـێ چـاپی کردوون،کەچی بەرێوەبەری دامەزراوەی چاپی کتێب پێـی وابـوو ئـەو لک وپۆ و بابەت پێوە هەڵبەستنە بە ڕەزامـەنـدی خـوودی زائربـرۆخ کراوە هـەتـا کتێبـەکـە سـەرنـج ڕاکـێش تـر و خـۆش تربـێ هـەروەک لاوەتوندنووسـەکـە پێـشنیازی بـە مامۆسـتاکرد کـەئـەو بـەشـانەش لەکتێبەکەی دا جێ بکاتەوە و مامۆستاش ڕازی بووە ،دەنـا کینـدلێر

لەوەی بە ئەزموونتر بوو کە ئاگادار نەبێ کەئەگەر بڵاوکەرەوە شتێکی لە کتێبێک دا هەڵبەستێ کەنووسەرلێی ئاگادارنەبێ،لەباری یاسایی تاوانبارەونووسەر بۆی هەیە داوای قانوونی لەسەر تۆماربکا،هەرلەبۆیە،ئەودەمەی تێگەیی کەمامۆستا ئەومەبەست وبابەتانەی نەگوتوە، یابەجێکردنەوەی ئەو بابەتانە لەنێو کتێب دا رازی نەبوو،ویستی کەمامۆستا ساردکاتەوە وهێوری کاتەوە هەتالەگەڵ چاپی کتێو رەزامەندی نیشان بدا چوونکە پیتچینی کتێبەکە لەچاپخانەدا کرابوو،ئەگەر ویستبایان بابەتگەلی کتێوەکە بگۆڕن زێدەلەوەی نیازی بەماوەیەک کاتی درێژتر دەبوو بەشێک لەلاپەرەکانی کتێبیان دەبوو جارێکی دیکە پیتچنی کردبایەوە.

جابۆیە بەمامۆستای گوت :من وەزعی ئێوەهەست پێدەکەم بەڵام بیرەوەری نوژدارێکی مەزنی وەک جەنابت بەشێوەی ئسایی بۆخەڵکی راکێشەر نیەمەگەر بەشکڵێکی دەربێنن کەبۆ خوێنەران سەرنج راکێش بێ دەنا کتێبەکە فرۆشی نابێ.

زائربرۆخ گوتی ئەتۆ لەبیری کریارانی کتێب دای کەلەخەڵکی ئاسایین،بەڵام بیرناکەیەوە کەلەپاش ئەوەی ئەم کتێبەبڵاوبێتەوە تەنیا لەئاڵمانی خۆرهەڵات ورۆژاوا داشێست وچوار هەزار پزیشک ونوژدار ولەوڵاتانی تری ئوروپا دا نزیکەی سێسەت هەزار پزیشک ونەشتەرگەر ئەم کتێبە دەخوێننەوە هەتا لەدیمانەو بیرورا و ئەزموونەکانی من کەڵک وەرگرن،سا تۆ بیرت لەوەی نەکردۆتەوە کەبەم بابەتە سووکەڵەو ناواقیعیانە،کەتەنیا بۆگۆڤارەکانی وەرەزی شکێن بەسوودن، ئەز لەلای پزیشک ونوژدارانی ئاڵمان و وڵاتانی

تری ئوروپا بۆژۆ و ریسوا دەکەن، تۆ دەبێژی ئەگەرلەم کتێبەدا مەبەست وبابەتگەلی ساکارو بێهودە ،کەهیچ پێوەندیان بەبیرەوەریەکانی زانستی منەوەنەبن خەڵک نایکڕن،کەچی سەرنجت نەداوەتێ ئەگەر ئەم کتێبە تەنیا بیرەوەری وبۆچوونەکانی زانستی و نەشتەرگەری منی تێدابێ سەتان هەزار بەرگی لێدەفرۆشرێ ولەوڵاتەکانی ئوروپایی داوەرگێردراوی ئینگلیسی وفەرانسەیی وئیتالیایی وئیسپانیایی وبگرە رووسی لێدەفرۆشرێ چوونکە گشت پزیشک و نوژدارەکانی جیهان بەدڵ هۆگری موتاڵای بیرەوەریەکانی زانستی منن.

سەرەنجام بەرێوەبەری کۆمپانیای چاپەمەنی سەلماندی، بڕیار دراکەکتێبەکە پێداچوونەوەی لەسەر بکرێ و بەشەزیادی و دەنێوئاخنراوەکانی ،تا ئەو شوێنەی دەرەخسێ،بیقرتێنن ولای بەرن.

زائربرۆخ وهاوسەرەکەی لە مونیخ ڕا گەڕانەوە،مامۆستا چۆوە نەخۆشخانە ومارگۆ خاتوونی هاوسەریشی بە هاوکاری و پشتگیری دوکتۆر مادلینێر لەیەکێ لە"کلینیک"ەکان کارێکی پەیدا کردورۆژانە دەچووە سەرکار،ئان بیس، ژنەخزمەتکارەکەش لەماڵێ دەمایەوە وکاروباری ماڵێی رادەپەراند.

دوای ئەورۆژەی زائربرۆخ لەمونیخ گەراوە ولەنەخۆشخانەی شاریتی نیشتەجێ بۆوە بەچەشنێک بەرەوچاک بوونەوە بوو کەدوکتۆر مادلینێر پاش گوت وبێژێکی تەلەفونی لەگەڵ مارگۆ دا تەمای گرت کەبیگێریتەوە ماڵی خۆی بەومەرجەی مارگۆ وریابێ کەمامۆستا دەست بۆ نەشتەرگەری نەباتەوە.

بەڵام هاوسەری زائیربرۆخ دەچووەدەرمانگا ورۆژانە لەوێ کاری دەکرد، لەماڵی نەبوو هەتا بەر لەعەمەلی نوژداری مێردەکەی بگرێ. دوکتۆر مادلینێر بەمارگۆی گوت کەنەچێتە کلینیک ولەماڵێ ئاگای لەماموستابێ هەتا ئەو دەس دەعەمەلی نەشتەرگەری وەرنەدا،ئەویش کارێکی دەکا بۆ دەستەبەر بوونی بژیوی ئەوان.

چوونکە مادلینێر لەوەزعی ژیان وگوزەرانی زائیربرۆخ بەتەواوی ئاگادار بوو ودەیزانی لەوکاتی دا بەراستی دەسی بەتاڵە وماتڵ ماتڵە،برێکی دراو لەپزیشک و نوژدارانی ئاڵمانی خۆرهەڵات کۆکردەوە بۆ زائیربرۆخی و بە بێ ئاگاداری ماموستا دای بەهاوسەرەکەی،مارگۆش بەو برەپارەیەهەندێکی پێداویستی ماڵ وبۆمیردەکەشی دەستێک جل وبەرگی کری.

دوکتۆر مادلینێر بە"مارگۆ"ی گوت هەتا سێ مانگان ئاگات لە مێردەکەت بێ بادەست بۆعەمەلکردنێ نەبا و باری نەفسی و روحیشت لەبەرچاوبێ،ئەگەر دوای سێ مانگ شێتی وتێکچوونەکەی سەرهەڵنەداتەوە دەکرێ دڵنیا بین کەچارەسەر بووە وئێوە ددتوانن هاوسەرتان بەتەنیاش لەماڵێ بەجێ بێڵن وبچنەسەر کار.

سەرۆکی نەخۆشخانەی شاریتی دەیزانی ناکرێ هەمیشە بەسواڵ وسەدەقە بژیوی بنەماڵەی زائیربرۆخ دابین بکا،بەناچاری مارگۆ دەبێ بچێتەسەرکار چوونکە زائیربرۆخ بۆخۆی،بەهەرحاڵ، ناتوانێ کاربکا .بەڵام هەرکە خەڵک زانیان زائیربرۆخ گەڕاوەتەوە ماڵێ ولەنەخۆشخانە دەرچووە دیسان رویان دەماڵەکەی کرد،کەچی مارگۆ هەموو نەخۆشەکانی بە وڵامێکی رەپ وراستی نەرێنی دەگێرایەوە و

دەیگوت پرۆفیسۆر زائربرۆخ تووشی پەتا بووە ودەبێ لەماڵێ دابسێتەوە هەتا چاک دەبێتەوە،هەتا دوو ساڵی تر ناتوانێ هیچ نەخۆشێک ببینێ.

*دوامین نەخۆش کە هاتە لای زائربرۆخ*

بەڵام لەنێو نەخۆشەکان داژنێک هەبوو کەئەو کاتی ٤٧ساڵی لەتەمەن هەلبواردبوو،چەندجارچووە ماڵی مامۆستا وسارگۆ بەرپەرچی دایەوە کەچی دەستی هەڵنەدەگرت وپێی وابوو جگەلەزائربرۆخ کەسێکی دیکە ناتوانێ بەعەمەلی نەشتەرگەری چارەسەری بکا.

ژنەتیوی تاین ئەوەندەی لەدەوروبەری ماڵی زائربرۆخ سۆسەکردهەتا رۆژێ کە"ئان ییس"بۆکرینی حەواجی ماڵێ وەدەرکەوت ومارگۆش سەرپێی بۆشوێنێ رۆیشت،ژنەکە زانی زائربرۆخ بەتەنیا لەماڵێیە،لێی وەژوورکەوت هۆدەکانی بەسەرکردەوە،زائربرۆخی دیتەوە وگوتی خانمی ئێوەو خزمەتکارەکەتان نایەڵن خۆم بگەیەنمەلای تۆ ونەخۆشی خۆمت پێ بڵێم وداوات لێبکەم عەمەلم بکەی وچارەسەرم بۆبدۆزیەوە.

زائربرۆخ لێی پرسی: ناوی تۆ چیە ؟

ژنەکە گوتی: ئیرێم کاد فری بێرک.

مامۆستا پرسی: نەخۆشیت چێە ؟

ژنەکە گوتی:ئەمن تووشی لوویەکی شێرپەنجەیی لەپشت کرکڕاکەی گەروو بوومە وشکم نیەجگەلەجەنابت هیچ کەسی دیکە ناتوانێ ئەم لووە بەچەشنێکی وا لەپشت قورقوڕۆچکەم دەربێرێ کەمن چارەسەر بکرێم.

زائربرۆخ پرسی: ئاخۆ بڕوات وایە ئەم لووەی لەگەردنی تۆ دا ولەودیوی گەرووت بەدی هاتووە،لوویەکی شێر پەنجەییە ؟.
ژنەکە وڵامی داوە: بەڵێ .
زائربرۆخ لێی پرسی: داخوا تووشی"مێتازتاز" بوویە ؟
ئیرێم کادفری بێرک گوتی: من تا ئێستا تووشی مێتازتاز نەبوومە.
مێتازتاز: ڕاگواستنی ناوەندی نەخۆشی لەخاڵێکی لەش ڕا بۆ خاڵێکی تره بەبێ ئەوەی ناوەندی یەکەم لەنێو بچێ،ڕایەڵەی شێرپەنجەیی، کەبەشێوەی ئاسایی پێی دەگوترێ "تومور"،لەجێگایەکی لەشرا رادەگوێزرێ بۆ خاڵێکی تری لەش بەبێ ئەوەی لووی یەکەم و دووهەم ویان لووی پتری کەلەلەش دا هەن لەبەین بچن.
زائربرۆخ پرسیاری کرد: ئاخو لەو لووەی لەگەردنت دایە وێنەت هەڵگرتووە ؟
ژنەکە گوتی:بەڵێ ،ئەو وێنانە (ئیشاعە)ی کەلێیان هەڵگرتووە ،دەیان هێنمەلات.
مامۆستا پرسی: کەنگێ لەلووی ملت ئەکس هەڵگیراوە ؟
ژنەکە وڵامی دایەوە: مانگێک لەمەو بەر.
مامۆستا گوتی: وێنەی مانگێک لەمەوبەر بۆمن بەکەڵک نایە، هەر ئەمرۆ بان سبەینێ دیسان لێی هەڵگرەوە.
ژنەکە پرسیاری کرد: چەند ئەکسی لێهەڵگرمەوە ؟
زائربرۆخ وڵامی دایەوە: چوار ئەکس؛یەکێ لەپێشەوەی ملت،یەکی تر لەپاشڕا، ئی سێهەم لەلای ڕاست و چوارەمیش لەلای چەپ،جا من لەدوای وەی ئەکسەکانم دیتن پێت دەڵێم چ ڕۆژێکی لووەکەلەگەردنت دەردێنم.

ئیرێم کادفری بێرک گوتی: ئایا لەدوای ئەوەی کە تۆ لووی شێرپەنجەییت لە گەرووی دەرێنام تووشی مێتازتاز نابم ؟
زائربرۆخ لەولام دا گوتی: ئەگەر بەرێکوپێکی گوێ رایەڵی فەرمانەکانی من بی وئەودەرمانانەی دەتدەمێ دە کاریان کەی ئومێدێکی زۆر هەیە تووشی میتازتاز نەبی.
ئەوەی زائربرۆخ بەژنەنەخۆشەکەی گوت،لەزاراوەی پزیشکی دا پێی دەڵێن"کیمیۆتراپی" یانی چارەسەری بە هۆی مایەکانی کیمیایی وپزیشک بەسەبەبی دەرمانەکیمیاییەکان بەرلەوەی دەگرێ کەخانەشێرپەنجەییەکانی کەلەخوێن یان"بەڵغەم"دا هەنەولەسەر تاپای لەش دا دەجووڵێن لەشوێنێک راوەستن ورایەل وتەنراوی شێرپەنجە پێک بێنن.
شیکاریەکانی پزیشکی نیشانیان داوە کەبەرگرتن لە مێتازتازبەهۆی دەرمانەکیمیاییەکان کاریگەرە ونایەڵێ کە رایەڵەی شێرپەنجەیی لەبەشەکانی تری لەشدا بەدی بێ،بەلام دەکارکردنی دەرمانەکیمیاییەکان بەشێوەی هەمیشەیی پێکهاتەکانی بەرگری لەش،کەهۆکاری کارای بەرگرتن لەمیکرۆب وڤیروسانن،کەم هێز دەکا،ئەگەر چی لەسۆنگەی دەرمانەکان تەنراوەی تری شێرپەنجەیی بەدی نایەبەلام شیمانەی ئەمەهەیەکەلەش بکەوێتە بەرمەترسی هێرشی میکرۆب و ڤیروسەکانی جوراوجور.
بەهەمەحاڵ،چەندرۆژ پاش،ژنەنەخۆشەکە دیسان لەدەرفەتێکی لەباردا،کەهاوسەروخزمەتکاری زائربرۆخ لە ماڵەوە نەبوون،خۆی گەیاندە مامۆستا وئەو وێنانەی هەڵیگرت بوونەوە بەمامۆستای نیشان دان.
زائربرۆخ لەپاش نۆڕینی بەوردی وێنەکان بەژنە نەخۆشەکەی گوت: لووی گەرووت دەردێنم .

ژنەکە لەوڵام دا گوتی:من لەولایەنەوە ئاسایش وسانەوەی تۆم تێکدا ویستم بمخەیتە بەر عەمەلی نەشتەر گەری چوونکە دەزانم ئێوە کە لوویەکی شێرپەنجەیی عەمەل دەکەی هیچی دەلەش دا لێ نایەڵنەوە.

زائربرۆخ گوتی: دەردەکەوێ تۆ هەندێ ئاگاداریت سەبارەت بە کێشەکانی پزیشکی هەیە.

ژنە نەخۆشەکە وڵامی دایەوە: لەرابردوودا خوێندکاری زانکۆی پزیشکی بووە وبەهۆگەلی خێزانی ومایەکی خوێندنی بەجێ هێشتووە.

خەڵکی ئاسایی کەلەوەزعی رایەڵەیەکی شێرپەنجەیی ئاگادارنین،ئەوکاتەی دەبیسن نەشتەرگەرێکی زانا لوویەکی شێرپەنجەیی لەلەشی نەخۆشێک دەرێنا، وایان دێتەبەر زەین کەسێوێک لەقەرتاڵەیەکی سێوان یان هێلکەیەکی کوڵاو لەسەرچەند هێلکەی تر هەڵدەگیرێ وچیان لێ بەجێ نامێنێ، نوژداریش، بەرێکوپێکی لووی شێرپەنجەیی لەلەش دەردێنێ لەحاڵێکدا جیاوازی لەنێوان سێوێک ولوویەکی شێرپەنجەیی داهەیەورایەڵەی شێرپەنجەیی بەچەشنێک بەرایەڵە ساخەکان وەنووساوە کە رۆچۆتە نێو رایەڵ وپۆی ئەوان، نوژدار لەکاتێ دا کەتەنراوەیەکی شێرپەنجەیی لەلەش دەردێنی دەبێ وردبنوارێ کەلەرایەڵەی شێرپەنجەیی شتێک نەمێنیتەوە دەنالەدوای تەواوبوونی عەمەلێ دیسان هەرلەو جێگایە لووی شێرپەنجەیی سەرهەڵدەداتەوە.

هەرلەبەر ئەم پەڵ هاویشتن ورۆچوونی رایەڵەکانی شێرپەنجەیی دە تان وپۆی ماسولکەسەلامەتەکانی دەور وبەر دایە کەلەکۆن دا پزیشکان ناوی ئەونەخۆشیەیان ناوە"سەرەتان" ( قرژاڵ) چوونکە

تەنراوەکانی سەرەتانی وەک چنگورکی قرژاڵ دەچنە دە ماسولکە ساخەکان.

ئەوکاتەی هاوسەر وخزمەتکاری زائربرۆخ زانیان کەمامۆستا گفتی داوەتە ژنەی نەخۆش کەبیخاتەبەرعەمەل و لووی شێرپەنجەیی لەگەرووی دەرێنێ بەتوندی بەرهەڵستیان کرد،چوونکە دەیانزانی پێویستی ئەو عەمەلە ئەوەیە کەژنەنەخۆشەکە هەرلەو ماڵەی دا بخەوێنرێ هەتا چاک دەبێتەوە.

لەگەڵەوەی زائربرۆخ بەهۆی بەرەژەنگی"پروستات"ێ بەرەبەرەکەم هێزدەبوو وەزعی روحی و باری دەروونی باشتردەهاتەبەرچاو، هەردەتگوت نەخۆشی جەستەیی بۆتە بنۆس هەتا نەخۆشی روحی رولەنێوچوون بێ.

باش بوونی بارودۆخی روحی زائربرۆخ لەلایەک وتکاوپارانەوەی ژنەنەخۆشەکە لەلایەکی تربوونەهۆ سەرەنجام مارگۆ و ئان پیس رازی برون کەژنەکە لەماڵێ عەمەل بکرێ ،ئەورۆژەی کە بریاربوو عەمەلەکە جێبەجێ بکرێ مارگۆ ژنەکەی بێهۆش کرد وزائربرۆخ بەبێ پەرتی وتێکچوون،بەسەرکەوتوویی ژنەکەی خستەبەرعەمەل ولووی شێرپەنجەیی لەگەرووی و لەپشت قورقورۆچکەی دەرێنا وژنەکە چەند رۆژان لەماڵی زائربرۆخ دا خەوت ولەدوای چاکبوونەوە ماڵاوایی کرد.

ئەم ژنە،یانی ئیرێم کاد فری بێرک دوامین نەخۆشە کە بەدەستی زائربرۆخ کەوتە بەرعەمەلی نەشتەرگەری و چاک بۆوە، دەرێنانی لووی شێرپەنجەیی گەردنی ئەوژنە بەدەستی زائربرۆخ بووە هۆ ژنەکە چەندین ساڵی تریش تەمەنی درێژ بێ.

*مەرگی زائربرۆخ*

سێ مانگ لەو ماوەیە رابرد کە سەرۆکی نەخۆشخانەی شاریتی بۆ مارگۆی دیاری کردبوو بە بێ ئەوەی شێتی زائربرۆخ سەرهەڵداتەوە،هەرلەوماوەیەش دابوو کە نەشتەرگەری مەزن لووی شێرپەنجەیی "ئیرێم کاد فری بێرک"ی بەسەرکەوتوویی دەرێنا.

چوونکە باری روحی زائربرۆخ ئاسایی بوو وئەوخێزانە سێ کەسیەش پێویستی بەداهاتێک بوو بۆ بژیوی ژیان مارگۆ گەڕاوە دەرمانگاو خەریکی کاری خۆی بوو، بەڵام"ئان بیس"ی رائەسپاردبوو کەئەگەر مێردەکەی ویستی دەس بۆعەمەلێک بەرێ بێ ماتڵ بوون بەتەلەفون ئاگاداری بکاهەتا خۆ بگەیەنیتەوە ماڵێ و بەربەعەمەل بگرێ، لەئاکامی ئەو راسپێریە"ئان بیس" هەموو نەخۆشەکانی لەماڵی دوور دەخستەوە،چوونکە بۆخۆشی وریای بوو کەمامۆستا عەمەلێک لەماڵێ ئەنجام نەدا،ئیتر روداوێکی وا روی نەدا.

❊ ❊ ❊

نیوەرۆی رۆژی دووهەمی مانگی ژوئینی ساڵی ١٩٥١ لەحاڵێکدا کە"ئان بیس"ی خزمەتکار لەچێشتخانە دا خەریکی کاروباران بوو گوێی لەدەنگی ناڵەناڵی مامۆستا بوو.

ژنە خزمەتکارەکە خۆی گەیاندە ژووری زائربرۆخ تەماشای کرد لەنێوەراستی وەتاخەکە،هەردوودەستی بە مسوڵدانی گرتووە و هەردوو ئەژنۆی داداون ئارەقەی لێهەڵدەچۆڕێ ولەبەر برک وژان جینگڵان دەدا.

ئان بیس پرسی ئەوەچت بەسەر هاتووە ؟

زائربرۆخ بەهانکەهان گوتی:بەرنێوکم دێشێ و توانام نیە خۆم راگرم.

"ئان ییس" تەلەفونی بۆئەو دەرمانگایە كرد كەهاوسەری زائربرۆخ كاری تێدا دەكرد ومارگۆی لەوژان وئازارەی مێردەكەی ئاگادار كرد،مارگۆش هەرلەوێرا بەتەلەفون دوكتۆر مادلینێری ئاگادار كرد وئەویش بۆگەیاندنی زائربرۆخ بە نەخۆشخانە، ماشێنی فریاكەوتنی ناردە ماڵێ.

كەهاتنە ماڵی مامۆستا هەتا بیگەیەننە نەخۆشخانە دیتیان بێهۆش بووە.

دوكتۆر مادلینێر دەیزانی زائربرۆخ بەهۆی بەرەژەنگی "پروستات" تووشی میزگیران بووەو بەدژواری میزی بۆدەكرا،بەلام چاوەنوار نەبوو كەبێهۆش بێ و بكەوێ.

لەپاش ئەوەی مامۆستایان گەیاندە نەخۆشخانە تێگەیشتن كەتووشی میزگیران بووە،بە میلێك میزەكەیان بۆ بەتاڵ كرد ،نەختێ هاتەوە سەرەخۆ.

لەرۆژەكانی دوایی دا دوكتۆر مادلینێر و هاوكارەكانی لەنەخۆشخانەی شاریتی دا یەك راستی پزیشكیان هەڵنا،ئەویش ئەمەبووكە تێگەیشتن میزگیرانی مامۆستا تەنیا پێوەندی بەنەخۆشی" پروستات"ەوە نیەبەڵكو رەگەكانیش تێیدا كاریگەرن و چوونكە رەگەكان لەناوەندی سەرەكی، كەمێشكە، پێرەوی دەكەون مادلینێر و هاوكارانی تێگەیشتن كەمیزگیرانی زائربرۆخ بنۆسی مێشكیشی هەیەوراگیرانی بەشێك لەتەنراویەكەی مێشك بەرگرەلەوەی كەئەو پیاوە بتوانێ میزی پێ بكرێ،لەوێ رۆژێ را هەتامانگی ژووئیە (مانگی دوایی) كە زائربرۆخ لەنەخۆشخانەی شاریتی دابوو میزەكەیان بە"سۆندە" لێ بەتاڵ دەكرد،لەورۆژانەی كە مامۆستا لە نەخۆ بوو دووجار بەهۆی ئامێری"ئیلیكترۆئان سفالوگرام"كەكەم وزیاد بوونی تندراوەكانی مێشك لەسەر تیسماڵكێكی درێژی كاغەز

تۆمار دەکا،مێشکی مامۆستایان خستەبەر پشکنین هەتابزانن کێهە بەش لە تێک تەنراوەکانی مێشکی لەسەرمیزگیرانەکەی کاریگەرە بەڵام لەوخواروژوورانەی کەبەشکڵی هێڵی تێکشکاو لە سەرقاقەزەکە تۆمارکرابوون بۆیان نەکرا شوێنی بەرپرس بدۆزنەوە.

زائربرۆخ هەرلەژووری خۆی دابوو، رۆژی ٢٢ی مانگی ژوئێن حاڵی ئەوەندە باش بوو کەجلکی دەبەر کرد ولە هۆدەکە وەدەرکەوت ولەحەوشی نەخۆشخانەپیاسەی کرد وەهەنگی سواری ماشێنێ بوو،لەوانەی لەحەوشی نەخۆشخانەکە دابوون،ویستی بەکاری بخا، بێ خەبەر لەوەی کە"سویچ"ی ماشێنەکەی پێ نیە،ئەم بابەتە ئاشکرای دەکردکەزائربرۆخ لەوێ رۆژێ دا هەست وئاوەزێ تەکوزی نیە چوونکە لەپیاوێکی وەک وی، کەلەهەموو تەمەنی دا ،سواری ترومبێلی تایبەتی بووە، یان بۆخۆی هاژوتوویەتی،نەدەوەشاوە کەنەزانێ بەبێ کلیلی تایبەتی روشن کردنی ماشێن،ناکرێ رۆشن کرێ وبخرێتە رێگا.

لەدوای ئەو رۆژە ئیتر زائربرۆخ لەهۆدەکەی خۆی لەنەخۆشخانەدا نەهاتە دەر،هەرلەو مانگەدا سەرۆکی نەخۆشخانە دووجار بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەی چارەسەری زائربرۆخ کۆبوونەوەی راوێژی پێک هێنا،سی پزیشکی تریشی بانگ کردن ،کەلەپزیشکانی نەخۆشخانە نەبوون، تالەوکۆبوونەوانەدا بەشداری بکەن،لەهەردوو کۆبوونەوە دا گوتیان زائربرۆخ دەبێ پرۆستاتی عەمەل بکرێ.

بەڵام مادلینێر دەیگوت کەزائربرۆخ بۆئەو عەمەلە رازی نیە.

سەرەنجام زائربرۆخ لەکاتژمێر چواری بەرەبەیانی رۆژی دووهەمی مانگی ژوئیەی ساڵی ١٩٥١ی زاینی لە نەخۆشخانەی شاریتی،ئەوخەستەخانەی کەماوەیەکی تەمەنی خۆی تێدا رابواردبوو وکاری تێداکردبوو وهەزاران کەسی تێدا چارەسەر کردبوو،ماڵاوایی

لەژیان کرد،لەکاتی مردنی دا حەفتاوپێنج ساڵ ودوو مانگی لەتەمەن هەڵبوارد بوو.

دوکتۆر" مادلینێر "بۆپەی بردن بەهۆی میزگیرانی ئەوپیاوە ؛دەیەویست مێشکی بپشکنێ،بەڵام" مارگۆ "ی هاوسەری زائربرۆخ رازی نەبوو توێکەری لەسەر مێردەکەی بکرێ.

سێ رۆژ پاشتر،لەرۆژی پێنجەمی مانگی ژووئیە، تەرمی زائربرۆخیان هەربەو جلکەی کەلەتەواوی سەر دەمی کارکردنی دا دەبەری دابوو،یانی روپۆشی نەشتەرگەری،خستە نێو تابووت و لەگۆرستانی"ڤان زێن"ی هەڵکەوتوو لەبەرلینی خۆرهەڵات بەخاک سپارد.

لەوساتەی دا کە تابووتی تەرمی زائربرۆخیان دەگڵکۆ نا،خاتوو"ئیرێم کاد فری بێرک"،دوامین نەخۆشی کەبەدەستی زائربرۆخ لەچەنگاڵی مەرگ رزگاری ببوو،لەگەڵ چوارمنداڵەکانی لەگۆرستان بوو، مستە خۆڵێکی هاویشتەسەر تابووت ولەدوای وەی کە گۆرەکەیان پڕ کردەوە چۆکی دادا و گۆری مامۆستای راموسی.

حەوتویەک لەپاش بەخاک سپاردنی زائربرۆخ بە پێشنیازی دوکتۆر مادلینێر ،لەتالاری"رێنیسانس" ی بەرلینی خۆرهەڵات،کۆبوونەوەیەکی یادکردنەوە،بۆیادی مامۆستای مەزن ،پێک هات.

لەورێورەسمەدا پەیکەرێکی لەپشتێن هەورازی زائربرۆخیان لەپێشەوەی تالار ولەنێو گوڵ وگەڵادا دانابوو، رەزامەندی راگەیەندرا کە یەکێ لەسەرۆکەکانی زانستگاکانی ئاڵمانی خۆرهەڵات لەو گردبوونەوەیەدا لەسەر مامۆستای کۆچکردوو قسە بکا،ئەویش پاش وەی چووە پشت مێزی گوتاردان ،لەسەرەتا دا شاکارەکانی مامۆستای لەنەشتەرگەری دا خستەبەرباس، دۆستانی مامۆستا لەگوتنی ئەو راستیانە هەستیان بەدڵ خۆشی کرد.

بەڵام ئەوجار سەری قسانی بۆلای ورەوئاکاری زائربرۆخ باداوە و گوتی: ئەو پیاوێکی لاسار ومکوڕ بوو بەبێ ئەوەی ئەو کەڵلەشەقی و لاسارییەی بەڵگەیەکی ئاقڵمەندانەو شیاوی سەلماندن پاڵپشتی بێ ،بۆ نموونە، زۆرجاران دەوڵەتی ئاڵمانی خۆرهەلات پێشنیازی پێکرد هەتا مووچەی خانەنشینی بۆ ببرێتەوە، کەچی ئەو قسوولی نەکرد،لەحاڵێکدا هیچ بەڵگەیەکی ئاقڵمەندانەی پێ نەبوو بۆ بەرپەرچ دانەوەی وەرنەگرتنی مووچەی خانە نشینی.

ئەم بەشە لەگوتارەکەی کابرا،دۆستانی زائربرۆخی رەنجاند، چەندکەس بۆئەوەی نیشان بدەن قسەکانی ئەوپیاوەیان پێ ناخۆشە هەستان ولەتالار وەدەرکەوتن.

دۆستانی زائربرۆخ لەبەر ئەوەی نارەحەت بوون کەگوتاربێژ لەقسەکانی خۆی دا بەرپەرچ دانەوەی پێشنیازی دەوڵەتی ئاڵمانی خۆرهەلاتی لەلایەن زائربرۆخەوە بە کردەوەیەکی بێ ئاقلانە وناژیرانە لەقەڵەم دا.لەحالێکی دا کە زائربرۆخ لەهەوەڵەوە بۆیەی قبووڵ نەکرد کەدەیزانی خانەنشین دەبێ و لەپاش ئەوەی ئەو مووچەیەی وەرگرت ئیتر ناتوانێ لەنەخۆشخانە دەوڵەتیەکان درێژەبەکار بدا.

بۆخۆشی چوونکەلەهەموو تەمەنی داحەزی لە کۆکردنەوەی دراونەبوو وسەبارەت بەکێشەی ماڵی دوورەپەرێز ،هەڵنەستابوو بەدامەزراندنی نەخۆشخانەیەکی تایبەت،هەتا لەکۆتاییەکانی تەمەنی دا،یان ئەگەر بەهەر هۆیەک رێگایان گرت کەکارکردنی لەنەخۆشخانە دەوڵەتیەکان،لەنەخۆشخانەی خۆی دا کار بکا.

ئێمە دیمان کەئەو دوای ئەوەی نەخۆشخانەی دەوڵەتیان بە رودا داخست ناچار بوو لەنەخۆشخانەیەکی تایبەتی دا کاربکا و پاشانیش بەتەرزێکی واناتەرزی نزیک لەسەرشۆڕی رێگەیان لەگەڕانەوەی.بۆئەو خەستە خانەیەش گرت.

بەکورتی، زائربرۆخ لەپێشدا، بۆیە ملی بۆ خانەنشینی وموچەکەی رانەکێشا هەتا لەکارەنەشتەرگەریەکان لانەدرێ، کەچی لەپاشان دەیەویست مووچەی خانەنشینی وەرگرێ بەڵام نەیان دایە.
رۆژێک دوای ئەوگردبوونەوەی یادکردنە،رۆژنامەی"درێابێند"ی چاپی ئاڵمانی رۆژاوا سەرۆکی زانستگای، کە رۆژی پێشترئەوگوتارە ناشیرنەی دابوو،دایەبەر پەلاماری تانە و نووسی: ئەو، وەک هەموو کەسی سووکەڵەی تەسک بینی کەم هیمەت پێی وایە بەشکاندنی گەوران خۆی دەباتەسەر، خافڵ لەوەی کە مێژووی زانست، ناوی زائربرۆخ بەخەتی زێرین، وەک نوژدارێکی داهێنەری بلیمەت،لەلاپەرەکانی خۆی دا تۆمار دەکا ورەنگە هەتا دنیادنیایە وێنەی زائربرۆخی لەنەشتەرگەری دا بەدی نایە.
رۆژنامەی"تێلگراف"ی چاپی ئاڵمانی رۆژاواش نووسی: ئەم سەرۆک دانشگایەی کەلە کۆبوونەوەی یادی زائر برۆخ دا نوتقی کرد، زانایەکی بۆشی مەرایی کەری بێ مایەیە کەپلەی سەرۆکایەتی زانکۆی بەتەون وبەستی سیاسی دەستەبەرکردووە وهەربەو شێوەیەش ئەشێ پلەوپایەی خۆ بپارێزێ وبۆئەوەی ماستاوچیەتی وریایی بۆدەوڵەت وحیزبی ئاڵمانی رۆژهەڵات کردبێ وای نواند کە ئەوان دەیانەویست مووچەی خانەنشینی بۆ زائربرۆخ ببڕنەوەو ئەو نەیویست،لەحاڵێکدا کەئێمە ئاگامان لێیە ئەو کاتەی زائربرۆخ لەنەخۆشخانەکەوتبوو هاوسەرەکەی خۆی دەکن هەربەرپرسی وپلەدارێکی کە دەستی وێڕا دەگەیشت،هاویشت هەتامووچەی خانەنشینی بدەنە مێردەکەی و نەیاندایە و زائربرۆخ بەوهەموو خزمەتانەی بەزانست ومرۆڤایەتی کردبوو بەوپەڕی دەسبەتاڵی وهەژاری سەری نایەوە، ئەمە یەکێ لەشانازیەکانی ئەوپیاوەبلیمەتەیەکەلەماوەی تەمەنی بەپیتی دا،بە هونەر وزانستی

خۆی هەزاران نەخۆشی لەمەرگ رزگار کرد بێ ئەوەی کارێک بکا بۆ وەسەریەک نانی دارایی ومالّ بۆ سەردەمی پیری ولەکارکەوتوویی خۆی.

* * *

هەتا ئەودەمەی کە زائربرۆخ زیندوو بوو، ئێرەیی، کەلەپیشەی نەشتەرگەریش دا وەک پیشەکانی تر بێدادێ دەکا،لێنەگەرِا نوژدار یان پزیشکێکی ئالّمانی سەربردەی زائربرۆخ بۆنیشان دانی کارەزانستیەکانی بنووسێ.

ئەوکتێبەی کە زائربرۆخیش بە"بێرن درۆف"ی ئیملا کردبوو،بەداخەوەبەهۆی مەرگی مامۆستا پێداچوونەوەی بەباشی بۆ نەکراو هەندێ بەشی ئەوکتێبەش لەدەرەوەی بابەت وتێکەلاّوەگەلّ مەبەستی ناراست و، رەنگە، ئەفسانەیە.لەبەر هەندێیە کەباسی کارەزانستیەکانی زائربرۆخ هێشتا بەئاگاداری هەرەمەی خەلّکی نەگەیوە و لەداهاتوودا دەبێ نوژدا یان پزیشکێک قۆلّی لێ هەلّمالّێ و زائربرۆخی بەو چەشنەی کەشایستەی پلەوپایەی زانستی و هونەریەتی بەخەلّکی جیهان بناسێنێ.

کۆتایی

# پێرست



ئەم کتێبەی وا بە دەستیەوە دەگری لەبۆ
خوێندنەوە، نووسراوی پیاوێکی ئاڵمانی یە بە
ناوی ژارگۆن تۆرڤاڵد. کە ساڵی ١٩١٦ ی زاینی
لە ئەیالەتی (راین) کە ئەمرۆ یەکێ لە
ئەیالەت (هەرێم)ەکانی ئاڵمانی خۆرئاوایە لە دایک
بووە .

لە پاش خویندنەکانی سەرەتایی کەوتە دوای
زنجیرە خویندنی پزیشکی و لە ئاڵمان و فرانسە
و ئینگلیز دا درێژەی بە خوێندنی خۆ دا کەچی
ئیش و کاری پزیشکی هەڵنەبژارد .

ژارگۆن تۆرڤاڵد لە ساڵی ١٩٣٩ کە ئاڵمان
هێرشی کردە سەر لەهستان (پۆلۆنیا) وشەری
دووهەم قەوما چووە نێو هێزی دەریایی ئاڵمان
و ئەوەی بە چاوی خۆی دەیدی، لە شەرەکانی
ژێر دەریا دا، بۆ رۆژنامەکانی ئاڵمانی دەنووسێ.



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی
رۆژهەلات

